## جەمال نەبەز

# ناسنامە و کێشەی ناسیۆنالی کورد

### لە چەند سەمینارو کۆڕێکی زانستیدا



چاپی یەکەم : بڵاوکراوەی بنکەی کوردنامە - (لەندەن) 2002
چاپی دووەم : بڵاوکراوەی کتێبفرۆشی سۆران - (هەولێر) 2007

کۆبەرهەم
ژمارە (٤)
زنجیرەی سەمینارەکان و کۆڕەزانستییەکان
ژمارە (٢)

جەمال نەبەز

# ناسنامەوکێشەی ناسیۆنالی کورد

## لە چەند سەمینارو کۆڕێکی زانستیدا

چاپی یەکەم: بڵاوکراوەی بنکەی کوردنامە - لەندەن ٢٠٠٢
چاپی دووەم: بڵاوکراوەی کتێبفرۆشی سۆران - هەولێر ٢٠٠٧

بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران - هەولێر
زنجیرەی ژمارە ( ٧٧ )

ناوی کتێب: ناسنامە و کێشەی ناسیۆنالی کورد
نووسەر: جەمال نەبەز
شوێنی چاپ: هەولێر: چاپخانەی منارە
ساڵی چاپ: چاپی یەکەم (بڵاوکراوەی بنکەی کوردنامە - لەندەن ٢٠٠٢)
چاپی دووەم (بڵاوکراوەی کتێبفرۆشی سۆران - هەولێر ٢٠٠٧)
ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٣ )ی ساڵی ٢٠٠٧ پێی دراوە.

کتێبفرۆشی سۆران
هەولێر: بازاڕی کتێبفرۆشان - نزیک دادگا
ت: ٢٢٢١٤٢٠ - ٤٤٩٩٦٦٠
soranbook@yahoo.com

# ناوەرۆک

# چەند وشەیەک بۆ ئەم چاپە نوێیە

لەوەتەی چاپی یەکەمی "پێوەندارێتیی کوردی" و "دۆزی ناسیۆنالی کورد" بڵاوکراونەتەوە خەڵکانێکی یەکجار زۆر داوای لەچاپدانەوەیان دەکەن، هەروەها داوای دەقی چاپکراوی سەمینارەکانی دیکە دەکەن کە هێندێکیان ڤیدیۆی ئەو سەمینارانەیان دیوە و دەیانەوێ بە نووسینیش بەدەستیانەوە بێ. لەبەر ئەوە بڕیار درا کە ئەم پێنج سەمینارە کە هەریەکەیان بەبۆنەیەکی تایبەتی و لە کاتێکی تایبەتی و لە شوێنێکی دیکەدا پێشکێش کراون، پێکەوە لە بەرگێکدا چاپ بکرێن.

ئەوەی لێرەدا گوتنی بە پێویست دەزانم ئەوەیە سوپاسێکی پڕ بەدڵی هاوبیری هێژا و خۆشەویست سیروانی کاوسی بکەم کە (بێجگە لە سەمیناری پێوەندارێتیی کوردی وسەمیناری دۆزی ناسیۆنال) هەموو سەمینارەکانی دیکەی خستە سەر کۆمپیوتەر و ئامادەی کردن بۆ چاپ بێجگە لەوەش بیری کۆکردنەوەی بەرهەمەچاپکراو وچاپنەکراوەکانم لە سەرەتاوە هەر پێشنیازی ئەو بوو کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەرکی گرانی ئامادەکردنیانی بۆ چاپ خستە سەرخۆی، هەروەها سوپاسی هاوبیرانی هێژا و خۆشەویست جەوادی مەلا و دکتۆر ئاشتی دەکەم کە مشووری خستنە سەر کۆمپیوتەری "پێوەندارێتیی کوردی و دۆزی ناسیۆنالی کورد"یان خوارد. بنکەی کوردنامەش کە دەستکردی هاوبیر جەوادی مەلایە ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی خستە سەرخۆی.

هیوام وایە بەم کارە خزمەتێکی ڕۆشنبیریی کوردیمان کردبێ.

بەرلین ١٦/٣/٢٠٠٢ جەمال نەبەز

جەمال نەبەز

# پێوەندارێتیی کوردی
## کورد کێیە و کورد بوون مانای چی؟
## لێکۆڵینەوەیەکی زانستانە لە ناسنامەی گەلێکی لەتلەتکراوی نیشتمان دابەشکراوی بێ دەولەت

وتارێکی سەمینارییە، لە رۆژی ٢٧-١٢-١٩٨٥ دا لە کۆبوونەوەیەکی چەند سەت کەسی کوردە ئاوارەکانی دانیمارکدا پێشکێش کرا. ژمارەیەک کوردی دانیشتووی سوێد و ئەلمانیا و بەریتانیاش بەشدارییان تێدا کرد.

چاپی یەکەمی: ستۆکهۆلم ١٩٨٦ - چاپی دوەم: لەندەن ٢٠٠٢

## (١) سڵاوو کردنەوەی سەمینار

بەشدارانی بەڕێزی سەمینار! خۆشییەکی زۆر گەورەیە بۆ من کە ئەمڕۆ لێرە بە خزمەت ئێوە دەگەم. لە کاتی دڵەوە سوپاستان دەکەم کەوا بەم ژمارە زۆرەوە هاتوون بۆ بەشدار بوون لە وتارەکەمدا، کە رەنگە بەشێکی هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ گرنگیی باسەکە خۆی بەلای ئێوەی کوردەوە. هەر لێرەدا سوپاسێکی گەرمی لکی دانیمارکی (سۆکسە) دەکەم کە منی بۆ گێڕانی ئەم سەمینارە بانگ کرد، و رێی داپێم تاکو وتارێک لە بارەی مەسەلەی کوردەوە پێشکێش بکەم، بێ ئەوەی لەوە پێش باسێکی تایبەتی دەستنیشان بکات بۆم، منیش دەرفەتم لە سەربەستیی خۆم هانی و "پێوەندارێتیی کوردی"م هەڵبژارد، کە هیوام وایە سوودێک بە گوێگران بگەیەنێ.

## (٢)- چوونە نێو باس
## کورد کێیەو کورد بوون مانای چییە؟

ئەم پرسیارەی سەرەوە هەر لە دەرەوە، واتە لە "ناکورد" وە نایەت، بەڵکو زۆرجار گەلێک لە کوردەکان خۆشیان دەیکەن، بەڵام بەداخەوە وەرامێکی ژیربێژانەی وا کەوا دڵ ئاو بخواتەوە پێی؛ نادرێ بە دەستەوە. بەڕاستی ئەم پرسیارە زۆر گرنگە، چونکە پێوەندیی بە ناسنامەی کۆمەڵە خەڵکێکەوە هەیە کە خۆیان نەک هەر بە "گەلێک"، بەڵکو بە "نەتەوەیەک"یش دادەنێن، ئەوجا بێگانەش هەن کە هەر بەو جۆرە تێیان دەڕوانن و تێیان دەگەن. جا ئەم "گەل"ە، یان ئەم "نەتەوە"یە؛ نەک هەر لە دەزگەی دەوڵەتیی خۆی بێ بەشەو بەس؛ بەڵکو بە سەر پێنج دەوڵەتی بێگانەی ناسیۆنالی سیستێم جیاوازیشدا دابەشکراوە. بێجگە لەوەش ئەم "گەل"ە یان ئەم "نەتەوە"یە، هەر لە سنووری ئەو نیشتمانە پارچە پارچە کراوەدا ناژی کە بە کوردستان ناسراوە، بەڵکو بڕێکی وەک "کەمایەتی" یەک لە دەرەوەی ئەو وڵاتەدا دەژی، سا یان بە پەرشو بڵاوی لەم لا و لەولا، یان بە گەلە کۆمەڵی لە هەوارێکی داخراودا، ئەمانە هەموو مەسەلەی دیاریکردنی ناسنامەی کوردبوون ئاڵۆزتر و سەختتر دەکەن.

ئێمە کە هاتینە سەر باسی ناسنامەی کوردبوون؛ مەبەستمان لەو "وەک یەکی"یە، یان ئەو "چۆن یەکی"یە پڕ بە پڕەیە کە لە نێوان پێناسەی تاکە تاکەی کورددا هەیە، و دەیانکاتە کۆمەڵگەلێکی وەک یەکی هاو ئاهەنگ. جا بۆ ئەوەی ئێمە نەخشەی پێوەندارێتییەکی کوردی بکێشین بە جۆرێکی وا گشت ئەوانە بگرێتەوە کە زاراوەی "کورد" دەیانگرێتەوە؛ پێویستە لە سەرمان جارێ پێناسە، یان پێناسەکانی ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە بە "کورد" نێو دەبرێن دەستنیشان بکەین... شایانی باسە کە کاتێک مرۆڤ خەریکی ناسنامەی کۆمەڵە خەڵکێک بوو، وەک کورد، ناچار تووشی چەند زاراوەیەکی ئێتنۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی و پۆلیتۆلۆژی و یاسایی وەک ئێثنۆس Ethnos و "گەل" و "نەتەوە" و "کەمایەتی" و "گەلی دەوڵەتدار" و "گەلی لاتەنیشت" دەبێ؛ کە ئەم زاراوانەش وەنەبێ هەر یەکە تاریفێکی رێکو پێکی براوەی سنوور دیاری لە هەموو لاوە دانپێدانراوی هەبێ، بەلاٌم ئەوەی لەم وتارە سەمیناریی‌یەدا لە هەموو شتێک گرنگتر خۆی دەردەخات، ئەو پێناسە خۆزا (طبيعي)یانەیە کە دەبنە هۆی ئەوەی "کوردێک" لە "ناکوردێک" جیا بکرێتەوە. لێرەدا دەبێ ئەوەش بێژم، کاتێک بە ناسنامەیەک دەگوترێ ناسنامە، ئەگەر هاتو ئەو ناسنامەیە لە لایەن خاوەن ناسنامە و خەڵکیشەوە دانی پێدا نراو پەسەند کرا. بۆ وێنە؛ ئەگەر یەکێک نێوی "تاڤگە" بوو، دەبێ بۆ ئەوەی ناسنامەیەکی بە نێوی "تاڤگە"وە بۆ دەربکرێ، جارێ ئەو کەسە خۆی خۆی بە "تاڤگە" بداتە ناسین، و ئەوجا خەڵکیش هەر بە نێوی "تاڤگە"وە بیناسنەوە. جا چۆنکە ئێمە ئێستە باسی "ناسنامەی کەسی" (تاکی) دەکەین، خراپ نییە ئەگەر لەسەر ئەم باسە کەمێک بڕۆین، و هێندێک لە گیروگرفتەکانی بخەینە بەر چاو، چۆنکە ئەوە بۆ مەسەلەی "ناسنامەی کۆمەڵی" بەکارمان دێ، بۆ ئەمەش دەمەوێ وا دابنێم، ئەو کەسەی کە نێوی "تاڤگە"یە، دێ و بە ئارەزووی خۆی نێوی خۆی لە "تاڤگە"وە دەگۆڕێ بە "رێگە"، و خەڵکیش ئەمجا بە "رێگە" نێوی دەبەن. ئەو دەمە، تایبەتکارە بابەتییەکانی ناسنامەی ئەو کەسە نایەنە گۆڕین، ئەگەرچی هێندێک لە پێناسە نابابەتی یەکانی گۆڕانیان بەسەردادێ.

چۆنکە بە گۆڕینی نێوەکە، سروشت و ماکی (ذات) ئەو کەسە، وەک کەس،

لەگەڵ سروشت و ماکی کەسی دیکەدا "وەک یەک"یان لێناکرێ، تەنانەت ئەگەر هێندێکیش هەبن، پاش گۆڕینی نێوەکەش هەر بە "تاڤگە" نێوی ببەن، و هێندێکیش بە "ڕێگە"؛ ئەوا مەبەست هەر هەمان کەس و هەر ئەو کەسەیە، جاری واش هەیە دەبینین هی واهەن لەماڵەوە و لەنێو خێزانی خۆیاندا نێوێکیان هەیە، کەچی لەدەرێشەوە و بە ڕەسمی نێوێکی دیکە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسە هەر ئەو کەسەیە و پێناسە بابەتییەکانی ئەو کەسە دەسکاری نەکراوە. وێنەیەکی دیکە: زۆر جار ڕوودەدات کاسبکارێک دەچێت چێشتخانەیەک دادەمەزرێنێ، و خۆی نێوێک دەدۆزێتەوە بۆی و بە ڕەسمی وای نێو دەنێ، کەچی خەڵکەکە نێوێکی دیکەی لێ دەنێن و هەر بەو نێوەشەوە دەیناسنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ، پێناسە بابەتییەکانی بابەتەکە (چێشتخانەکە) هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە و نابێتە شتێکی دی، هەتا خەڵکەکە چێشتخانەکە هەر بە (چێشتخانە) بناسنەوە و بە شتێکی دیکەی نەدەنە قەڵەم، بۆ وێنە: هۆتێل، یان فرۆشگە، یان گەرماو. ئەم نموونانە بەسەر ئەو کۆمەڵگە ئێتنییانەیشدا دەچەسپێن کە بە "ئێتنۆس" یان "گەل" یان "نەتەوە" دەدرێنە قەڵەم. بۆ وێنە ئەڵمانەکان بە خۆیان دەڵێن "Deutsch"، کەچی کورد و گەلێک خەڵکی دی پێیان دەڵێن "ئەڵمان". ئەمەش بە هیچ جۆرێک لە پێناسە بابەتییەکانی گەلی نێو براو (ئەڵمان) ناگۆڕێ، چونکە نێونان (واتە ناسینەوە)ی "دۆیچ" بە "ئەڵمان" لەلایەن هێندێک خەڵکەوە، هیچ تایبەتکار و سروشتێکی دیکە ناخاتە سەر "دۆیچ"... هەروەها زۆربەی زۆری کورد بۆ نێونانی خۆیان، لەپاڵ بەکارهێنانی وشەی "کورد"دا وشەی "کورمانج"یش بەکار دەبەن، بەڵام کە تۆ "کوردێک" بە "کورمانج" بانگ دەکەیت، ئەوا بەم کارەت هیچ جۆرە پێناسەیەکی بابەتانەی کورد دەستکاری ناکەیت، و هیچ بابەتکار و سروشتێکی تازە ناخەیتە سەری، چونکە "کورد" و "کورمانج" هەردووکیان پڕ بە پرییەکن و بۆ یەک "بابەت" بەکار دێن. بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر تۆ بە "کورد"ت نەگوت "کورمانج" بەڵکو گوتت "ترکی چیا" یان "عەرەبی چیا" یان "فارسی چیا" ؛ ئەوا دیارە ئەو دەمە پێناسە بابەتییەکانی کۆمەڵگەلێکت دەستکاری کردووە، کە لەلایەن خۆیان و خەڵکەوە هەر بە "کورد" یان

"کورمانج" دەدرێنە قەڵەم، سەبارەت بەوەی سروشت و تایبەتکاری دیکەت خستووەتە سەری، و ئەوسا ئەمەش لە مەسەلەکە دەگۆڕێ، جا کە تۆ دەبیژیت "ترکی چیا" و "فارسی چیا" و "عەرەبی چیا" ئەوا هەموو جارێک نێوی ترک و فارس و عەرەب بەکار دەبەیت، کە ئەمانە هەر یەکەیان نیشانەی کۆمەڵگەلێکن کە تایبەتکاری بابەتانەی خۆیان هەیە، جیا لە تایبەتکارە بابەتییەکانی کورد. ئەمەش خالاَنەی ئەوەیە کوردێکی گوندیی ئەرزرۆم کە بەدرێژاییی ژیانی هەر گوندەکەی خۆی و چەند کاربەدەستێکی ترکی دیتبیْ و لەپڕ بوو بیْ بە "کرێکاری میوان" لە ئەڵمانیا و لە کارگەیەکدا بۆ یەکەمین جار چاوی بە ئەڵەمان کەوتبیْ و پێیان نەڵیْ "دۆیچ" یان "ئەڵمان"، بەڵکو پێیان بڵیْ "ترکی ئەورووپا"، ئەو حەلە ئەمە دەبێتە دەستکاریکردنی تایبەتکارە بابەتییەکانی ئەوانەی لەلایەن خۆیان و خەڵکەوە بە "دۆیچ" و "ئەڵمان" ناسراون. هەرچەندە ناسنامەی کۆمەڵگەلێکی ئێتنی لەنێوان "تێڕوانینی خۆیی و تێڕوانینی بێگانەدا سەر هەڵ دەدات(١)، بەلاَم بە تاقی کردنەوە دەرکەوتووە کە لە نێوان ئەم دوو تەوەرەیەدا، کارکردنە سەر یەکدی بەردەوامە و هێندێک جاریش تێڕوانینی خۆیی زۆر کار دەکاتە سەر تێڕوانینی بێگانە و بەجارێک دەیگۆڕیْ. بۆ وێنە: ئەگەر یەکێک نێوی "ئازاد" بوو، بەلاَم چەند کەسێک حەزیان لە نێوەکەی نەکرد و بە نێوی "مراد"ەوە بانگیان کرد، ئەوسا ئەگەر ئەو کەسە بە هیچ جۆرێک بە "مراد" وەرامی نەداوە، و سۆر بوو لەسەر ئەوەی کە نێوی "ئازاد"ە؛ ئەوا رۆژێک دیْ ئەو چەند کەسە ناچار دەبن بە "ئازاد" بانگی بکەن. سۆر بوونی کوردیش، لەپاڵ بوونی دەسەلاَتێکی لەباردا، لەسەر ئەوەی "ترکی چیا" یان "فارسی چیا" یان "عەرەبی چیا" نین، بەڵکو کۆمەڵگەلێکی سەربەخۆن، وا لەو بێگانانە دەکات کە بەو جۆرە نێوی دەبەن؛ زوو یان درەنگ بەو جۆرەی کورد خۆیان دەیانەویْ دەستنیشانیان بکەن. کەواتە کە ئێمە باسی کورد دەکەین مەبەستمان کۆمەڵە خەڵکێکە کە هێندێک تایبەتکاری بابەتانەی خۆیان هەیە. ئەم تایبەتکارانە ئاوێتەی یەک بوون و هەمووش پێکەوە بوونەتە هۆی ئەوەی کۆمەڵگەلەکەیان کردووە بە کۆمەڵگەلێکی جیاواز لە کۆمەڵگەلانی دی. ئێستە با بزانین ئەو تایبەتکارانە چین؟

## (٣) - تایبەتکارەکانی کوردبوون:

### (أ) - زمان

ئەوانەی بە "کورد" دادەنرێن، بەگشتی بە زمانێک قسە دەکەن کە بە "زمانی کوردی" یان "زمانی کورمانجی" بەنێوبانگە. ئەم زمانە سەرەڕای ئەوەی بووەتە دوو شێوەی سەرەکی و دوو شێوەی لاتەنیشت و چەند زارێکەوە (٢)، کە هێندێک جیاوازیی مۆرفۆلۆژییانە و فۆنێتیکیانە و لێکسیکالانەیان تێ کەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لێکۆڵینەوە زمانەوانییانەی تا ئێستا لەبارەی زمانی کوردی یەوە کراون؛ گومانیان لەوەدا نەهێشتووەتەوە کە "کوردی" زمانێکی سەربەخۆیە. هەرچەندە زانا و زانستکار و رۆشنبیرانی کورد لە سەدەکانی رابوردوودا زۆر کەمتەرخەمییان بەرامبەر زمانی زگماکی خۆیان نواندووە، و بەرهەمەکانیان بەزۆری، بە عەرەبی و فارسی نووسیوەتەوە(٣)، بەڵام لە قوتابخانە و زانستگە ئاینییەکانی کوردستاندا، زمانی کوردی زمانی تێگەیاندن بووە، با سەرچاوە و کتێبەکانیش بە کوردی نەبووبن. هەروەها جەماوەری گەل، بەلایەنی کەمەوە، دوو هەزار ساڵەیەکە، زمانی کوردیی بۆ قسەکردن و لەیەک گەیشتن بەکار هێناوە و پاراستوویەتی.

لەپاش جەنگی جیهانیی یەکەمەوە تا ئەڤرۆ گەلێک هەوڵدراوە بۆ خزمەتکردنی زمانی کوردی و بەکارهێنانی بۆ کاروباری خوێندن و رۆژنامەگەری و رادوێ، هەر لەسەرەتای ئەم سەتەیەشەوە و تا ئێستە، هەوڵدان بۆ ناسینی زمانی کوردی بەرەسمی لەو دەوڵەتانەدا کە کوردستانیان لە خۆیان بەشکردووە، بووە بە سەرپەڕەی داخوازییەکانی جەماوەری کورد و هەموو حیزب و رێکخراو و بزووتنەوە سیاسییەکانی. ئەڤرۆ زمانی کوردی لەلایەن جەماوەری کوردەوە زۆر نرخی پێدەدرێ، و بە پێناسەیەکی یەکجار گرنگ بۆ "بوونی کورد" و "کوردبوون"؛ دەدرێتە قەڵەم. کوردی واش هەن پێیان وایە کە کورد هەر هێندە کوردە، تا زمانەکەی ماوە، کە زمانەکەی تەما، خۆشی نامێنێ. کەواتە یەکێک لەو تایبەتکارانەی کە کوردێک لە "ناکوردێک" جیا دەکرێتەوە پێی؛ زمانە. بەم پێیە دەبێ کورد ئەو کەسە بێ کە بە زمانی کوردی قسەدەکات. جا ئەگەر

ئەمە وابێ، و هەر کەسێک کە بە کوردی قسەی کرد، کورد بێ، دەبێ هەر کەسێک کە نەیتوانی بە کوردی قسە بکات، کورد نەبێ. وادیارە تەنانەت لە رابوردووشدا کوردی وا هەبوون، ئەگەر کوردێک زمانی کوردی نەزانیبێ، "مافی پێوەندارێتی"یان پێ ڕەوا نەبینیوە و لێیان سەندووەتەوە. بۆ وێنە: بیرکەرەوە و هۆنەری نەتەوەئەڤینی کورد بەهەشتی حاجی قادری کۆیی (١٨١٥-١٨٩٢) لە سەتەی رابوردوودا گوتوویەتی: ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانی؛ موحەققەق داکی حیزە و با بی زانی(٤). هەرچی تاقیکردنەوەی رۆژانەشە، ئەوا ئەم فەرمانە رەقو تەقە دەداتە دواوە. چۆنکە زۆری وا هەبوون و هەن کە خۆیان بە کورد زانیوە و دەزانن و رازی نابن بەوەی بە ئەندامی هیچ گەلێکی دی دابنرێن جگە لە کورد؛ کەچی زمانی کوردیش نازانن. ئەمانە بە زمانی دیکە قسە دەکەن کە ئەو زمانانە بە "زمانی خۆیان" نازانن، بەڵام زمانی کوردی کە نایزانن و ناتوانن قسەی پێ بکەن، بە "زمانی خۆیان"ی دەزانن. نیشتمان پەروەری گەورە، شەهید دوکتۆر فوئاد بەرخۆ؛ یەکێک بوو لەو کوردانەی کە لەسەر کوردایەتی لە ساڵی ١٩٢٥ دا لەلایەن رژێمی ترکە کەمالیستەکانەوە لە سێدارە درا، بەڵام نەیدەتوانی بە کوردی قسە بکات، کەچی نەزانینی زمانی کوردی، رێی ئەوەی نەگرت لێی لەپێناو کورددا گیانی خۆی ببەخشێ. هەر ئەو "کوردی نەزانە" لەبەر سێدارەدا هەڵبەستێکی بە زمانی ترکی رێکخست، لەوێ دا کوردستانی بە باخێکی بەهەشت دانا کە لە باووباپیرانەوە بۆی بەجێ ماوە و فەرمووی: کیمدر بزی منع ایلە یجک باغی جناندن، میراتی پدردر، گیررزخانە بزمدر(٥) واتە: "کێ بێ بتوانێ رێی ئەم باخی بەهەشتە لە ئێمە بگرێ، میراتی باوکمانە و بۆمان بەجێ ماوە، ماڵ ماڵی خۆمانە و دەچینە نێوی". عەلی سەیدۆی گۆرانی (١٩.٨-١٨/٨/١٩٨٢)، سکرتێری ئەنجومەنی یاسادانانی ئەردەنی؛ یەکێکە لەو کوردانەی کە لەنێو عەرەبی ئەردەندا لە دایک بووە و گەورە بووە، و بەهۆی ئەوەوە کە کوردە، هەر لەکاتی قوتابێتییەوە گەلێک خزمەتی مێژووی کوردی کردووە. لە کتێبەکەیدا "من عمان الى العمادية او جولة في كوردستان الجنوبية" ("لە عەممانەوە بۆ ئامێدی یان گەشتێک بە کوردستانی خواروودا") دەبێژێ. "کە لە سلەیمانی بووم

لەگەڵ بابا عەلی شێخ مەحموددا بە زمانی ئینگلیزی قسەم کرد، چۆنکە ئەو حەلە زمانی کوردیم نەدەزانی"(٦). ئەمە مانای وایە ئەم کوردە بەنێوبانگە نەتەوەئەڤینە لەسەرەتای ژیانیدا کوردی نەزانیوە. کاتێک کە خۆم لە بەغدا و بەسرە مامۆستای قوتابخانە نێوەندییەکان بووم، واتا لەو دوو شارەی کە دوو مەڵبەندی عەرەبنشینن، بەڵام لە یەکەمیاندا کەمایەتییەکی گەورە کورد هەیە و لە دووەمیشیاندا کورد زۆر هەن، گەلەک جار قوتابیی وام دیوە کە بە عەرەبییەکی بێ خەوشی رەوان قسەی کردووە، یەک وشە کوردی نەزانیوە، کەچی لە منی پرسیوە ".. تکایە ئەم وشە عەرەبییە بە "زمانی خۆمان" چی پێ دەڵێن؟" گوتوومە: "مەبەستت لە "زمانی خۆمان" چییە؟ گوتوویەتی: "کوردی". گوتوومە: باشە تۆ کوردی نازانیت، چۆن کوردی زمانی تۆیە؟ بە گەرمییەوە گوتوویەتی: "خۆم کوردم، لەبەر ئەوە کوردی زمانی منە، نەک عەرەبی، ئەز نەعەرەبم"(٧). ئەوەتە ئێستەش دەبینین لە شارەکانی ئەورووپای رۆژاوادا هەزاران خەڵکی ترکیا و ئێران و عێراق و سوریا و لوبنان و کوێ و کوێ هەن، کە لە ئستەموول و ئەنقەرە و ئیزمیر و تاران و بەغدا و دیمەشق و بێرووت لە دایکبوون، و هەر بە ترکی و عەرەبی و فارسی دەپەیڤن، کوردی نازانن، کەچی خۆیان بە کورد دەناسێنن، و هەوڵدەدەن "زمانی خۆیان" کە کوردییە فێربن و قسەی پێ بکەن. بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، ئەگەر هاتو یەکێک خۆی بە کورد زانی، ئەوا زمانی کوردی بزانێ و نەزانێ، زمانەکە هەر بە زمانی خۆی دەزانێ. هەروەها ئەگەر بێتو زانینی زمانی کوردی بکرێ بە پێناسەیەکی کوردبوون، ئەوا دەبێ ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەوانەی بەخۆیان دەڵێن کورد، و خەڵکیش بە کورد ناسیونی، لە پێوەندارێتیی کوردی بێ بەش بکرێن، هیچ نەبێ تا ئەو کاتەی زمانی کوردی فێر دەبن، بە کورد نەزانرێن، و کە زمان فێر بوون، ئەوجا پێیان بگوترێ "کورد". ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، هی واهەن کە لە نێوچەیەکی کوردەواریدا لەدایکبوون، و بە کوردییەکی بێ گرێ و گۆڵ دەپەیڤن، ئەمجا وەنەبێ هەر لە کۆڵان و بازێڕ بە کوردی قسە بکەن، بەڵکو تەنانەت کوردی زمانی ماڵەوەیشیانە، بەڵام کە لێیان دەپرسیت، تۆ کوردیت؟ دەبێژن: "نە. باپیرە گەورەم کاتی خۆی هاتووەتە

کوردستان، و لە کوردستان لە دایکبووم و گەورەبووم و "زمانی خۆم لەبیر چووەتەوە". بەکورتی: ئەگەرچی زمانی کوردی پێناسەیەکی زۆر گرنگە بۆ دیاریکردنی "کوردیوون"، بەڵام لە هەموو چەڵێکدا راست دەرناچێ. لەبەر ئەوە نابێتە مەرجی بێ چەند و چۆنی پێوەندارێتیی کوردی. شایانی باسە کە دانانی "زمان" بە پێناسەیەکی ناسنامەی کۆمەڵگەلێکی ئێتنی، بەشێوەیەکی گشتی، گیروگرفتی زۆرە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین لە هەموو لایەکەوە بە پێناسەیەکی یەکجار گرنگ و بگرە سەرەکی دادەنرێ. بۆ وێنە: باسی "گەلانی ترک" دەکرێ، و مەبەستیش لەو گەلانەیە کە بە شێوەکانی زمانی ترکی قسەدەکەن. ئەڵەمانەکان کەمێک جیاوازی دەخەنە نێوەوە: کاتێک "گەلی ئەڵەمان" لە "گەلانی ئەڵەمانیزمان" جیا دەکەنەوە. عەرەبەکان هەر کسێک کە عەرەبزمان بوو؛ بە عەرەبی دەدەنە قەڵەم. کە ئەم سەرنجەش لای عەرەب کۆنە و دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی پەیامبەر(د)؛ کاتێک محەممەد لە وەرامی ئەوانەدا کە چەند سەحابەیەکی ناعەرەبی محەممەدیان - وەک سەلمانی فارس و سوهەیبی رۆمی و بیلالی حەبەشی و...- بەسووک هاتووەتە بەرچاو، چۆنکە عەرەب نەبوون، لە مزگەوت گوتوویەتی: ".. خەڵکینە خودێ یەک خودێ یە، و باوکیش یەک باوکە، و عەرەبێتی هی هیچ کسێکتان نییە، لە باوک و دایکەوە. بەڵکو عەرەبێتی زمانە، ئەوی بە عەرەبی قسەی کرد ئەوە عەرەبە(٨). راستییەکەی، ئەوی شارەزای وڵاتی عەرەب بێ؛ ئەڤرۆ ژمارەیەکی یەکجار زۆر لوبنانی و جەزایری و مەراکیشی و تونسی و میسری و سۆدانی دەبینێ، کە بە زمانی عەرەبی قسەدەکەن، و کەچی خۆشیان بە عەرەب نازانن، بەڵکو خۆیان بە فینیقی و بەربەری و گۆشینی و قیبتی و.. هتد دەدەنە قەڵەم.

(ب) - بنەچە و رەچەڵەک

لەبارەی بنەچە و رەچەڵەکی کوردەوە گەلێک بیرورا و وادانان (فرضية) هەیە و وتو وێژ وَ دەمەتەقێ یەکجار زۆرە. ئەمەش وەنەبێ کاری ئەڤرۆ و دوێنێ بێ، بەڵکو لە مێژوودا کۆنە و باسکردنی بنەچە و رەچەڵەکی کورد لە هەزار ساڵێک

پترە. مێژوونووسە عەرەبە کۆنەکان وەک المسعودي (کە لە ساڵی ٩٥٧/٩٥٦ی ف دا مردووە) لە یەکێک لە کتێبەکانیدا کە نێوی (التنبیه والاشراف)ە؛ بنەچە و ڕەچەڵەکی کورد دەباتەوە سەر عەرەب(٩) و لە کتێبێکی دیکەشدا کە نێوی (مروج الذهب و معادن الجوهر)ە؛ بنەچە و ڕەچەڵەکی کورد دەباتەوە سەر دێو و درنج و جنۆکە و شەیتان (١٠). ئەبولقاسمی فیردەوسی (ابو القاسم فردوسی) خاوەنی (شاهنامە) کە لە ٩٤١/٩٤٠ تا ١٠٢٠؟ ژیاوە؛ بنەچە و ڕەچەڵەکی کوردی بردوەتەوە سەر ئەو گەنجانەی کە لە دەست سەربڕین و مێشک دەرهێنان لەلایەن زوحاک (ئەژدەهاک)ی زۆرداری نەخۆشەوە؛ بەهۆی خێرەوەمەندیی دوو چێشتکەری زوحاکەوە، ڕزگاریان بووە و ڕایان کردووە و داویانەتە کەژوکێو (١١). لەم سەردەمەی دواییشدا گەلێک تێبینی لەسەر بنەچە و ڕەچەڵەکی کورد خراونەتەڕوو، هێندێک لەمانە بۆ ئامانجی سیاسی بوون، وەک ئەوەی کە کورد دەبرێتەوە سەر ڕەگەزی عەرەب یان فارس یان ترک، و هێندێکیش لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی و مێژوویی یەوە پەیدابوون. بەنێوبانگترینی جۆری دووەمیان ئەو هیپۆتێزەیە کە بۆ یەکەمین جار لەلایەن ڤلادمیر مینۆرسکی (١٨٧٧/٢/٥-١٩٦٦/٣/٢٥)یەوە پێشاندراوە و کورد دەباتەوە سەر بناوانی ماد، واتە میدیاییەکان(١٢). کوردەکان خۆشیان بەگشتی ئەم هیپۆتێزە بە ڕاست دەزانن و ئەوەتا تەنانەت مارشی کوردستان کە بە (ئەی ڕەقیب) بەنێوبانگە؛ دەست بۆ ئەم بنەمایە ڕادەکێشێ، کاتێک دەبێژێ: "ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەوین . . دینمانە، ئاینمانە، نیشتمان". بەکورتی، بنەچە و ڕەچەڵەکی کورد هەرچییەک بێ، کورد خۆی پێی وایە کە ئەم کوردانەی ئەڤرۆش هەر نەوەی ئەوانەن کە لە ڕابوردوودا کورد بوون. لێرەدا حەز دەکەم بەسەرهاتێکی خۆش بگێڕمەوە بۆتان. بیست ساڵێک لەمەوبەر جارێکیان لە مەڵبەندێکی خوێندکاراندا لە مۆنیخ (ئەڵمانیا) وتارێکم لەبارەی ڕۆژهەڵاتەوە دەخوێندەوە بۆ خوێندکارە ئەڵمانەکان و باس هاتە سەر بنەچە و ڕەچەڵەکی کورد. هێندێک لەو ئەڵمانانەی لەوێ بوون چەند شتێکیان لەسەر کورد خوێندبووەوە، و حەزیان دەکرد زۆرتر دەمەتەقێ لەسەر بنەڕەتی کورد بکەن. یەکێکیان زۆر

لەسەر ئەوە سوور بوو کە کورد دەچنەوە سەر "خۆڕییەکان". یەک دوو کوردیش لەوێ بوون، کە ڕەئیان جۆرێکی دی بوو. دەمەتەقێ کەمێک درێژەی کێشا، و ئەوجا کابرایەکی ریش ماشوبرنجی سمێڵ بابڕ کە لە سووچێکەوە تا ئەو کاتە بێ دەنگ دانیشتبوو لەپڕ سنگی دەرپەڕاند و بە ئەڵمانییەکی تێکشکاو گوتی: تکایە ئەز ئەڵمانی باش نازانم، کەرەم کە بە کوردی بێژە بزانم ڤانا چ دەبێژن؟ گوتم کاکە تۆ کوێندەریت؟ گوتی: "دەرسیمی". مەسەلەکەم بەکورتی تێگەیاند. ئەوجا بڕۆی چرچ کرد و گوتی: تکایە بەم هەڤالانە بێژە لێم ببورن کەوا ئەز نەخوێندەوارم، لەپێشەوە وامزانی کە ئەمانە دەبێژن "کورد خۆڕین" و جنێودەدەن بە کورد، لەبەر ئەوە زۆر نارەحەت بووم، چونکە تا ئێستە ئەم "خۆڕی" و "مۆڕی"یەم نەبیستووە، بەلام ئێستە تێگەیشتم کە "خۆڕی" گەلێک بوون بۆ خۆیان، بەهەرحاڵ ئەمە ئەو هەراوهۆریایەی پێناوێ. کورد خۆڕی بووبن یان شتێکی دی بووبن، ئەوە بەکاری چی دێ؟ کورد کوردن و هیچی دی. باوەڕ بکە خۆم پێنج شەش پشتی خۆم دەناسم و دەزانم کەی و لە چ گوندێکەوە باپیرەگەورەمان چووە بۆ نێو شار، و پێنج شەش پشتم هەر کورد بوون. نە خۆڕی بوون و نە هیچ". پاشان گوتی: کورد ئەوەیە باوک و باپیر و باپیرەگەورەی کورد بووبن. ئەوجا پێش دوو سێ هەزار ساڵ چی بووە و چی نەبووە، ئەوە هەر خودێ دەزانێ، کەسیش تا ئەڤرۆ زیندوو نەبووەتەوە تا هەواڵی ئەو زەمانە بپرسین لێی". ئائەمە ڕەئیی کرێکارێکی سادەی کورد بوو کە بەخۆی دەگوت نەخوێندەوار، کە ئەوەش نموونەیەکە بۆ تێڕوانینی بنەچە و ڕەچەڵەکی خۆ لەلایەن زۆربەی زۆری کوردەوە. بەمە دەمەوێ بێژم کە کوردی ئەڤرۆ، خۆی بە نەوەی ئەوانە دەزانێ کە لە رابورووشدا هەر کورد بوون، یان کورد بوون بە نێوێکی دیکەوە. ئەوجا ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە: هێندێک جار بنەچە و ڕەچەڵەک دەکرێتە دەستاوێژێک بۆ پێناسەی کوردبوون. بۆ وێنە: ئەوی باوک و دایکی کورد بێ، یان هیچ نەبێ؛ دایکی یان باوکی کورد بێ؛ بە کورد دەدرێتە قەڵەم. هێندێک جاریش هەر لەبەر ئەوەی باپیرەگەورە یان داپیرەگەورەی کەسێک کورد بووە، ئێدی ئەو کەسە لەلایەن کوردەوە بە کورد دەدرێتە قەڵەم. جاری واش هەیە یەکێک هەر باپیرەگەورەی کورد بووە، بەلام

خۆی لە ولاتێکی دیکەدا لەدایک بووە، و دایکیشی کورد نی یە و زمانی کوردیش نازانیٚ، کەچی خۆی هەر بە کورد دەزانیٚ و شانازی پێوە دەکات، و رێکیش دەکەوێت کە خەڵکیش هەر بە کورد بیدەنە قەڵەم. ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر لە ولاتی عەرەبدا بن، بەزۆری، پاشنێوێکی "الکردی" دەخەنە سەر نێوەکەی خۆیان. بەهەشتی محەممەد کوردعەلی (محمد کردعلی)، کۆنە سەرۆکی ئەکادیمیای زانستیی عەرەب لە دیمەشق، و یەکێک لە زانا بەنێوبانگەکانی جیهانی عەرەب، نموونەیەکە بۆ ئەمە. هەر ئەم دیاردەشە وای کردووە کە کوردەکانی ئیسرائیل بە "ئەناکوردی" کە مانای "ئەز کوردم"ە؛ نێو ببرێن، چۆنکە ئەمانە هەر لەسەرەتای چوونیانەوە بۆ ئیسرائیل خۆیان بە "کورد" بە خەڵکی ناساندووە و کە لە یەکێکیان پرسیبیٚ تۆ چیت؟ دەست بەجێ گوتوویەتی: "ئەز کوردم" کە بە زمانی عیبری "ئەنا کوردی"یە. کەچی لەلایەکی دیکەشەوە هی وا هەیە باوکیش و دایکیشی کورد بوون یان کوردن، کەچی نەک هەر خۆی بە کورد نازانیٚ؛ بەڵکو پێشی ناخۆشە بێژن: "تۆ کوردیت" و خۆی بە "مەنسووب"ی گەلێکی دی دەداتە قەڵەم. هی واش هەیە بنەچە و رەچەڵەکی کورد بووە و دان بەمەشدادەنیٚ، کەچی دەڵیٚ "بەلاٚم خۆم کورد نیم. تازە بوومەتە عەرەب، یان ترک، یان فارس." ئەمانە لەنێو کورددا بە کوردی "تواوە" یان "ئاوەکی" دەدرێنە قەڵەم. لەلایەکی دیکەشەوە هی وا هەن، باوک و باپیرانیان کورد نەبوون، بەلاٚم لە کوردستاندا لەدایک بوون، و لە کۆمەڵگەیٚ کورددا تواونەتەوە. ئەمانە خۆیان بە کورد دەزانن، و ئەگەر پێیان بڵێیت "تۆ بە بنەچە و رەچەڵەک کورد نیت" دەڵێت:"راستە. بەلاٚم تازە بوومەتە کورد و خۆم بە کورد دەزانم". ئەم جۆرە کوردانە لای کورد زۆر بەرێزن. وادیارە ئەمە لەلای کورد بە نیشانەی وەفاداریی بۆ نان و ئاوی کوردستان دەدرێتە قەڵەم. پێم وایە هەر ئەم هەڵوێست و تێروانینەشە کە بووەتە هۆی ئەوەی گەلێکی بیٚ دەوڵەتی یەکنەگرتووی وەک کورد، بتوانێت ناکورد، بەبیٚ بەکارهێنانی زۆر و شەڕوهەڵلاٚ، لەنێو خۆی دا، بە ئاشتی و هێمنی بتوێنێتەوە. شایانی باسە کە کورد، بەشێوەیەکی گشتی زۆر بەتەنگ بنجو بناوانیماڵباتی خۆیانەوەن. گەلێک تیرە و هۆز و بنەماڵەی کورد هەن

کە قەواڵەی پشتاوپشتی خۆیان دەخوێننەوە، و هێندێکیشیان پەنا دەبەنە بەر داستان و چیرۆکی ئەفسانەیی بۆ پیرۆز کردنی ئەم بنجو بناوانە؛ وەک ئەفسانەی کەوتنەوەی ئێزیدییەکان لە تۆوی ئادەم خۆی، لەکاتێکدا حەووا هێشتا دروست نەبووە(١٣)، یان وەک چیرۆکی پێوەندیی بنەماڵەی فەیزوڵا بەگی لەگەڵ ساسانییەکان بەهۆی شووکردنی کچی سەرکردەیەکی کوردەوە بە ئەردەشێری پاپەکان، دامەزرێنەری ئیمپراتۆرێتیی ساسانی و تێکەڵبوونی خوێنی کورد بە ساسانی یەکان، و دوایی شووکردنی کچێک لە بنەماڵەی ساسانییەکان بە ئیمام حسەین، سێیەمین ئیمامی شیعەکان و ئەوجا کەوتنەوەی خێزانە کوردییە ئەریستۆکراتییەکان لەمە(١٤)، یان وەک داستانی کەوتنەوەی بنەماڵەی بابانییەکان لە فەقێ ئەحمەدی دارەشومانە و ئەو کچە ئەورووپاییەی کە فەقێ ئەحمەد بە شەرەشیر لەچنگ ئەو پیاوە ئەورووپاییانە دەریهێنابوو کە دەیانویست بەزۆر بیدەن بە شوو بە یەکێک لە خۆیان. ئەم چیرۆکە چیرۆکێکە کە کوردە بابانییەکان خۆیان بۆ زانستکار و دیپلۆماتی ئینگلیز کلۆدیۆس ریچ یان گێڕابووەوە؛ کاتێک ریچ ٢٨٥ ساڵ لەمەوبەر چووبوو بۆ سەردانی سلەیمانی پێتەختی ئەودەمەی میرنشینی بابان(١٥). هەمەوەندەکان و هۆزەکانی دیکەش هەر یەکە چیرۆکی ئەفسانەوی لەم بابەتەی هەیە. بێجگە لەوەش چیرۆک و داستانی وا هەن لافی ئەوە لێ دەدەن کە گوایە هەموو خەڵکی جیهان لە بنەڕەتەوە لە کورد کەوتوونەتەوە. وەستانی "کەشتی نووح" لەسەر چیای جوودی لە کوردستان و دەستپێکردنەوەی ژیان لەوێ وە، پاش تەفروتوونابوونی هەموو گیانەوەران، دەکرێتە هەوێنی ئەم بیرە. حاجی قادری کۆیی لە سەتەی رابوردوودا دەستی بۆ ئەوە راکێشاوە کە گوایە هەموو گەلانی جیهان لەبنەڕەتەوە دەچنەوە سەر کورد(١٦). ئەمانە هەموو بەشێکن لە میتۆلۆژیای کورد و لە ئینسیکلۆپیدیای میتۆلۆژیای کورددا کە بە زمانی ئەڵەمانی نووسیومە و بەداخەوە هێشتا چاپنەکراوە، بە دووروودرێژی لێیان دواوم.
بەکورتی؛ بنەچە و رەچەڵەک؛ چ راستەقینە بێ، واتە ئەو کەسە بەڕاستی لە بەرەبابێک یان بەرەداکێکی کوردبێ، یان خەیاڵی بێ، واتە ئەو کەسە خۆی وا بێتە بەرچاو کە لە بەرەبابێک یان بەرەداکێکی کوردە؛ ئەوە هەر وەک یەکە.

بەڵام دانانی "بنەچە و ڕەچەڵەکی ڕاستەقینە"ی کورد بە پێناسەی کوردبوون؛ زۆر گیروگرفت پەیدا دەکات. هەر بۆ وێنە: ئەگەر بێتو کوردبوون بە تەرازووی بنەچە و ڕەچەڵەکی "ڕاستەقینە" بپێورێ، ئەوا دەبێ سەرکردەیەکی وەک بەهەشتی شێخ مەحموود (١٨٨٢-٩/١٠/١٩٥٦) کە هەموو ژیانی لەپێناوی کوردایەتیدا بەختکرد، بە "کورد" نەزانرێ. چونکە شێخ مەحموود -بەحەق یان ناحەق-خۆی بە نەوەی پەیامبەری ئیسلام دەزانی، وخەڵکیش هەروایان لە قەڵەم دەدا، کە دیارە پەیامبەری ئیسلام محەممەد (د) عەرەب بووە. ئەوجا نەک هەر شێخ مەحموود، بەڵکو زۆربەی زۆری شێخ و سەییدەکانی کوردستان -ڕاست یان ناڕاست- خۆیان بە نەوەی پەیامبەر دەزانن. ڕانی سەرکردە کلاسیکییەکانی کورد؛ لەو سەییدانەن کە گوایە لە بنەڕەتدا "عەرەب" بوون، کەچی هێندێکیان لەرێی کورد و سەربەخۆیی کوردستاندا گیراون و دەربەدەر بوون و خوێنیان ڕژاوە. پیرەمێردی هۆنەر (١٨٦٧-١٩/٦/١٩٥٠) لە لاوانەوەکەی دا بۆ شێخ قادری شەمزینی بەبۆنەی لەدارادانی یەوە لەلایەن ڕژێمی ئەتاترکەوە لە ساڵی ١٩٢٥دا، ئەوەی هێناوەتەوە بیر کە شێخ قادریش شەهیدبوونی لە حەسەن و حسەینی باپیرانی یەوە کە لە کەربەلا شەهید کراون، بە میرات بۆ ماوەتەوە. پیرەمێرد دەبێژێ: شێخ قادرە ڕەئیسی هەموو خانەدانی کورد .. میراتی جەددی کەربوبەلا بوو بە ئیرسی برد(١٧). جا لەبەر ئەوەی نەختێک لەمەوبەر باسی بنەچە و ڕەچەڵەکی شێخ مەحموودمان کرد، حەز دەکەم ئێستە چیرۆکی وتووێژێک بگێرمەوە کە لەبارەی بنەچە و ڕەچەڵەکەوە لەنێوان شێخ مەحموود و فەیسەڵی مەلیکی عێراقدا رووی داوە. وەک دەزانین شێخ مەحموود و مەلیک فەیسەڵ هەردووکیان خۆیان بە نەوەی پەیامبەری ئیسلام محەممەد (د) دەزانی. ئەم چیرۆکەم لە شێخ ڕەئووفی کوڕی سەید نووری نەقیب بیستووە کە ئەویش لە خێزانی شێخە: پاش شەڕی دەربەندی بازیان لەنێوان هێزی کورد و هێزی بەریتانیا، شێخ بریندار کرا و بە دیل گیرا و ڕەوانەی بەغدا کرا و دادگەی لەشکری کۆلۆنیالیستی بەریتانیا فەرمانی مردنی بەسەر شێخ دا دا. بەڵام ئەوەبوو دوایی لەسێدارە نەدرا و بە دەستبەسەری ڕەوانەی هیندستان کراو پاش ماوەیەک ئینگلیزەکان ناچار بوون

لەژێر تاوی هەلومەرجدا بیگێڕنەوە بۆ سلەیمانی. شێخ لەڕێی کوێت و بەغداوە نێردرایەوە بۆ سلەیمانی و لە بەغدا چاوی بە ئەمیر فەیسەڵی هاشمی کەوتبوو کە تازە ئینگلیزەکان لە سووریاوە هێنابوویانە عێراق و کردبوویان بە مەلیک. فەیسەڵ بە شێخی گوتبوو: "ئامۆزا تۆ سەیدیت و لە خێزانی ئێمەیت. تۆ چ دەکەیت لە کوردستان و دەخڵت چییە بەسەر کوردەوە، تۆ وەک من لە بەرەبابی پەیامبەر و بەنی هاشمیت، بۆ واز لەم کوردایەتییە ناهێنیت و بێیتە بەغدا لای من". شێخ گوتبووی: "ئەوە راستە کە خێزانی من و تۆ نەوەی ئیمام حەسەن و ئیمام حسەینن. بەلام ئەوەبوو کاتێک کە حەسەن و حسەینی باپیرانمان روویان کردە دەشتی کەربەلا و دەیانویست خەڵکی رازی بکەن کە رێی هەق بگرن، هەر لەلایەن عەرەبەکان خۆیانەوە کوژران و هێندێک لەوانەی لەو خێزانە بوون رزگاریان بووبوو پەنایان بردە بەر چیاکانی کوردستان، و گەلی رەشو ڕووتی کورد نەک هەر باووباپیرانی ئێمەیان نەکوشت و بەس؛ بەڵکو باوەشی خۆشەویستییان کردەوە بۆیان و کردنیان بە بەشێک لە خۆیان و لەوەش زێتر بە گەورەی خۆیان. ئێمە سەتان ساڵ لە باوەشی کورددا گەورە بووین و تازە دڵو دەروونمان بووەتە کورد. زۆر سوپاست دەکەم کەوا بە ئامۆزا بانگم دەکەیت و منیش تۆ بە ئامۆزای خۆم دەزانم، بەلام وەک تۆ خۆم بە عەرەب نازانم، و لە تۆش داوا ناکەم هەر لەبەر خزمایەتیی من خۆت بە کورد بزانیت.. ئامۆزایەک کورد و ئامۆزایەک عەرەب..." بەمانەی سەرەوەدا دەردەکەوێ بنەچە و ڕەچەڵەک هەموو کاتێک ناتوانن ببنە پێناسەی کورد و کوردبوون.

## (ج)- نیشتمان

پێناسەیەکی دیکە بۆ دیاریکردنی "کوردبوون" نیشتمانەکەیەتی کە بە "کوردستان" نێو دەبرێ. کوردستان هەرچەندە لەسەر نەخشە سیاسییەکانی جیهان جێیەکی پێنەدراوە؛ بەلام کوردستان زاراوەیەکی مێژوویی و جوگرافیایی و کولتوورییە، کە بەلایەنی کەمەوە لە سەتەی ١٢دا لەلایەن سوڵتان سەنجەری سەلجوقەوە بە ڕەسمی دانی پێدانراوە(١٨). بەپێی کتێبی "نزهة القلوب" کە لە ساڵی ١٣٤٠دا لەلایەن (حەمدوللا مستەوفی)یەوە نووسراوەتەوە؛ ئەو

کوردستانە رەسمییە لە ١٦ پارێزگە (ئوستان) پێکهاتووە(١٩). سنووری ولاتی کوردستان لە سەتەی شانزدەدا لەلایەن مێژوونووسی کورد شەرەفەدینی بیتلیسییەوە، وەک لە دوایی دا باسی دەکەین دیاریکراوە. نێوی کوردستان بە درێژاییی سەتەکانی ١٦ و ١٧ و ١٨ و ١٩ و ٢٠ لە ئەدەبیاتی سیاسی و ناسیاسیی دەوڵەتانی قاجاری و عوسمانی و قەیسەری رووسیا و ئەورووپای رۆژئاوادا هاتووە. لە سەتەی ١٦ بەدواوە چەند نەخشەیەکی کوردستان لەلایەن ئەورووپاییەکانەوە کێشراوە. لەم نەخشانە نەخشەیەکە کە لە ساڵی ١٥٦١دا لەلایەن A. Lafreriی ئیتالیایی و یەکێکی دیکە لە سەتەی هەڤدەیەمدا لەلایەن جوگرافیازانی فەرەنسەییی Guillaume de la Croyere (١٦٧٥-١٧٢٦)ەوە. نێوی کوردستان لەلایەن دیپلۆمات و گەشتوەرەکانی ئەڤروپاوە لە سەتەی ١٦وە بەکارهێنراوە. ئەمرۆ وشەی کوردستان، چ لە رۆژهەلات و چ لە رۆژئاوادا و تەنانەت لەلایەن هێندێک لە کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتانەشەوە کە کوردستانیان داگیرکردووە، بە شێوەیەکی ئاسایی نێو دەبرێت (٢٠). کوردستان ئەڤرۆ بە نیشتمانێک دادەنرێ کە زمان و کولتووری تایبەتی خۆی هەیە. بۆ وێنە: لە داخوازینامەیەکدا کە دوو سەناتۆری بەلجیکایی، خانمی van puymbroeck و کاک p. van Roye لە ١٩٨٥/٧/١٧ دا دایان بە حکوومەتی بەلجیکا بۆ خستنەرووی دەستدرێژییی رژێمی ترکیا لە دژی کورد و سنووردانانێک بۆ ئەو دەستدرێژییە، لە پێشەکی داخوازینامەکەیاندا لەبارەی کوردستانەوە ئەمەیان نووسیبوو: "کوردستان ولاتێکە لەسەر نەخشەی سیاسیی جیهان دەستنیشان نەکراوە. (هەرچەندە) کوردستان بەسەر چوار دەوڵەتدا (ترکیا و سووریا و ئێران و عێراق) بەشکراوە، بەلاّم لەرێی زمان و کولتوورەوە بە یەکەوە بەستراوە. خەڵکەکەی بە نێزیکە ٢٥ ملیۆن دەبن. کوردستان دەکەوێتە نێوجەرگەی ئاسیای نێوەڕاستەوە، و رەنگە بێشکەی شارستانێتیی ئێمەش بێ، و نزیکەی چوار هەزار ساڵێکە یان بەو نێوەوە، یان بە نێوێکی واوە ناسراوە (٢١)". کوردستان، کە مانای "ولاتی کورد"ە بە نیشتمانی کورد دادەنرێ و لەم رووەوە ئەوانەی خەڵکی کوردستانن یان خەڵکی کوردستان بوون، بە کورد

دەدرێنە قەڵەم. جا بەم پێیە دەبێ هەموو کوردێک خەڵکی کوردستان بێ. بە سەرنجێکی سادە و سەرپێیی دەتوانین بزانین کە چەند ملیۆنێک کورد هەن لە دەرەوەی کوردستان لەدایکبوون و هێندێکیشیان بە کوردی قسە دەکەن و خۆشیان بە کورد دەزانن، بەلام "خەڵکی کوردستان" نین. لێرەدا، ئەوانەی "نیشتمان" واتە کوردستان دەکەنە پێناسەی کوردبوون، دەبێژن: "ئەمانە هەرچەندە لە کوردستان لە دایکنەبوون، بەلام بنەچە و ڕەچەڵەکی ئەمانە لەکاتی خۆی دا لە کوردستانەوە چوونەتە ئەو وڵاتانە و لەوێ گیرساونەتەوە، یان بەزۆر کۆچ دراون بۆ ئەو شوێنانە، بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەموو ئەوانەی خۆیان بە کورد دەزانن، کوردستان بە نیشتمانی خۆرسکی و بێ چەندوچۆنی خۆیان دەزانن، ئەگەرچی ڕەنگە نە خۆیان، نە باوک و باپیریان، کوردستانیان نەدیبێ، وەک فەیلییەکانی بەغدا و بەسرە (لە عێراق) و کوردەکانی ناوچەی هەیمەنە و سەقەریا و ئەستەمووڵ و ئەنقەرە (لەترکیا) و کوردەکانی ناوچەی قەزوێن و زەنگان و زەماوەند و تاران و خۆراسان (لە ئێران) و کوردەکانی دیمەشق (لە سووریا) و کوردەکانی گورجستان و ئەرمەنستان و پاکستان و ئەفغانستان و لوبنان و ئیسرائیل و.. هتد، کە بە تاقی کردنەوە دەرکەوتووە ئەم هەستەیان هەیە. بەڵێ، تۆ لە هەر وڵاتێکدا لە دایکبوو‌بیت، خۆت بە خەڵکی ئەو وڵاتە دەزانیت، ئەگەر بێتو باوک و دایکت خەڵکی ئەو وڵاتە بن، خۆ ئەگەر لە وڵاتێکدا لە دایکبوو‌بیت، بەلام بنەچە و ڕەچەڵەکت سەر بە بنەچە و ڕەچەڵەکی خەڵکی ئەو وڵاتە نەبێ؛ ئەوا خۆت بە خەڵکی ئەو وڵاتە نازانیت، ئەگەر بێتو "هەستی" بنەچە و ڕەچەڵەکیت هێشتا لەلا مابێ. بۆ وێنە: زارۆ و نەوەی ئەو فەلەستینییانەی پاش ساڵی ١٩٤٨ لە فەلەستینەوە ڕەڤیان بۆ وڵاتە عەرەبییەکان، وا پەروەردە دەکرێن کە "هەست بەوە بکەن خەڵکی فەلەستینن "نەک" هاونیشتمانی ئەو وڵاتانەی تێیدا لە دایکبوون و تێیدا گەورە بوون. بەلام هەموو جارێک "نیشتمان" لەگەڵ هەموو ئەو خەڵکەی کە لەو "نیشتمان"ەدا دەژین، هاوئاهەنگ ناوەستێ. بۆ نموونە: هەرچەندە دەتوانیت بێژیت هەموو کوردێک کوردستانییە، بەلام پێچەوانەی ئەمە ڕاست نی یە. واتە هەموو کوردستانییەک کورد نییە، بۆ وێنە: نێزیکەی پەنجا هەزار

ئاسووری تا سەت هەزار ئاسوورییەک لە کوردستاندا دەژین، و کوردستان نیشتمانی خۆیانە و کوردستانین، بەلام کورد نین. کەواتە پێناسەی سەر بە ولاتی کوردستان بوون، یان هاونیشتمانێتیی کوردستان، لە هەموو کاتێکدا و بێ چەندوچۆن نابێتە پێناسەی کوردبوون. لە کردنی "نیشتمان"دا بە پێناسەیەک بۆ دەستنیشانکردنی کۆمەلگەلێکی ئێتنی یان گەلێک، گیروگرفتێکی دیکەش دێتە پێشەوە، ئەوەش ئەو پرسیارەیە کە دەبێژێ: سنووری "راستەقینە"ی ئەو "نیشتمان"ەی باس دەکرێ چی دیاری دەکات و چۆن و لە چ کاتێکدا دیاری دەکرێ؟ زۆر "نیشتمان" هەن کە کاتی خۆی سنوورێکی رەسمی، یان خۆرسکییان هەبووە، ئەو سنوورانە بەپێی کات گۆراون و ئێستەش ئەو سنوورە رەسمییانە، یان خۆرسکییانە، بەجارێک نەماون. بۆ وێنە: سنوورەکانی ولاتی عوسمانی لە سەتەی ١٦ و ١٧ و ١٨ و ١٩ و ٢٠ دا وەک یەک نەبوون و، ئەڤرۆش دەولەتی عوسمانی هەر بەجارێک نەماوە. سنوورەکانی ئەو ولاتەی کە ئێستە بە "ئێران" نێو دەبرێ، لە هەزار سالەوە تا ئەڤرۆ گەلێک گۆرانی بەسەردا هاتووە. سنووری ئەلمانیای سالی ١٩٣٩ و ١٩٤٢ و ئێستەی وەک یەک نین. سنووری ولاتێک شتێک نییە کە بەدرێژاییی مێژوو هەروەک خۆی بمێنێتەوە. شەڕ و شۆڕی نێو خۆ، و پەلاماری دەرەوە، و هەلگیرسانی جەنگ و داگیرکردنی ولاتان، و کۆچ و رەڤی دانیشتووانی ولاتێک بە ئارەزووی خۆیان بێ، یان بەهۆی گواستنەوەیان بێ بەزۆر، لەلایەکەوە بۆ لایەکی دی، دەبنە هۆی گۆڕینی سنوورەکانی ولاتانی جیهان. جا لێرەدا دەتوانین دوو جۆرە نیشتمان لە یەک جیا بکەینەوە:

(١)- جۆرە نیشتمانێک کە دەولەتێکی خۆی هەیە.

(٢)- جۆرە نیشتمانێک کە دەولەتی خۆی نییە.

(١)- ئەو نیشتمانەی کە دەوڵەتی خۆی هەیە:

ئەگەر مەبەست لە "دەوڵەت" لێرەدا دەوڵەتی ئیدیاڵ بێ، واتە ئەو دەزگەی دەسەڵاتە بێ کە ئەندامەکانی کۆمەڵگەیەکی یەک زمان و یەک بنەچە و ڕەچەڵەک لەسەر پارچەیەک زەوی بیبا بە ڕێوە و سنوورەکانی ئەو زەوییە بەرامبەر دەسەڵاتی دەرەوە بپارێزێ، ئەوا بە ڕەئی من دەوڵەتی وەها ئەوڕۆ لە جیهاندا دەگمەنە، ئەگەر نەبێژم هەر نییە. بۆ وێنە: دەوڵەتێکی وەک سۆڤێت لە لێکدانی چەند نیشتمانێک پێکهاتووە کە چەندین گەلی جیاواز لەسەریان دەژین. وڵاتێکی وەک ئەمریکا لە گەلێک گەلی جیاواز پێکهاتووە کە هێندێکیان ئێستەش هەر بە زمانی زگماکی خۆیان قسە دەکەن، نەک بە ئینگلیزی، کە زمانی ڕەسمیی دەوڵەتە. وڵاتێکی وەک بەریتانیای گەورە لە چەند نەتەوەیەک و چەند نیشتمانێک پێکهاتووە، وەک سکۆتی و ئیرلەندەیی و ویلزی. ئیسپانیا لەگەڵ و نیشتمانی باسک و کەتەلان و... هتد پێکهاتووە، لە وڵاتێکی فرەگەلی وەک یۆگۆسلاڤیادا؛ دژایەتیی نێوان ئەم گەلانە جارویار دەگاتە ڕادەی دەستدرێژیی ناسیۆنالیستانە بەرامبەر یەکدی. تەنانەت ڕۆژنامەکانی ئەوروپا لە سەرەتای نۆڤەمبەری ئەمساڵدا باسی بەیەکدادانی گەلانی سرب و کروات و ئەلبانییەکانی یۆگۆسلاڤیا یان بە دوورودرێژی گێڕاوەتەوە(٢٢). ئەو دەوڵەتانەی کە بە دەوڵەتی ناسیۆنالی عەرەب نێو دەبرێن، زۆربەیان لەپاڵ عەرەبەوە، بەلایەنی کەمەوە، گەلێکی دیکەیان تێدایە کە هێندێکیان "نیشتمان"ی مێژوویی و جوگرافیایی خۆیان هەیە وەک کورد و گۆشینی و بەربەر. کەواتە ئەو دەوڵەتانەی کە فرەگەلن و هەر گەلە سەر زەوی تایبەتی خۆی هەیە، ناتوانن خۆیان بکەنە دەوڵەتی ناسیۆنالی تاقە گەلێک لەو گەلانەی لە سنووری ئەو دەوڵەتەدا دەژین. بەڕەئی من دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆناڵ تەنێ دەتوانێ "ڕەوایەتی" هەبێ لەو وڵاتانەدا کە یەک گەلی تێریتۆریال دەژی تێیاندا. ئەگەنا دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنال لە وڵاتێکی فرەگەلدا کە هەر یەکەیان نیشتمانی مێژوویی و جوگرافیایی خۆی هەبێ، مانای نەگرتنە بەرچاو و ژێرخستنی مافی ئەو گەلانەیە کە لە خاوەنێتیی دەزگەی دەوڵەتی ناسیۆناڵ بێ بەشکراون. ئەمەش

دۆخێکە لە گەلێک لە دەوڵەتەکانی ئەفرۆی جیهاندا هەیە و، وا لە خەڵکی دەکا کە ئەم پرسیارەی خوارەوە بە حەق بزانن. ئایا بوونی دەوڵەتی ناسیۆناڵ شتێکی پێویستە؟ بێجگە لەوەش ئەفرۆ کەم گەل هەیە کە هەمووی پێکەوە و لەژێر سایەی یەک دەوڵەتدا بژی و، بڕێکی لەژێر سایەی دەوڵەتێک یان چەند دەوڵەتێکی دیکەدا نەبێ، کە ڕەنگە ئەو دەوڵەتەی دیکە دەوڵەتی ناسیۆناڵی گەلێکی دیکە بێ، بۆ وێنە تیرۆڵەکان هێندێکیان بەر نەمسا کەوتوون، کە دەوڵەتی ناسیۆناڵی خۆیانە و هێندیکیشیان بەر ئیتالیا کەوتوون، کە دەوڵەتی ناسیۆناڵی گەلێکی بێگانەیە بەوان. ئا لەبەر ئەوە کە تۆ باسی دەوڵەتێکی وەک سۆدان دەکەیت، چۆنکە دەوڵەتەکەی عەرەبییە، ناتوانیت بڵێیت فیسارە کەس عەرەبە، هەر لەبەر ئەوەی خەڵکی سۆدانە یان پێوەنداری دەوڵەتی سۆدانە. لەوانەیە ئەو کەسە خەڵکی خوارووی سۆدان بێ، کە نە عەرەبە و نە خۆشی بە عەرەب دەزانێ و نە دەیەوێ پێی بڵێن سۆدانی و عەرەب. هەروەها ئەگەر یەکێک لە مۆنیخ (ئەڵمانیا) لە دایک بوو بوو، و پێوەنداری دەوڵەتی ئەڵمانیای فیدەراڵی بوو، مەرج نییە لە بنەماڵەی ئەڵەمان بێ. لەوانەیە باوک و دایکی ترک بووبن، وەک کرێکاری میوان هاتبن بۆ مۆنیخ، و ئەو کەسە لە مۆنیخ لە دایک بووبێ و خۆشی بە ترک بزانێ. بوون بە پێوەنداری دەوڵەتێک، بە ئارەزوو بێ یان بەزۆر، مانای وا نییە کە ئەو کەسە سەر بەو گەلەیە کە دەزگەی دەوڵەتەکەی بەدەستەوەیە.

(٢)- ئەو نیشتمانەی کە دەوڵەتی خۆی نییە:

ئەو نیشتمانانەی کە دەوڵەتی خۆیانیان نییە گیروگرفتیان گەلەک مەزنترە. ئەو نیشتمانانەی دەوڵەتیان نییە، واتە ئەو گەلانەی بێ دەوڵەتن؛ وەک ئەو کەسانەن کە ماڵیان چووبێتە سەر بەشی ماڵان. چۆنکە ئەو دەوڵەتانەی نیشتمانی گەلێکی دیکەیان داگیرکردووە، ئەو سەرزەوییەی کە نیشتمانی گەلە ژێردەستەکەیە، بە بەشێک لە نیشتمانی دەوڵەتەکەی خۆیان دەزانن و ئامادە نین جیا لە سنووری ڕەسمی و تەواوێتیی خاکیی خۆیان باسی بکەن، خۆ ئەگەر باسیشی بکەن، ئەوا لام لەسەر لایی و کۆڵکراو باسی دەکەن. بۆ وێنە: لە

ئێراندا بە ڕەسمی؛ تەنیٚ بە نێوچەی ئەردەلاٚن کە پێتەختەکەی سنەیە دەگوترێ کوردستان، بەشەکانی دیکەی ڕۆژهەلاٚتی کوردستان وەک "ئازربایجانی ڕۆژاوا" و کرماشان و ئیلام بە کوردستان نێو نابرێن، بەلٚکو بە نێوچەی کوردنشین (مناطق کردنشین). لە عێراق: کەرکووک و خانەقین ومووسلٚ و بەشێکی زۆری هەرێمی بادینان و مەندەلی و کووت و زەرباتییە و جەسسان و بەدرە و عەلی غەربی بە کوردستان نێو نابرێن. لە ترکیا و سووریا نێوی کوردستان هەر بەجارێک ناهێنرێ. لە زەمانی لێنیندا هەرێمی کەلٚباژار کە ئێستە لە خاکی سۆڤیەتدایە بە کوردستان نێو دەبرا و ئەم ڕاستییەش لە تەلگورافێکدا کە کاتی خۆی لێنین بۆ کادرەکانی حیزبی خۆی لە قەفقاز لێی داوە؛ بە جوانی دەردەکەوێ، بەلاٚم پاش دامەزراندنی کۆمارەکانی سۆڤیەت و نووساندنی خاکی کوردستان بەو کۆمارانەوە، وشەی کوردستانی سۆڤیەت بە ئەنقەست دەخرێتە پشت گوێ(٢٣).

ئێستە با بگەرێینەوە سەر "شەرەفنامە" کە لە سالٚی ٩٧/١٥٩٦ دا نووسراوەتەوە، با بزانین سنووری کوردستانی چۆن دەستنیشان کردووە. شەرەفنامە دەبێژێ:

"کوردستان لە (تەنگەی) هورمزەوە دەست پێدەکات کە دەکەوێتە کەناری زەریای هیندییەوە، و بە هێلٚێکی ڕاست لەوێ وە دەچێ تا دەگاتە مەلاتییە و لەوێشەوە دەکشێ بۆ ولاٚتی مەرەش و لەوێدا تەواو دەبێ. باکووری ئەم هێلٚە بریتییە لە نێوچەی فارس و عێراقی عەجەم و ئازربایجان و ئەرمەنستان و، باشووری کوردستانیش بریتییە لە دیاربەکر و مووسلٚ و عێراقی عەرەبی" (٢٤). ئێستە بە هاسانی دەردەکەوێ بۆمان؛ هێندێک لەو هەرێمانەی کە لە زەمانی نووسینەوەی "شەرەفنامە"دا کوردستان بوون، ئەڤرۆ تەنانەت لەلایەن کوردەکە خۆشییەوە بە کوردستان نادرێتە قەلٚەم. شایانی باسە کە داگیرکەرانی کوردستان ئەمە چەند سەتەیەکە لەرێی کۆچپێکردنی کورد و نیشتەجێ کردنی ناکوردەوە هەولی گچکەکردنەوەی کوردستان دەدەن. بە پێویستی دەزانم ئەوەش بلٚێم کە لەم سالاٚنەی دوایییدا هێندێک لە پێوەندیداران لەگەلٚ دەزگەی

ئیمپریالیستانەی رۆژاوای خاوەن بەرژەوەندیی بازرگانی لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان، هەروەها هێندێک لە "زانیاری فرۆشان"، بەتایبەتی لە ئەورووپا، کەوتوونەتە کێشانی "نەخشەی کوردستان"، دیارە بە پێی ئامانجی سیاسیی خۆیان دەیانەوێ کوردستان زۆر بە گچکە و کورت و کەلکراو بدەنە قەڵەم و کوردستانی راستەقینە بە "داخوازیی ناسیۆنالیستە کوردەکان" بخەنەروو(٢٥). لەوەش بترازێ هێندێک برای ئەرمەنیی کەللە رەقیش هەن، تەماشای ئەوە ناکەن کە ئەوانیش وەک کورد گەلێکی لێقەوماون، و هەر لەرێی برایەتیی کوردەوە و بە ژیرانە و هێمنی دەتوانن بگەنە ئامانجیان، کەچی دەچن نەخشەی ئەرمەنستانێک دروست دەکەن کە بە نێزیکە هەموو نێوچەکانی ژووروی کوردستانی تێدەخەن. پێدەچێ کە هێندێک لەم کردەوە نابەرپرسیارانە، لە بنەڕەتدا، دەستی ئەوانەی تێدا بێ کە دەیانەوێ لەم رێیەوە کورد و ئەرمەنی بکەنە ناحەزی یەک و ئەوجا دوژمنی هەردوولاش بە هەردوولا پێبکەنێ. ئەمە وا، و ئەمەشم هەر لەبەر ئەوە باسکرد تا بزاندرێ مەسەلەی رێکنەکەوتن و دەمەتەقێکردن لەسەر دیاریکردنی سنووری نیشتمانێک لە هەموو جیهاندا هەیە. هەر بۆ وێنە: لە ئیسپانیادا چەند هەرێمێک هەیە کە باسکەکان بە نیشتمانی خۆیانی دەزانن، بەڵام ئیسپانیاییەکان بەهی وانی نازانن و نایەڵن بخرێتە سنووری نێوچەی ئۆتۆنۆمی باسکستانەوە. چیرۆکی سارلاند و ئەلزاس و لۆرێنیش ئاشکران. بەم راستییانەی سەرەوەدا دەردەکەوێ بۆمان کە مرۆ دەتوانێ بێژێ "سەر بە نیشتمانێک بوون" (لێرەدا لەچاو کوردەدا کوردستان) تەنێ لە دۆخ و باری تایبەتدا دەکرێتە پێناسەی کوردبوون، و هەروەها کوردستانی نەبوونیش، واتە لە کوردستاندا لە دایکنەبوون و لە کوردستاندا گەورە نەبوون و نەژیان، ناتوانرێ بکرێتە پێناسەیەک بۆ نەبوونی کوردبوون.

(د)- ئاین

هێندێک جار ئاین -بەڵکو بە پۆپەکانیشییەوە، وەک ئاینزا (مذهب)- دەکرێتە یەکێک لە پێناسەکانی ناسنامەی کۆمەڵگەلێکی ئێتنی. راستییەکەی هێندێک

جار دەبێتە ئەو پێناسەیەی کە ناسنامەی کۆمەڵگەلێک دیاریدەکات، بەلاّم نەک هەموو جارێک. بۆ وێنە: سەر بە ئاینی مووسایی بوون؛ پێناسەیەکی بنەڕەتییە بۆ دیاریکردنی ناسنامەی جوولەکەی جووایەتی. ئاینی دورزیش پێناسەیەکی سەرکییە بۆ ناسنامەی کۆمەڵگەلی دورزییەکان. بەلاّم هەموو کاتێک دۆزەکە وا نییە. هێندێک جار وارێکدەکەوێ کە کۆمەڵە خەڵکێکی گەورە سەر بەیەک ئاین و یەک ئاینزاش بن، بەلاّم ئەو ئاین و ئاینزایە تایبەتکارێکی خۆیان نەبێ. بۆ وێنە: ترکەکان هەموو موسڵمانن، و زۆربەی زۆریان سوننی، و بگرە زۆربەی سوونییەکانیشیان سەر بە ئیمامی حەنەفین. بەلاّم وەنەبێ موسڵمانەتی و سونیەتی و حەنەفێتی هەر تایبەتکارێکی ترک بێ، وەک ئەوەی ئاینی مووسایی تایبەتکارێکی جوولەکەیە. ئەوجا مەسەلەکە لەچاو کورددا گەلێک سەختترە. راستە؛ زۆر کەس هەن کە سەرپێیی تەماشای کوردیان کردووە و دەیکەن، و لەوەشەوە هەموویان کوردیان بە موسڵمانی سوننی داوەتە قەڵەم و دەیدەن، و ئەمەش لە گەلێک کتێب و سەرچاوەدا نووسراوە. بەلاّم ئەمە راست نییە و سەر دەرنەچوونە لە مەسەلەکەدا. جارێ هەموو کورد موسڵمان نین، بەڵکو نێزیکەی ٦٥٪ - ٧٥٪ی کورد موسڵمانن، و ئەوی دی بریتییە لە ئێزدی و کاکەیی و عەلەوی و سارەیی و شەبەک و باجوان و هەقە و کاتۆلیک و پرۆتستانت و ئۆرثۆدۆکس، تەنانەت کەمەیەکی کەم زەردەشتی و لەوەش کەمتر بەهایی لەنێو کورددا هەن. دوایی ئەو کوردانەی کە موسڵمانن هەموو سوننی، یان هەموو شیعە نین، بەڵکو تەنێ ٢/٣ یان سوننی و ١/٣ یان شیعەیە. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین، نێزیکەی نیوەی کورد موسڵمانی سوننی مەزەبن. دەدیارە ئەوەش ناکرێتە پێناسەیەکی سەرەکی بۆ ناسینەوەی کۆمەڵگەلێکی ئێتنیی گەورەی وەک کورد. ئەو هۆکارە کە تا ئێستە وای لە هێندێک سەرنجدەر کردووە کە پێیان وابێ زۆربەی زۆری کورد موسڵمانی سوننی مەزەبن، ئەوەیە کە کوردە سوننییەکان، بەگشتی، هۆشیاریی سەر بە کوردبوونیان لەهی کوردە شیعەکان بەهێزترە، کە زۆربەی زۆریان لە رۆژهەلاّتی کوردستان؛ بەتایبەتی لە پارێزگەی کرماشان و ئیلام دا، و لەبن دەست رژێمی ئێراندا دەژین، کە رژێمێکی شیعەیەتییە، بە پێچەوانەی کوردە شیعەکانی

عێراقەوە (بەتایبەتی فەیلییەکان) کە هۆشیاری سەر بە کوردبوونیان یەکجار بەرزە، کە دوور نییە ئەمەش بەهۆی چەوساندنەوەیانەوە بێ لەلایەن ڕژێمی عەرەبی عێراقەوە کە ڕژێمێکی سوننێتییە. بەکورتی: ئاین ناتوانرێ، لە هەموو کاتێکدا و بێ چەندوچۆن، بکرێ بە پێناسەیەکی ناسنامەی کوردبوون. ئەگەرچی هێندێک ئاین هەن لەنێو کورددا، وەک ئاینی ئێزدی و هەققە کە هەر تایبەتکاری کوردن، و مرۆ دەتوانێ بێژێ ئەوی ئێزدییە، یان هەققەیە، دەبێ کورد بێ و هیچی دی. لەگەڵ ئەوەشدا لەچاو ئاینەکانی دیکەدا کە لەنێو کورددا باون و نێومان بردن، مەسەلەکە جۆرێکی دیکەیە.

(ئە)- کولتوور

ئەگەر کولتوور بە سەرجەمی گشتیی ئەو هەڵسو کەوتە قالببەستووانە دابنرێ کە کۆمەڵگەلێکی تایبەتی - بەجۆرێکی هۆشیارانە یان ناهۆشیارانە - لە شێوەی بیروڕا و نەرێت و نرخ پێداندا؛ لە خۆی دیاریدەدا، و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی بەجێ دەهێڵێ، ئەوا دەبێ کولتوور بریتی بێ لە ئاوێتەیەکی پتەوی ئەو بیر و سەرنج و هونەر و زانیاری و ئاین و تاقیکردنەوانە کە لە چوارچێوەی نەرێت و خووڕەوشتدا خۆیان دەنوێنن. کولتوور دەکرێ بە پێناسەیەکی گرنگ بۆ ناسینەوەی کۆمەڵگەلێکی ئێتنی، یان گەلێک. بۆ وێنە: دەگوترێ: کوردەکان هەموو کولتوورێکی وەک یەکی تایبەت بە خۆیان هەیە؛ مەبەستیش لەمە ئەو بیروڕاو نەرێت و نرخ پێدان و تاقیکردنەوانەیە کە بە درێژاییی مێژوو لەنێو کۆمەڵگەلی کورددا جێی خۆیان کردووەتەوە. بۆ وێنە: لە نامەیەکدا کە سەرکردەی کلاسیکیی کورد، بەهەشتی شێخ عوبێدوڵای نێری لە ٥ی تیشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨٠دا بۆ دکتۆر کۆچرانی ئەمریکایی نووسیبوو گوتبووی: "نەتەوەی کورد لە پێنج سەت هەزار بەرە باب پێکهاتووە و گەلێکی خۆبەخۆیە. ئاینی خۆی هەیە. هەروەها نەرێت و خووڕەوشتی تایبەتی خۆی هەیە"(٢٦). کە کورد کولتووری تایبەتی خۆی هەیە، شتێکە لەلایەن بێگانەوە دانی پێدا دەنرێ. لێرەدا ئەو کۆپلەیەتان دێنمەوە بیر کە لە داخوازینامەی دوو سەناتۆرە بەلجیکاییەکەم وەرگرتبوو و خوێندمەوە بۆتان.

لەوێدا باسی ئەوە دەکەن کە کوردستان سەرەڕای پارچە پارچەکردنیشی لە ڕێی پێوەندیی کولتوور و زمانی هاوبەشەوە پێکەوە بەستراوە.

ئەوجا ئەگەر بێتو ئێستە سەرنج لە تەواوی ئەو پاکەتە نەریت و نرخ پێدانەی کە کولتووری کوردیان پێکهێناوە بدەین؛ دەبینین لە هەموو ڕوویەکەوە، و لە هەموو بەشەکانی ئەو کۆمەڵگەیەدا کە بە کۆمەڵگەی کورد ناسراوە، پڕیەپڕییەک نین. بۆ وێنە: کوردێکی موسڵمان شەراب خواردنەوەی پێ حەرامە، بەڵام کوردێکی ئێزدی، یان مەسیحی، شەراب دەخواتەوە. کوردێکی ئێزدی کاهوو و هێندێک جۆری سەوزە ناخوات، بەڵام کوردێکی موسڵمان و مەسیحی دەیخۆن. هۆزە کوردەکان لە هێندێک هەڵسوکەوت و شێوەی جلِ و بەرگدا هەموو وەک یەک نین. هەڵسوکەوتی کوردە نیشتەجێکان کە بە "گۆران" نێو دەبرێن لەگەڵ هەڵسوکەوتی کوردە کۆچەرەکان؛ لە هەموو ڕوویەکەوە وەک یەک نین. جا ئەم "ناوەک یەکی" یە لە هێندێک هەڵسوکەوتی ناوچەیی دا وەنەبێ هەر لەلای کورد وابێ، بەڵکو لای گەلانی دیکەش هەر وایە. بۆ وێنە: کێ دەتوانێ بێژێ ڕەوشتوخووی ترکزمانێکی ئازەریی شیعە، یان ترکێکی قزڵباشی شیعە لە هەموو ڕوویەکەوە وەک ڕەوشتوخووی ترکیی سوننیی ئەستەموڵییە. یان ڕەوشتوخووی فارسزمانێکی ئەفغانی وەک ڕەوشتوخووی فارسێکی شیعەی ئەسفەهانی یە. بەڵام ئەوە هەیە دەتوانرێ بگوترێ، لە کۆمەڵگەی کورددا هێندێک تایبەتکاری کولتووری هەیە کە لە هەموو لایەک، یان بە شێوەیەکی گشتی، وەک یەکن. کورد بەپێی سروشتی جوگرافیایی وڵاتەکەی؛ گەلێکی ڕەوشت چیایی یە (هەرچەندە کورد هەموویان دانیشتووی سەرچیا، یان دەوروبەری چیا نین)، کولتوورێکی نیوە نیشتەجێیی و نیوە کۆچەری، نیوە باوک فەرمانی و نیوە دایک فەرمانی هەیە، و لە یەکگیری و ئاوێتەبوونیان جۆرە نەریت و نرخ پێدانێکی سینکرێتیستانەی وا بۆ کورد دروست بووە ئەگەر بتوانم لێرەدا ئەم وشەی سینکرێتیستانەیە بەکار بهێنم (٢٧) کە هێندێک جار کۆمەڵگەی کوردەواری، بۆ بێگانە و ئەوانەی مەسەلەکە باش حاڵی نەبوون، لە شێوەی کۆمەڵگەیەکی سەیر و ناتەبا و ناهاوئاهەنگدا دیاریدەدات. ئەم کولتوورە سینکرێتیستانەی کورد بۆ یەکەم

جار لەو وتارە سەمینارییەدا باسکرا کە لە مۆنیخ لە ٢٣ ئەیلولی ١٩٨٣ دا پێشکێشم کرد. بەپێی لێکۆڵینەوەی من، ئەم کولتووورە دووکوچکەییییە ئەنجامی ئەو نیشتەجێ کردنەیە کە بە زۆرەملێ و بە شێوەیەکی ناخۆزایی (لاطبیعي) بەسەر کورددا سەپێندراوە، هەر لە رۆژانی کۆنەوە تا ئەم سەتەی بیستەمە، و تا ئێستەش، کە درێژەپێدانی ئەوەش لە چوار چێوەی ئەم سەمینارە دەچێتە دەرەوە. لەبەر ئەوە هێندە دەڵێم ئەنجامی خۆرسکی و ئاسایی ئەم کولتوورە سینکرێتیستییە ئەوەیە هێندێک رەوشتو خوو و نەرێت و هەڵسوکەوتی ناتەبا و پێچەوانە بەیەک لە کورد دیاریدەدات. بۆ وێنە: دەبینیت کورد زۆربەی موسڵمانە، کەچی ژنەکانیان تا ئەو هەندازەیەی دەسەڵاتی داگیرکەرانی کوردستان نایانگاتێ، پەچە ناگرنەوە و لەچاو ژنانی گەلە موسڵمانەکاندا ئازادییان گەلێک پترە. بەجۆرێک تەنانەت ئەو بێگانە ئەوروپاییانەی لە سەتەی رابوردوودا بە کوردستاندا گەشتیان کردووە هەستیان بەمە کردووە(٢٨). دەبینیت کورد نوێژ دەکات و رۆژوو دەگرێ و موسڵمانێکی دەروێستە، کەچی هێندەی لەسەر لوتکە و قەدپاڵی چیاکانی کوردستان دێری دیانان هەیە، لە هەموو رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا نییە، و جەماوەری کوردیش بوونی ئەو دێرانە بە شتێکی ئاسایی دەزانێ، و ئەمەش بەڵگەیە کە بۆ ئەوەی کە کورد لە رابوردووشدا و لەکاتێکدا کە دەسەلاتی ئیسلام لە نێوچەکەدا لەسەر هەموو دەسەلاتێکەوە بووە، نەیویستووە بەزۆر ناموسڵمانێک بکاتە موسڵمان. دەبینیت کورد هیچ کاتێک لەنێو خۆی دا یەکی نەگرتووە، و بگرە بووە بە نموونە بۆ چەند بەرەکی و ناکۆکیی نێوخۆ؛ و ئەوەتا سەتان ساڵە قەوارەی یەکتای خۆی نییە و بە پارچە پارچە کراوی ماوەتەوە، کەچی بەم بندەستێتییەش، تا ئێستە خۆی لەنێو ئەو گەلە بێگانانەدا نەتواندووەتەوە کە وڵاتەکەیان داگیرکردووە.. دەبینی ئاینی ئیسلامی لە عەرەبەوە وەرگرتووە و بووەتە موسڵمان، زاناکانی، زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمی بیری خۆیان بە عەرەبی نووسیوەتەوە، کەچی زمانە کوردییەکەی خۆی هەر پاراستووە و قسەی هەر پێکردووە و نەیگۆڕیوەتەوە بە عەرەبی (٢٩)؛ لەکاتێکدا کە گەلانی میسر و سووریا و ژووروری ئەفەریکا و لوبنان و

فەلەستین هەمـوو بوونەتە عـەرەبزمـان و هەتـەر و پەتەری کولتـووری کۆنـیـان نەمـاوە. دەبینیت کـورد پێـشـەمـیـیـەکی یەکـجـار زۆر دەدات بە ئازایەتی و فۆلکلۆرەکەی نرخی ئازایەتی و سـوارچاکی زۆر بەرز دەگرێ، کاتـێـک دەبێژێ: "دنیـا مـاڵی مـەردانە" یان "ئازا جـارێک دەمرێ و ترسنۆک هـەزار" یان "مـاڵا مێر لێ، کانیـیا زێر لێ" (۳۰). جەنگاوەریی کورد نەک هەر لە داستانەکانی دا دیارن و بەس، بەڵکو کورد بە کـردەوەش و بەتایبـەتی لەلایەن بێگانەوە بە شەڕکـەر و سوارچاک و سـەربازی چاونەترس دەدرێنە قەڵەم (۳۱)، کـە ئەمـەش سـروشـتـێکی ژیانی کـۆچەرییـە. کـەچی سـەرەڕای ئەم هەمـوو نرخ دانە بە ئازایـەتی، هیـچ پێی شـەرم نیـیـە بێگانەیەک کـە لەخـۆی نیـیـە بیکات بە سەرکـردەی خـۆی، لەجیـاتی یەکـێـک کـە لە خـۆیەتی. ئەمـەش دیاردەیەکی ناکـۆکیی نێوان جۆری بیرکـردنەوەی کـۆچەری و نیشتـەجێیی دەردەخا کـە لە مێژووی کورددا ئاشکرایە. هەروەها دەبینێن کورد کە دوژمنایەتی کرد بەهەمـوو جـۆرێک شـەڕی دوژمنـەکـەی دەکـا، بەڵام هەر هێندە دوژمنەکـە بێ هێز خـۆی نیـشـانـدا (بەوەی ڕوویەکی خـۆش یان دوو قـسـەی خـۆشی کـرد) ئەو دەمـە دەستبەجێ سارد دەبێتەوە و واز لە هەمـوو دوژمنایەتییە خەستـەکەی دەهێنێ و لەوانـەیە دەسـتـیـش بکـاتە ملی دوژمنەکـەی و ڕابوردووش هیـچ لە خـەیاڵیـدا نەمێنێ. هەروەها دەبینیت کـورد بەرامـبـەر بێگانە، یان بەرامـبەر شتـێکی تازە کـە هێـشـتـا نەیناسـیـبێ زۆر بەگـومـانە، بەڵام لـەگـەڵ ئەوەشدا کـۆنەپارێزانە ناکەوێتە بەربەرەکانێی، بەڵکو بەرێزەوە هەڵسوکەوت دەکا لەگەڵی و دەڵدەدات هوردە هوردە تێی بگات و لە خـۆی دا بیـتـوێنێـتـەوە. ئەوەتا دەبینیت کـورد سـەرەڕای ئەوەی لە وڵاتێکی زۆر دواکـەوتوودا دەژی، بەڵام بە زوویـەکی زوو هۆگری "ژیانی تەکنیـکاوی و مۆدێرن" دەبێ، بێ ئەوەی مـۆرکی بنەڕەتی خـۆی ون بکا. هەروەها دەبینیت کورد زۆر باوەڕی بە (خەرافـات) و "چارەنووس" و "بەخت" و "قـیـسـمـەت" و ئـەم شـتـانـەیە (۳۲)، کـەچی لە سـەرێکی دیکـەوە واقـیـعـیـیە. ئەوەتا ئەمە لە پـەندە پێشـینانـەکـانیـدا دیارە. وەک:"هەزار فـاتیـحـا کـوتێک گۆشـت ناهێنێ" و "ئەگـەر بە دۆعـا دەبوو پشـقل بە خورمـا دەبوو"، ئەوەتا بە کـردەوەش خـۆی ناداتە دەست قـەدەر هـەمـوو کـاتێـک، بەڵکو بۆ

گەیشتنە ئامانجەکانی دەجووڵێتەوە و تەنانەت بەرخۆدان دەکا وشۆرش هەڵدەگیرسێنێ... شایانی باسە کە هێندێک لەو بێگانانەی لەنێو کورددا ژیاون و بە چاوێکی بابەتانەی بەویژدانەوە روانیویانەتە کورد، توانیویانە ژمارەیەک لە سروشتە پێچەوانەکانی کورد بخەنەڕوو. لەوانە هەندازیاری سکۆتلەندی بەهەشتی هەملتن، دروستکەری شەقامی هەملتن لە کوردستان (٣٣) دەبێژێ:

"چۆنکە کورد چیانشینە، جۆرێکی دیکەیە (و لە عەرەب ناچێ)، کەمێک شەرمنترە، سروشتی زۆرتر لە سکۆتلەندییەک دەچێ. کەمتر لە عەرەب دڵی بە دنیاوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا حەز لە گاڵتە و گەپ دەکا، بەتایبەتی ئەگەر گاڵتەکە باسی خۆی یان گەلەکەی بێ. (کورد) نەختێک سۆفی ڕەوشت و نەختێک فەیلەسوفە، و کەمێکیش باوەڕی بە قەزاوقەدەرە. ئەگەر بێت و بتوانیت بیکەیتە هاوڕێی خۆت، تەنانەت لە عەرەب راستوڕەوانترە. کورد وەنەبێ گەوجیش بێ، بەڵکو بە چاوێکی تیژەوە دەڕوانێتە جیهان و ئارەزوویەکی هۆشیارانەی هەیە بۆ هەموو پێشکەوتنێکی زانستانەی مۆدێرن و پیشەسازی، هەرچەندێک وڵاتەکەی دواکەوتە و ساکاریش بێ" (٣٤). پێم وایە، هەر ئەم سروشتە سینکرێتیستانەیەی کولتووری کوردە کە بووە بەهۆی پاراستنی کورد و رێگرتن لە تەفروتوونا بوونی. بەکورتی؛ ملدانی کورد بۆ چوونە ژێر دەسەڵاتی بێگانە، بەڵام بەمەرج (شرط) کە ئەمە خۆی لە خۆی دا بریتییە لە یەکد گیریی سینکرێتیستانەی کولتووری کۆچەری و کولتووری نیشتەجێیی، یاخود بە زاراوەی سیاسەت (مساوەمەیەک) لەنێوان دانەدوادەی تەواوی دەسەڵاتدارێتیی بێگانە (کە ئەمەیان خووڕەوشتی کۆچەرییە)، و نێوان ئامادەبوون بۆ خۆکردنە بەشێک، یان پارچەیەک لە کۆمەڵگەی بێگانەی خاوەن دەسەڵات (کە ئەمەشیان خووڕەوشتی نیشتەجێیییە)، دەورێکی گەورەی گێڕاوە و دەگێڕێ لە قالبەستندا بە کولتووری سیاسیی کورد، و بووەتە هۆی ئەوەی کە کورد وەک کورد تا ئەڤرۆ لەنێو نەچێ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەروا وەک گەلێکی بێ دەولەتی یەکنەگرتوو بمێنێتەوە. کولتووری سینکرێتیستانەی کورد هەر بەتەنێ لە هەڵسوکەوتی سیاسیانەی کورددا دەرناکەوێ. بەڵکو

تەنانەت لە رامانە ئەفسانەیی و مێتۆلۆژیاییەکانی کوردیشدا دەردەکەون. ئاینە کوردییەکانی وەک ئاینی ئێزدی و ئاینی کاکەیی و.. هتد، وێنەی ئێزدانی بە جۆرێک دێننە بەر چاومان کە وەک (مساوەمەیەک) وایە لەنێوان (تصورات)ی ئێزداییی هیند و ئێرانییە کۆنەکان کە خودێی بێ گیانی بەچاو بینراویان دەپەرست (وەک خۆر و مانگ و ئەستێرە و چیا و درەخت و زێ و.. هتد) و (تصورات)ی تاکپەرستانەی بەچاو نەبینراوی زەردەشتێتی و جوولەکەیەتی و مانێتی و پاشان موسڵمانەتی دا، کە (تصورات)ی یەکەمیان هی دەورانی کۆچەرییە، دووەمیشیان هی دەورانی نیشتەجێنییە. ئاینە کوردییەکان گەوهەری ئێزدانی لە شێوەی گیاندارێکدا دێننە بەرچاوی خۆیان کە لەرێی "دۆنای دۆن" یان "کراس گوهارتن" (تناسخ الارواح)ەوە لە تەنێکی بینراودا خۆی پێشان دەدات. ئەمەش باسێکی مێتۆلۆژیای کوردە کە لە جێی دیکەدا لێی دەدوێم. بەکورتی: کولتووری کورد یەکێکە لەو پێناسە گرنگانەی کە دەبنە هۆی دیاریکردنی پێوەندارێتیی کوردبوون.

(ف)- هەستی وەکیەکی کوردبوون

ئەگەر یەکێک بە بنەچە و رەچەڵەک کوردبوو، و خەڵکی کوردستان بوو، و بە زمانی کوردی قسەی کرد، و سەر بە کولتووری کورد بوو، واتە هەموو ئەو مەرجانەی تێدابوو کە بە پێناسەی کوردبوون دادەنرێن، ئەوجا بۆ ئەوەی بە کورد بناسرێ، دەبێ ئەو کەسە خۆی بە یەکێک بزانێ لەو کۆمەڵگەلەی کە بە کورد ناسراوە. خۆ ئەگەر هەستی بەوە نەکرد کە کوردە و خۆی بە کورد نەدایە قەڵەم، ئەوا دانانی بە "کورد" لەلایەن خەڵکەوە سەبارەت بەوەی بە بنەچە و رەچەڵەک کوردە، یان بە زمانی کوردی قسە دەکات، یان خەڵکی کوردستانە، یان سەر بە کولتووری کوردە، بە هیچ جۆرێک وا لەو کەسە ناکات کە "هەستی کوردبوون" پەیدا بکات. خۆ ئەگەر یەکێکی دیکە، نە بە بنەچەو رەچەڵەک کوردبێ، و نە خەڵکی کوردستان بێ، و نە بە زمانی کوردی قسە بکات و نە سەر بە کولتووری کورد بێ، بەڵام لەبەر هەر هۆیەک هەیە با ببێ، خۆی بە کورد بزانێ و هەست بەوە بکات کە کوردە، ئەوا لەلایەن خەڵکیشەوە

بە کورد نەدرێتە قەڵەم، وا لەو کەسە نایەت کە هەستی کوردبوونی تێدا نەمێنێ، یان خۆی بە کورد نەزانێ. **کەواتە هەستکردن بە کوردبوون واتە خۆ بە کورد زانین مەرجێکی سەرەکی و پێویستە بۆ کوردبوون.** هەر بەم پێیە ئەوی خۆی بە کورد زانی کوردە و ئەوی خۆی بە کورد نەزانی کورد نییە.. ئا لەم رووەوە بەهەشتی مستەفا بارزانی لەوەرامی پرسیارێکی رۆژنامەی Le Monde "ی فەرەنسی دا کە لێی پرسیبوو: کورد کێ یە؟" گوتبووی:"ئەوی خۆی بە کورد زانی، ئەوا ئەو کەسە کوردە" (٣٥). بەم جۆرە نیشانەکەی بەتەواوی پێکابوو. بەڵام ئێستە ئێمە ئەگەر سەرنجێکی ئەوانە بدەین کە هەستی کوردبوونیان هەیە، واتە خۆیان بە کورد دەزانن، یان بەلایەنی کەمەوە، لای بێگانە خۆیان بە کورد دەدەنە قەڵەم، دەتوانین دوو جۆرە تیپ لەیەک جیا بکەینەوە:

(١)- تاقمێکی بەژمارە زۆر گچکە هەن خۆیان بە کورد دەزانن، و لەبەردەمی هەموو کەسێکدا دەڵێن کوردن، بەڵام ئەگەر بێتو یەکێک لە پێناسەکانی "کوردبوون" بەربەرەکانێ بکرێ، یان بکەوێتە مەترسییەوە، ئەوا باکیان نییە. بەکورتی: بە پێویست و ئەرکی سەرشانی خۆیانی نازانن لەسەر پێناسەکانی کوردبوون بکەنەوە. بۆ وێنە ئەگەر خۆیان یان منداڵیان لە قوتابخانەکاندا بە کوردی بخوێنن، یان بە زمانێکی دیکە بخوێنن، ئەوا بەلایانەوە هەر وەک یەکە. خۆ ئەگەر دەوڵەتێکی ناسیۆناڵی بێگانە کە کوردستانی داگیرکردووە بکەوێتە پەلاماردانی کورد و، وێران کردنی کوردستان و دەست بکا بە ترک کردن و فارس کردن و عەرەب کردنی کورد، ئەوا باکیان نییە. بەکورتی: خۆیان بە هاووڵاتی ئەو دەوڵەتانە دەزانن کە کوردستانیان بەزۆر لە خۆیان بەشکردووە، نەک بە هاووڵاتی کوردستان. جاری واش هەیە ئەم تاقمە راستەوخۆ هاوکاری لەگەڵ ئەو رژێمانەدا دەکا کە بۆ لەنێوبردنی هەموو پێناسەکانی ناسنامەی کوردی هەوڵ دەدەن و ئەم هاوکارییەش بەشتێکی ئاسایی دەزانێ. شایانی باسە کە ئەم تاقمە تەنێ دەکەوێتە قسە و بەدەنگ دێ، کاتێک بەرژەوەندیی تەسکو تروسکی تایبەتی و خۆکەسی (شخصي)ی خۆی بکەوێتە مەترسی و تەنگاوییەوە. دەتوانین بڵێین ئەم تاقمە خەڵکە،

هەرچەندە خۆی بە کورد دەداتە قەڵەم، بەڵام هەستی نێوکۆیی لەگەڵ سەرجەمی ئەوانەدا نییە کە خۆیان بە کورد دەزانن و بە کورد ناسراون و لە هەمان کاتدا زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگەی کورد پێکدێنن. واتە؛ ئەمانە چارەنووسی خۆیان نابەستن بە چارەنووسی کۆمەڵگەی کوردەوە. ئەم تاقمە لەنێو کوردەواریدا -وەک خۆشتان دەیزانن- بە "زۆڵە کورد" نێو دەبرێن. دیارە وشەی "زۆڵ" لە کوردیدا هەر بە مانا ئاینییەکەی بەکار ناهێنرێ کە "لەدایکبوونی ناشەرعی" یە، بەڵکو "زۆڵ" بە هەموو هاتنە جیهانێک و هەموو جۆرە پێگەیشتنێکی "ناخۆڕسکی" و "نارەوا" دەگوترێ. لە هەمان کاتدا سروشتی "زۆڵ" کە دەدرێتە پاڵ ئەو جۆرە کەسانە، وەک لە وشەی "زۆڵە کورد" دا دیارە، خۆماڵی "کوردبوون لەو کەسانە ناسێنێتەوە کە بە "زۆڵ" نێویان دەبات، واتە هەر بە "کورد" دادەنرێن، ئەگەرچی بە "کوردێکی زۆڵ" دەزانرێن. نەسەندنەوەی خۆماڵی "کوردبوون" لەوانە؛ شتێکی راستە، چۆنکە ئەوانە تا خۆیان بە کورد بزانن، هەر کوردن، هەرچەندە سەر بە تیپێکی تایبەتین. جا لەبەر ئەوەی ئەم وتارەی من وتارێکی زانستانەیە، دەمەوێ خۆم لە زاراوەی سەنتیمەنتالانە و کەفوکوڵی دەروون دوور بخەمەوە، لەبەر ئەوە وا پێشنیاز دەکەم کە بەم تاقمە بگوترێ "**لە خۆیاندا کوردن**". وێنەش بۆ ئەم تیپە لە رابوردوودا هێندێک لە دەرەبەگەکان و سەرۆک هۆزەکانی کوردستان بوون. لەمدواییەشدا هێندێک لە ئاغا وخاوەن زەوی و زارە گەورەکان، و ژمارەیەکیش لە هوردە بۆرژوای رۆشنبیری دەسەڵات دارن، کە ئەمانەش جاروبار ژمارەیەک لە چڵکاو خۆر و کاسەلێس و کوڕی رۆژ و هێندێ جاریش دەستەیەک لە نەزان و ساویلکەی سەر بە چینی هەژار و دەستکورتیش لەگەڵ خۆیان کێش دەکەن.

(٢)- کۆمەڵێکی دیکە هەن، بەڵام ئەمان بە ژمارە زۆر گەورە، و زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگەی کوردن. ئەمانە نەک هەر خۆیان بە کورد دەزانن و، بەس، بەڵکو هەموو پێناسەکانی کوردبوون بە بەشێک لە خۆیان دەزانن. واتە، زمانی کوردی و بنەچە و ڕەچەڵەکی کوردی و وڵاتی کوردستان و کولتووری کورد بە "مڵکی خۆیان" دەزانن و لەسەری بە دەنگ دێن. جا لەبەر ئەوەی ئەم

"مڵکە" هەر هی ئەوان نییە، و بەشداری دیکەشیان هەیە، کە ئەوانە هەموو ئەو کوردانەی دیکەن، دیارە هەر هەڵمەت و پەلامارێک بۆ سەر "شەریکە مڵک" بە هەڵمەت و پەلامار بۆ سەر خۆیان دادەنێن. ئا لەبەر ئەوە پاراستنی "مڵکی هاوبەش" و پاراستنی "هاوبەشکار" بە پێویستیێ سەرشانی خۆیان دادەنێن. بەکورتی: **چارەنووسی خۆیان لە چارەنووسی ئەوانە جیا ناکەنەوە کە لە خاوەنێتیی پێناسە تایبەتکارەکاندا هاوبەشکاری ئەواتن.** ئەم کۆمەڵە چارەنووسی خۆیان دەبەستن بە چارەنووسی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە، لەبەر ئەوە ئەو وڵاتانەی کە کوردستانیان دابەشکردووە، بە وڵاتی خۆیان نازانن، بەڵکو کوردستان بە وڵاتی خۆیان دەزانن، و خۆشیان بە کوردستانی. هەروەها ئەو دەوڵەتانەی کە جنسیەکانیان هەڵدەگرن بە دەوڵەتی خۆیان نازانن، بەڵکو بە داگیرکەری کوردستان و کۆلۆنیالیست و دەزگەی فەرمانداریتیی ناڕەوا تێدەگەن. لە هەموو کاتێکدا دان و ستاندن و پێوەندیی گیانییان لەگەڵ کوردێک پترە وەک لە "هاووڵاتێک"ی ناکوردی ئەو دەوڵەتەی جنسیەکەیان هەڵگرتووە، با کوردەکەش کوردی دەوڵەتێکی دیکەش بێ. ئەمانە وەنەبێ هەموویان لە رێکخراوی سیاسیی کورادنەدا کاربکەن؛ یان خەریکی سیاسەت بن، نەخێر. زۆریان هەروەک کوردەکە دەبێژێ -لەماڵی خۆیان دانیشتوون و دەست بۆ سیاسەت نابەن-. بەڵام کە دەبینن تاقمێکی سیاسی باسی مەسەلەی کورد دەکەن، یان کۆمەڵێک پێشمەرگە لە دژی دەزگەی فەرمانداریتیی داگیرکەرانی کوردستان بەربەرەکانی دەکەن، ئەمانە بەمە دڵخۆش دەبن و ئەگەر پێشیان بکرێ یارمەتیشی دەدەن. هەر ئەم پشتگیرییەی جەماوەری کوردە کە بووەتە هۆی ئەوەی تاقمی گچکە گچکە پێشمەرگەی کورد بتوانن ساڵانی دوورودرێژ بەسەر چیاکانی کوردستانەوە بژین و بمێننەوە و سوپاکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان نەتوانن لە نێویان ببەن؛ چونکە جەماوەری کورد هەرچەندە بەردەوام و چالاکانە پشتگیرییان ناکا و ناچێتە ریزەکانیانەوە - بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەلایەنی کەمەوە، بەشێوەیەکی پاسیف یارمەتییان دەدات. سەربازێکی ترک کە نێوی س. ئینانج S. Inancە و رەفیا بوو بۆ لای پێشمەرگەکانی پ.ک.ک. گوتبووی:

**"هێندێک جار شەڕ و هەڵلا و چنگەپۆپانێ لەنێو سەربازەکاندا روودەدات. ئەگەر هاتوو دوو سەرباز؛ یەکێکیان کورد و ئەوی تریان ترک چوون بە گژ یەکدا، ئەوا کوردەکان پشتی کوردەکە و ترکەکانیش پشتی هاوولاتەکەی خۆیان دەگرن. جا ئەگەرچی ناهۆشیارانەش بێ، بەلأم ئەو سەربازانەی بنەچە و رەچەڵەکیان کوردە، پێیان خۆشە کە رێکخراوێکی کوردی چالاکییەک بنوێنێ..."** (٣٦). نموونەیەکی دی:

کە لە زستانی ساڵی ١٩٤٦دا و پاش ئەوەی نێزیکەی ساڵێک بوو لە رۆژهەلاتی کوردستان و ئازربایجانی ئێراندا دوو کۆمار دروست بوو بوون، یەکێکیان بەنێوی "دەوڵەتی جمهووری کوردستان" و ئەوی دیش بەنێوی "کۆماری دێمۆکراتی ئازەربایجان"ەوە، هەل بۆ لەشکری شای ئێران هەڵکەوت کە بکشێ بەسەر هەردوو کۆمارەکەدا بۆ رووخاندنیان. هەرچی خەڵکی ئازەربایجان بوون، ئەوا بەرلەوەی لەشکری ئێران بگاتە تەورێز (پێتەختی کۆماری ئازەربایجان) هەر خۆیان کەوتنە پەلاماردان و رووخاندنی حکوومەتەکەی ئازەربایجان. لە کاتێکدا کوردەکان؛ بەتایبەتی خەڵکی مەهاباد (پێتەختی کۆماری کوردستان) بۆ رووخاندنی کۆمارەکەیان زۆر خەفەتبار و رەشپۆش بوون. ئەم راستیانە تەنانەت کابرایەکی نانخۆری دەوڵەتی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی ئەو دەمەی شای لێخراوی ئێران وەک **ئیگلتن** لە کتێبەکەیدا کە لە سەر کۆماری کوردستان نووسیویەتی دانی پێدا ناوە (٣٧). لێرەدا پێشنیاز دەکەم ئەم جۆرە کوردانە وەک **"بۆ خۆیان کورد"** بناسرێنەوە. بەڵێ... ئەمە ئەو دیاردەیە (ظاهرة)یە کە بە **"هەستی نێوکۆیی"** دادەنرێ. جا ئێستە پرسیارێک دێتە گۆرێ. ئایا ئەم هەستە نێو کۆییە کە دەبێتە هۆی خۆ بە کورد زانین، چۆن پەیدا دەبێ؟ بێگومان وەرامی ئەم پرسیارەی سەرەوە هەروا بە هاسانی نادرێتەوە؛ چۆنکە بەڕاستی گەلێک هۆکاری جیاواز هەن، کە دەبێ هەموو پێکەوە و لە هەلو مەرجی تایبەتی دا بکەونە کار، ئەوجا ببنە هۆی دروستکردنی ئەم هەستە نێو کۆییە. **هێندێک لەم هۆکارانە خۆیین و هێندێکیشیان دەرەکین، واتە هی بێگانەن و لە دەرەوە دێن.** هۆکارە ناخۆییەکان سەر بە هەرێمی چۆنێتیی لێتێگەیشتن و تێڕوانینی بێگانەیە

بەرامبەر بە کورد. **تێڕوانینی خۆییی کورد و تێڕوانینی بێگانە لە کورد دوو باسی زۆر گرنگی بیروڕای گشتی و سۆسیۆلۆژین** کە تا ئێستە هەر یەکجار کەوتووەتە ژێر وردەبینی لێکۆڵینەوە، ئەوەش لەلایەن لێکۆڵەرەوەی ئەڵەمان **هەنەلۆرە کویشلەرەوە. هەنەلۆرە لە دوکتۆرنامەکەیدا** کە لە ساڵی ١٩٧٨دا بە نێوی "بیروڕای گشتی- سەرنجێکی تیۆرییانەی مێتۆدۆلۆژییانە و توێژینەوەیەکی نموونە لە تێڕوانینی خۆییی کورد"ەوە پێشکێشی زانستگەی بەرلینی کردووە، لەپاش لێکۆڵینەوەیەکی تیۆرییانەی خەست هاتووەتە سەر باسکردنی پێناسەکانی تێڕوانینی خۆیی و لە وەرامی ئەو پرسیارانە کۆڵیوەتەوە کە کورد خۆیان لە خۆیانی دەکەن. بۆ ئەمەش پێشەکی دەبێژێ:

**"باسی تێڕوانینی خۆییی گەلێک، یان کۆمەڵگەلێکی گەورە، بەگشتی، سێ نێوچەی بەیەکەوە بەستراو دەگرێتەوە:**

**یەکەمیان: بنەچەو ڕەچەڵەک، واتە ئێمە لە کوێ وە هاتووین، ئێمە کێین؟**

**دووەمیان: ئێمە چۆنین، واتە تایبەتکارەکانمان چییە؟**

**سێ یەمیان: تەڤگەری پاشەڕۆژ، واتە ئێمە چیمان دەوێ"** (٣٨) ئەوجا دەبێژێ:

**"بەڵگە بۆ ئەوەی کە کورد تێڕوانینی خۆییان هەیە، بێجگە لە دیاردەکانی خۆی، جارێ هەر بەوەدا دەردەکەوێ کە ئەوەتە (ئەم کوردانە) نێزیکەی دوو هەزار ساڵێکە لەلایەن کۆمەڵانی بێگانەوە هەر بە کورد نێو دەبرێن. کەواتە ئەم (کوردانە) هێندە تایبەتکاری نێو کۆییان هەیە، کە بووەتە هۆی ئەوەی بێگانە هەموویان پێکەوە بە نێوی "کورد" نێو ببات "** (٣٩) ئەمەش بۆچوونێکی ژێر بێژانەیە و دەبێ هەموو ئەو پێناسانەی کە لەمەو بەر لێیدواوین، پێکەوە کەوتبنە کار، و لەوەوە تێڕوانینێکی خۆییان بو کورد دروستکردبێ. چۆنکە ئەگەر کورد تایبەتکاری تەواو (کافی)ی وەک یەکیان نەبووایە، و لەو تایبەتکاراندا هەموویان هاوبەش نەبونایە - وەک هەنەلۆرە دەبێژێ- دیارە بێگانە هەموویانیان بە "کورد" نەدەدایە قەڵەم.

جا چۆن رستەی تایبەتکارە وەک یەکەکانی کورد کە تێڕوانینی خۆیی پێکدێنن، کار لە تێڕوانینی بێگانە دەکا و وا لە بێگانە دەکا کە کورد بە کورد بناسێ، هەروەها لەوانەیە هێندێ جاریش هەڵوێست و هەڵسو کەوتی بێگانە بەرامبەر بە تایبەتکارە وەک یەکییەکانی کورد؛ کار بکاتە سەر تێڕوانینی خۆییی کورد، و لەوەوە هەستی نێو کۆیی بەهێز بکا. جا لەبەر ئەوەی یەکێک لەو هۆکارە سەرەکییانەی کە چلوورە بە هەستی نێو کۆیی دەبەستێ، بەسەرهاتی نێو کۆیییە، و لە نێو ئەوانەشدا تاقیکردنەوەی نێو کۆیی لە گەڵ بێگانەدا، دیارە تاقیکرنەوەی "باش و خراپ" دەوری خۆیان دەگێڕن. بۆ وێنە: هەرکاتێک فەرمانڕەوایانی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەشکردووە، لەگەڵ کورددا کەمێک بە نەرمی بجووڵێنەوە، دەستبەجێ هەستی "جیابوونەوە خوازی" لە نێو کورددا کەمتر دەبێتەوە. بە پێچەوانەوە؛ ئەم هەستە بەرزتر دەبێتەوە کاتێک کە فەرمانڕەوایانی بێگانەی کوردستان، کە بە زۆری لە ناسیۆنالیستە شۆڤینیستەکانی ترک و عەرەب و فارس پێکهاتوون، بە توندی و تیژی بکەونە وێزەی کورد. بۆ وێنە: کە جەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم بە هۆی کودتایەکەوە لە ١٤ / ٧ / ١٩٥٨ دا لە عێراق هاتە سەر کار، و **کوردی لەسەر کاغەز بە "هاوبەشی عەرەب" نێو برد** -ئەگەرچی عێراقیشی بە پێی دەستوورەکەی بە بەشێک لە نیشتمانی عەرەب دانابوو- لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی هەرە زۆری کورد کەوتنە چەپڵە لێدان بۆی، و قاسمیان بە **"برای گەورە"** و **"سەرۆکی تاقانە"** دایە قەڵەم و عێراقیان بە **"کۆماری کورد و عەرەب"** دانا، و دەستیانکرد بە باسی **"پاراستنی تەواوێتیی خاکیی عێراق"** و **"برایەتیی کورد و عەرەب"**. هوردە بۆرژوای مارکسیستی کورد کە ئەو دەمە سەرکردەیەتیی بزووتنەوەی رۆشنبیرانی کوردی بە دەستەوە بوو، کەوتە دژایەتیی هەموو جۆرە بزووتنەوەیەکی جیا بوونەوە خوازانە. **کاژیک** کە تاقە رێکخراوێکی کورد بوو کە "تەواوێتیی خاکی عێراق"ی بە دەستنیژی ئیمپریالیستەکانی رۆژاوا دەزانی و "برایەتیی کورد و عەرەب"یشی بە برایەتییەکی درۆزنە و چاو بەست لە دژی کورد دەدایە قەڵەم، چۆنکە **کاژیک** برایەتیی کورد و عەرەبیی، تەنێ بە "وەک یەکیی کورد و عەرەب لە

دەسەڵاتدا" تێدەگەیشت و خۆی لە کەفو کوڵی عاتیفەوە نەد     ەوا لەلایەن ئەو هوردە بۆرژوا کوردانەوە، بەو پەڕی توندو تیژییەوە بەربەرەکانێ دەکرا. بەڵام کە تاقیکردنەوەکانی شۆرشی ئەیلوول لە خوارووی کوردستاندا (کە لە ١٩٦١/٩/١١ەوە تا ١٩٧٥/٣/٢٦ درێژەی کێشا) ئەو راستییانەی خستە روو، کە فەرمانڕەوایانی بێگانەی کوردستان بە پێی سروشتی کۆلۆنیالیستانەیان، کوردێکی "دڵسۆز بە خۆیان" لە کوردێکی "یاخی بوو لێیان" جیا ناکەنەوە، واتە ئەو قسەیە هاتە دی کە زۆر جار کاژیک دەیکرد و دەینووسی و بلاوی دەکردەوە، ئەوجا مەسەلەکە جۆرێکی دی لێهات، بە تایبەتی پاش هەرەسەکەی مارتی ساڵی ١٩٧٥، رێکخراوەکانی هوردە بۆرژوای کورد وایان لێهات ناچار بوون خۆیان لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی جەماوەری کورددا بگونجێنن و چاوێک بە ستراتیژی خۆیاندا بگێڕنەوە، و ئەو جا لە تێزەکانی کاژیکەوە گەلێک سەرەتا و سەرنجیان خواست(٤٠) کە یەکێکیان **"بڕیاری چارەنووس بۆ کورد"** بوو لە جیاتی "ئۆتۆنۆمی" کە نێزیکەی چل ساڵێک بوو هوردە بۆرژوای ماکسیستی کورد پێوەی خەریک بوون. هەروەها لە نووسینەکانیاندا باسی بەربەرەکانێی جیابوونەوە خوازی و "پاراستنی تەواوێتیی خاکیی عێراق" نەما (٤١). بە کورتی؛ کەوتنە رووی سیاسەتی داگیرکەرانی کوردستان لەوەدا کە **"کوردێک" و "کوردێک" لە یەک جیا ناکەنەوە**، و بە یەک چاو تەماشای هەموو کوردێک دەکەن، و لە گەڵ هەموو کوردێکدا هەر یەک جۆرە تەرازوو بەکار دێنن، ئەڤرۆ بووە بە تاقیکردنەوەیەکی نێو کۆیی کورد، و ئەم بەسەرهاتە نێو کۆییانە بە تایبەتی لە تەنگانەدا، وایان لە کورد کردووە کە هەموویان زۆرتر و زۆرتر خۆیان بە **"یەک شت"** تێبگەن و چارەنووسی خۆیان بە **"یەک چارەنووس"** بزانن. هەروەها بە تاقی کردنەوە دەرکەوت، کە زۆر لەو کوردانەی **"لە خۆیاندا کورد"** بوون، و لە عێراقدا خزمەتی دەوڵەتی بەعسییان دەکرد، پاش ئەوەی لەلایەن بەعسییەکانەوە هەر وەک ئەو کوردانە هەڵسو کەوت کرا لە گەڵیان کە **"بۆ خۆیان"** کوردن، ئەوجا وازیان لە بەعسییەکان هێنا و چوونە ریزی کۆمەڵی دووەمەوە (٤٢). ئەم جێگۆڕکێیە لە دۆخی **"لە خۆدا کورد"ە وە بۆ دۆخی "بۆ**

**خۆ کورد**" ڕۆژ بە ڕۆژ فراوانتر دەبێت. هەر بۆ نموونە: بەر لەوەی بەعسییەکان لەڕێی کودەتاوە لە شەستەکاندا لە عێراق بێنە سەر کار، گەلێک خوێندکاری کورد هەبوون کە لە زانستگەی بەغدا زمان و ئەدەبیاتی عەرەبییان دەخوێند، دوایی دەبوونە مامۆستای زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی لە قوتابخانە نێوەندییەکانی کوردستان و عێراقدا. بەڵام پاش ئەوەی دەسەڵاتی شۆڤینیستانەی بە عەرەبکەرانەی بەعسییەکان کەوتە کار بەتایبەتی پاش هەرەسی شۆڕشی کورد لە ١٩٧٥دا، و دەستەکەی سیاسەتی بە عەرەبکردن لە کوردستاندا کەوتە ڕوو، قوتابیانی کورد ڕوویان لە خوێندنی زمانی عەرەبی وەرگێڕا. بەڵگە بۆ ئەمەش دان پێدانانی کار بەدەستانی بەعسی خۆیانە. بۆ نموونە: ئەوەی پێی دەگوترێ **"ئەنجومەنی یاسادانانی نێوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردستانی عێراق"** لە ڕۆژی ١٩٨٤/١٢/١١دا خەریکی لێکۆڵینەوەی چارەسەری جێپڕکردنەوەی شوێنە بەتاڵەکانی مامۆستایانی زمانی عەرەبی بوو لە **"نێوچەی ئۆتۆنۆمی"دا، محەممەد پیرۆز ڕۆستەم "ئەمینداری گشتی"ی** (٤٣) **بەڕێوەبەرێتیی پەروەردە و خوێندنی بەرز** "کە خۆی یەکێکە لەوانەی **"لەخۆیاندا"** کوردن و کاربەدەستێکی ڕژێمی بەعسە؛ گوتی: "بۆ مەسەلەی زمانی عەرەبی، و لە دوو توێی قسەکانمدا لە سەرەتای کۆبوونەوەکەوە ڕوونمکردەوە، هیچ خوێندکارێک نییە کە خەڵکی نێوچەکە بێ و بچێتە بەشی زمانی عەرەبی لە کۆلیجی پەروەردە (٤٤) ئەمجا گوتی : "... ئەم بارە ئەگەر هەروا بەم جۆرە بمێنێ، ئەوا باشترین مامۆستاکانی زمانی عەرەبی بەرەو ئەوە دەچن کە تەقاویت بکرێن، بێ ئەوەی کەسێک ببێ جێگەیان بگرێتەوە.. هتد" (٤٥). یەکێک لە هاوڕێکانی کە ئەویش ئەندامی ئەنجومەنە، ویستی تێیبگەیەنێ کە هۆی ئەمە ئەوەیە قوتابی کورد زمانی عەرەبی کەم دەخوێنن؛ لەبەر ئەوەیە ناتوانن بچنە بەشی عەرەبیی زانستگە، بەڵام **محەممەد پیرۆز ڕۆستەم** گوتی:

".. بەڵام ئارەزووی ئەوەیان هەیە کە بچنە بەشی زمانی ئینگلیزییەوە... باشە، ئایا ئەو خوێندکارەی دەچێتە بەشی ئینگلیزی، خوێندنی لەوە پێشی بە زمانی ئینگلیزی بووە؟ بێگومان نە. چۆنکە ئەو بە زمانی عەرەبی زێتر دەخوێنێ وەک لە زمانی ئینگلیزی. لەگەڵ ئەوەشدا بەداخەوە ڕوو دەکاتە ئەم بەشە. با

لەگەڵ خۆمان راستگۆیین. هێندێ جار لاوازیی (هەست)ی خۆ بە هاونیشتمان دانان دەورێکی دیاری هەیە. بۆ وێنە: خوێندنەکەی بە زمانی عەرەبییە هەر لە پلەی سەرەتاییەوە تا کۆتاییی پلەی نێوەندی، و گوێ لە پرۆگرامی تەلەفزیۆن و رادیۆ دەگری بە عەرەبی، گۆڤار و رۆژنامەی عەرەبی دەخوێنێتەوە، و گۆرانی گۆرانیبێژانی ژن و پیاو بە عەرەبی لەبەر دەکات، بەڵام روو ناکاتە خوێندنی زمانی عەرەبی، کەچی دەچێ زمانی ئینگلیزی دەخوێنێ، ئەو زمانەی کە لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییەوە دەیخوێنێ، و بە چەند دەرزێکی کەمیش.. بیانووشیان ئەوەیە کە ئینگلیزی زمانێکی جیهانییە... بەڵام روو ناکەنە زمانی قورئان و ئاین و هاو نیشتمانێتی و شەرەف و ئابروو.. با رەپوڕاست بێژین، هێندێک خوێندکار وازیان لە رێبازی ئاین و رێبازی عێراق و هاونیشتمانێتیی باش هێناوە، ئەگەنا ماوەی فێربوونی زمانی عەرەبی، وەک هەموومان دەزانین زێترە لە ماوەی فێربوونی هەر زمانێکی دی و سوپاس" (٤٦).

بەڵێ، ئەم قسانەی **محەممەد پیرۆز** زۆر راستن. بەڵام ئەوە هەیە کوردەکە نە دژی عەرەب بووە و نە دژی عەرەبە (وەک عەرەب)، و نە دژی قورئان بووە و نە دژی قورئانە (وەک قورئان)، بەڵام ئەڤرۆ کوردەکە لە عێراقدا -چۆنکە ئێستە قسەکە لەسەر عێراقە- هەست بەوە دەکات کە زمانی عەرەبی بە زۆرە ملی دەسەپێندرێ بە سەری دا، بۆ ئەوەی بکرێ بە عەرەب و بتوێنرێتەوە. جاران کوردەکە زمانی عەرەبی بە زمانی قورئان و ئیسلام دەزانی، و لەرێی ئایینی ئیسلامەوە هەستی بە هاوبەشییەک دەکرد لەگەڵ عەرەبدا، و بە خۆشییەوە فێری زمانی عەرەبی دەبوو، و دەیخوێند، و زانای گەورەی عەرەبیزانی تێدا هەڵدەکەوت، کە زۆر خزمەتی زمان و ئەدەب و کولتووری عەرەبیان دەکرد. گەلێک لە بە نێو بانگترین نووسەران و شاعیران و مێژوونووسان و یاسا ناسان وفەیلەسووفانی بە عەرەبی و فارسینووس، یان کورد بوون یان بە بنەچە و رەچەڵەک کورد بوون، لەمانە (ابن خلكان و ابن الاثير و ابو الفدا و دينوري و ادريسي و عباس العقاد و جميل صدقي الزهاوي و معروف الرصافي و احمد شوقي و شمس الدين الزركلي و ابن الحاجب و سوهرەوەردی و رشيد ياسمي و محمد قاضي و محمد عبده و عبدالرحمن الكواكبي و

محمد کرد علي و سەتانی دیکە...) جاران زانای وەک **شێخ مارفی نۆدێیی** (١٧٥٣-١٨٣٨) هەبوو کە (٤٦) کتێبی بەنرخی لەبارەی زمان و ئەدەبیات و فیقهی ئیسلام و شەریعەت و چی و چییەوە بە زمانی عەرەبی و فارسی دەنووسی و تاقە یەک فەرهەنگی گچکەی عەرەبی - کوردیشی دەنووسی، کە ئەوەش وەک خۆی دانی پێدا ناوە - بۆ خزمەتی زمانی کوردی نەبووە، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە **کاک ئەحمەدی** کوڕی فێری زمانی عەرەبی بکات، ئەو زمانەی کە بە زمانێکی پیرۆزی داناوە. ئەوەتا لەسەرەتای فەرهەنگۆکی "ئەحمەدی" دا بە شیعری عەرەبی و فارسی دەبێژێ: (٤٧)

الحمد لله علی ما وهب          هدانا الی لسان العرب

(سوپاس بۆ خودێ بۆ ئەوەی بە ئێمەی بەخشی، ئێمەی ڕێنوێنی کرد بۆ فێربوونی زمانی عەرەب)

در این رساله به کردی زبان          کنم زبان عربرا بیان

(لەم نامیلکەیەدا بە زمانی کوردی، زمانی عەرەب دەخەمە ڕوو)

تاکه فرزندم احمد بی تعب          شود دانای لغات عرب

(داکو زارۆکەم ئەحمەد بێ زەحمەت وشەکانی عەرەبی فێر ببێ)

لهذا ناوم نا احمدیه          والله ارجو صلاح النیه

(لەبەر ئەوە نێوم نا ئەحمەدییە،          نیاز چاکی لە خودێ داواکارم)

**بەڵێ جاران وابوو، ئەڤرۆش کوردەکە زمانی عەرەبی ناخوێنێ، چۆنکە بە زمانی داگیرکەری دەزانێ، محەممەد ڕۆستەم لە بنی مەنجەڵەکەی داوە و ڕاست دەکا،** کوردەکە خۆی بە هاونیشتمانی عێراق نازانێ؛ بەڵکو خۆی بە هاونیشتمانی کوردستان دەزانێت، لەبەر ئەوە نایەوێ هیچ زمانێکی بێگانە بە زۆر بسەپێندرێ بە سەری دا. ئەم هەڵوێستەشی وەنەبێ هەر بەرامبەر بە زمانی عەرەبی وابێ، بەڵکو بەرامبەر بە فارسیش و ترکیش (٤٨) هەر وایە. ئەڤرۆ کوردەکە دەبێژێ: "ئەی بۆچی عەرەب و ترک و فارس نایەن کوردی فێربن.

ئێمە چیمان لەوان کەمترە؟" ئەمەش بە داخەوە (واقیعەکەیە) بەڵام زۆر ناخۆشە، بە تایبەتی بۆ یەکێکی وەک من کە هەر لە منداڵییەوە تامو لەزەتی ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسیم چێشتووە و ساڵانێکی دوورو درێژ خەریکی مێژوو و کولتووری ئەم دوو گەلە بووم، دەزانم ئەم هەڵوێستەی ئەفرۆی کورد لە دژایەتی کردنی زمانی عەرەبی و فارسی و ترکییەوە نایەت و نەهاتووە، بەڵکو کاردانەوەیەکی ناچاریی هەڵوێست و هەڵسو کەوتی تاوانبارانەی دەسەڵاتدارە زۆرداره ملهوڕەکانی عەرەب و فارس و ترکە (٤٩) کە نەک بە ئازایەتی و ڕۆستەمی خۆیان؛ بەڵکو بە چەک و فرتوفێڵی دەوڵەتە زلهێزەکان کوردستانیان داگیر کردووە و نەتەوەی کوردیان نەک هەر لە بڕیاری چارەنووسی خۆی؛ بەڵکو لە سادەترین مافی مرۆڤ بێ بەشکردووە... بەڵام ئێوەی کوردی دەربەدەر و هەموو کوردێکی بەشخوراوو ژێردەستەی دی، دەبێ بزانن کە ئۆباڵی ئەم دەربەدەرییەی ئێوە و هەموو ئەو خراپە کاری و تاوانباری و گوناهە زلانەی بەرامبەر کورد کراون و دەکرێن، ناکەوێتە ئەستۆی هەموو عەرەب و هەموو ترک و هەموو فارسێک. گەلی ترک هەر ئەتاترک و ترکەشی نەبووە، بەڵکو **نازم حیکمەت و سمایل بێشکچیشی** هەبووە. گەلی فارس هەر **ڕەزا پەهلەوی و هوەیدای** نەبووە، بەڵکو **سەعدی و ئیرەجیشی** بووە. گەلانی دیکەش هەر وانە. گەلی ئیتالیا هەر **مۆسۆلۆنی** نەبووە، بەڵکو **میکایل ئەنجلۆشی** بووە. گەلی ئەڵمان هەر **گۆبلز و هیتلەری** نەبووە، بەڵکو **گۆیتە و شیلەریشی** بووە. گەلی کوردیش هەمووی یەکجۆر نییە، بەڵکو بریتییە لە باشیش و لە جاشیش. **هەموو گەلێک وەک مریشک وایە، هێلکەش دەکا و ڕیقنەش دەکا.** ئەوانەی فاشیست و شۆڤێنیست و دیکتاتۆر و خوێنڕێژن، سەر بە هەر گەلێک بن و ڕۆژی هەزار جاریش سنگ بۆ گەلی خۆیان بکوتن، ئەوانە نەک هیچ خزمەتێکی گەلی خۆیان ناکەن و بەس؛ بەڵکو قوڕێکی خەستیش دەگرنەوە بۆی. (٥٠) ئێستە با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان و نموونەیەکی دی بهێنینەوە: جاران لە عێراق لە نێوان عەرەب و کورددا ژن و ژن خوازی هەبوو، بەڵێ کەم بوو، بەڵام هەر هەبوو، و کەسیش نەبوو بە کوڕێکی کورد بێژێ تۆ بۆ کچێکی عەرەبت هێناوە، یان بە کچێکی کورد بێژێ تۆ بۆ شووت بە

کوڕێکی عەرەب کردووە، بەڵام کاتێک کە حکوومەتی بەعس لە ساڵی ۱۹۸۰دا قانونێکی دەرکرد بە ئامانجی تواندنەوەی کورد و بە پێی ئەوە ئەو پیاوە عەرەبەی ژنێکی کورد بهێنێ ۵۰۰ دیناری عێراقی بەخشیش وەردەگرێ، ئەوجا ئێستە وایلێهاتووە، ئەگەر کچێکی کورد تەنانەت لە دڵخوازیشەوە شوو بە عەرەبێک بکات، هەر بە چاوی سووک تەماشا دەکرێت و کوردەکان پێی دەڵێن، ها ۵۰۰ دینارەکەتان وەرگرت؟؟ سەیر ئەوەیە بەپێی قانوونی ژمارە (۱٥٠)ی ۲۸/٦/۱۹۸۰ هەر عێراقییەک کە ژنی بێگانەی هەبێ (واتە کە ژنێک عێراقی نەبێ یان عەرەب نەبێ) لە هیچ دەزگەیەکی رەسمیدا کاری نادرێتێ. بە کورتی: کوردێکی عێراقی ناتوانێ کوردێکی ئێرانی، یان خەڵکی ترکیا، یان جێیەکی دی بهێنێ، یان شوو بکات پێی، ئەگەر وا بکا دەبێ بێ کار بمێنێتەوە.

ئەوەی لەبارەی داگیرکەرانی عەرەبەوە گوترا، لەبارەی داگیرکەرانی فارس و ترکیشەوە دەتوانرێ بگوترێ. **بەم جۆرە داگیرکەرانی کوردستان هێندێک جار لە چلوورە بەستن، و جاری واش هەیە لە پەیدا کردنی هەستی کوردایەتیی نێو کۆییدا دەورێکی کاریگەرانە دەگێڕن.** کەواتە لێرەدا قسەکەی ئێتنۆلۆژێکی فارس کە نێوی **تەقی حەبیبی شەلانییە** راستە کە لە دکتۆرنامەکەیدا نووسیویەتی و دەبێژێ:

**"ئەگەرچی هەموو ئەو هەوڵانەی کوردە ئێرانییەکان داویانە بۆ ئەوەی بە ئۆتۆنۆمی، یان هیچ نەبێ بە خۆ بەڕێوەبەرێتی بگەن، تا ئێستە سەری نەگرتووە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە، هەموو هەوڵدانێکی حکوومەتە ئێرانییەکان بۆ کردنی کورد بە بەشێک لە خۆیان، و تواندنەوەیان لە باری کولتوورییەوە، تەنێ یەک سەرکەوتنی بەدەستهێناوە بەس، ئەوەش ئەوەیە کە بەمە هۆشیاریی خۆناسینی ئێتنیی کوردە ئێرانییەکان وەک خۆی بە زرتو زیندوویی ماوەتەوە.** (٥۱).

**بەکورتی : دەتوانین بێژین هەستی نێو کۆییی کوردبوون لە هەموو پێناسەکانی دی گرنگتر، و لە هەموشیان بەهێزترە بۆ دیاریکردنی ناسنامەی کوردبوون.**

جا هەتا ئەم هەستە نێو کۆییە لە نێوان ئەوانەدا بمێنێ کە بە کورد ناسراون، ئەوا کورد وەک کورد دەمێنێتەوە. هەر کاتێک ئەم هەستە نەما، ئەوا کوردیش بەرەو نەمان دەچێ. شتێکی رێکەوت نییە کە رێبازی **"نەتەوەیی"** کە لە قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزمەوە هەڵقوڵیوە **"هەستی چارەنووسی وەک یەک"**ی بە پێناسەی سەرەکی داناوە بۆ بوونی نەتەوەیەک(٥٢).

## (٥)- پێناسەی کورد بوون لای کورد و لای بێگانە

لە کاتێکدا کە کۆمەڵگەلێکی گەورەی خەڵک کە لە خۆرپوانینێکی دیاریکراویان هەبێ، و خۆیان بە شتێکی تایبەتی بناسن، ئیدی مانای وا نییە کە لەلایەن بێگانەوە (واتا لەلایەن ئەوانەوە کە سەر بەو کۆمەڵگەیە نین) هەر بەو جۆرە دەناسرێن، یان بەو جۆرە لە قەڵەم دەدرێن. بۆ وێنە: کە یەکێک **"لە خۆی دا کورد بوو"**، یان "بۆ خۆی" کورد بوو، مانای وانییە کە لە لایەن بێگانەشەوە هەر بە کورد دەدرێتە قەڵەم، یان هەر بە کورد دەناسرێ. راستییەکەی بۆ ئەوەی کۆمەڵگەلێک لەلایەن بێگانەوە لە رێی ناسنامەیەکی تایبەتییەوە بناسرێتەوە، هەر ئەوە بەس نییە کە ئەو کۆمەڵگەلە خۆی خۆی بەو ناسنامەیە بناسێ و بداتە ناسین، بەڵکو پێویستیشە ئەوانەی لە دەرەوەی ئەو کۆمەڵگەلەن، هەر بەو ناسنامەیە بیانناسن، جا بەم پێیە، بۆ ئەوەی کورد هەر بە کورد بناسرێن و هیچی دی؛ پێویستە جارێ خۆیان خۆیان بە کورد بزانن، و خۆشیان هەر وەک کورد بە خەڵکی بناسێنن، و ئەوجا خەڵکیش هەر بە کوردیان بزانن. جا لەبەر ئەوەی ئەڤرۆ کورد و نیشتمانەکەی لە هەلو مەرجێکی تایبەتدان، ئەوا بۆ **داگیرکەرانی کوردستان - کە کۆلۆنیالیستن لە تیپێکی تازە**، نالوێ، کورد وەک چۆن خۆیان خۆیان بە کورد دەزانن، ئەوانیش هەر ئاوا بە کورد بیانناسن. چۆنکە ئەگەر وابکەن، دیارە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی داگیرکەرانی کوردستان دان بەوەدا بنێن کە کورد کۆمەڵگەلێکی جیاوازە و مافی ژیانی خۆی هەیە. جا بۆ ئەوەی کورد نەگا بەو مافە؛ داگیرکەرانی کوردستان پەنا دەبەنە بەر نەناسینی ناسنامەی کوردبوون. بۆ وێنە دەبێژن **"کورد ترکی چیان"** و زمانەکەشیان زارێکی ترکییە. لەم دواییەشدا

-گوایە بە نێوی لێکۆڵینەوەوە- گەلێک کتێبیان دەرکردووە، کە هەوڵیان داوە تێیاندا، کورد، یان هیچ نەبێ هێندێک تیرەی کورد ببەنەوە سەر هێندێک گەلی کۆن، کە ترکە شۆڤێنیستەکان لافی ئەوە لێدەدەن گوایە ئەوانە ترک بوون (٥٣). فارسە شۆڤێنیستەکانیش دەبێژن، **کورد تیرەیەکی فارسن** و زمانەکەشیان شێوەیەکی فارسی کۆنە (٥٤). شۆڤێنیستە عەرەبەکانیش دەبێژن، کورد لە بنەڕەتدا **"کوردی کوڕی موردی کوڕی یەعموری کوڕی سەعسەعەی کوڕی هەوازنی کوڕی حەربی کوڕی جەبەلی کوڕی مائولسەمائن"** و لە بنەچە و ڕەچەڵەکدا عەرەبن. بەڵام زمانی خۆیان گۆڕیوە، و بۆ "ئیسپاتی" قسەکەی خۆشیان هۆنراوەی هۆنەرێکی کۆنی عەرەب دێننە پێشەوە کە گوتوویەتی:

لعمرک ما الاکراد ابناء فارس ولکنهم ابناء کرد بن مرد بن یعمر

بەمەدا دەردەکەوێ، شۆڤێنیستە ترک و عەرەب و فارسەکان، ئەگەرچی لە مەسەلەی بەربەرەکانێ و لەنێو بردنی کورددا لەنێو خۆیاندا یەکن، بەڵام لە بارەی بنەچە و ڕەچەڵەکی کوردەوە لەنێو خۆیاندا ناڕێکن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکە بۆ ناڕەواییی هەڵوێستیان، و دیارە ئامانجی ئەم جۆرە جرتو فرتە سیاسییانە ئەوەیە؛ دان بە ناسنامەی کورد بوونی تەواودا نەنێن. جا ئەگەر ئێمە سەرنجێکی ئەم قسانە بدەین، دەبینین لە دووتوێی هەر یەکێک لەم بانگاشانەدا وشەی "کورد" هەیە، بۆ وێنە: کاتێک دەگوترێ "کورد ترکی چیان" یان "کورد تیرەیەکی فارسن" یان "کورد لە نەوەی عەرەبن"، ئەوەتە **هەموو جارێک وشەی "کورد" دەخرێتە حسێبەوە.** ئەمەش مانای وایە ئەوانەی بە سەرزاری و بۆ گەیشتنە ئامانجێکی سیاسی نایانەوێ دان بە ناسینی ناسنامەی کوردبووندا بنێن، کەچی هێشتا ناچارن نێوی کورد، ئەگەر هەروەک نێویش بێ - ببەن. واتە ناتوانن بە جارێک واز لەو ناسنامەیە بهێنن کە کورد خۆی بۆ خۆی دروستیکردووە و بە خۆی دەڵێ "کورد"، و ئەمەش مانای وایە کە ناڕاستەوخۆ و ناویستە، دان بە بوونی جۆرە ناسنامەیەکی کوردبووندا دەنێن. سەیر ئەوەیە هێندێک جاریش هێندە سەریان لێتێکدەچێ، کورد بە

**"ترکی رەسەن"** (٥٥) و زمانی کوردی بە "فارسیی رەسەن" (٥٦) و هێندێک تیرەی کورد بە **"نەوەی کۆنە خانەدانانی عەرەب"** (٥٧) دەدەنە قەڵەم. ئەگەر چی وەرامی ئەو پرسیارەیان پێ نادرێتەوە کە **"بۆچی وا شێتانە و دڕندانە بۆ لەنێو بردنی ئەو "ترکە رەسەنانە" و "ئەو زمانە فارسییە رەسەنە" و "نەوەی ئەو کۆنە عەرەبە خانەدانانە" هەوڵ دەدەن؟؟؟**

تاقیکردنەوە دەریخستووە کە بەردەوامیی کۆمەڵێک خەڵک لە خۆڕاگرتن و پێداگرتندا بۆ پاراستنی ناسنامەیەک، لە ڕێی پاراستنی ئەو پێناسە خۆکردە تایبەتکارانەوە کە ناسنامەکە پێکدێنن، دەبێتە هۆی ئەوەی، زوو یان درەنگ، کار بکاتە سەر جۆری تێڕوانینی بێگانە، و لە ئەنجامدا وایلێبکات کە دان بەو ناسنامەیەدا بنێ. جا لەبەر ئەوەی ئەو کوردانەی **"لە خۆیاندا"** کوردن؛ سۆر نین لەسەر بوون و مانەوەی پێناسە خۆ کردەکانی دروستبوونی تێڕوانینی خۆییی کورد، دیارە هەتا بەو جۆرە بمێنێتەوە، هیچ کارێک ناکەنە سەر گۆڕینی جۆری تێڕوانینی دەرەوە (بێگانە)، بە پێچەوانەی ئەو کوردانەی **"بۆ خۆیان" کوردن کە بە هۆی سۆر بوونیان لەسەر کوردبوونیان، زوو یان درەنگ، کار دەکەنە سەر گۆڕینی تێڕوانینی دەرەوە و لە ئەنجامدا چلوورە بەستن بە پێناسەکانی کوردبوون و لەو ڕێیەشەوە بە ناسنامەی کوردبوون.**

بە کورتی : دەتوانین بێژین **ئەگەر هەستێکی نێو کۆیی بە چارەنووسی وەک یەک لە نێوان تاکە تاکەی کۆمەڵگەیەکدا هەبوو، ئەوا دەبێتە مۆرکێکی گرنگ بۆ ناسنامەی ئەو کۆمەڵگەلە.** جا ئەگەر ئەمە بچەسپێنین بەسەر کورددا دەتوانین بێژین، هەتا کۆمەڵگەلی کوردەواری ئەم هەستە نێو کۆیییەی بمێنێ بەوەی کە کوردە، واتە ئەو پێناسە سەرەکییەی بمێنێ کە دەبێتە هۆی ئەوەی پێناسەکانی دیکەی کورد (وەک زمانی کوردی، و کوردستان، و کولتووری کورد، و... هتد) بە "ملکی" خۆی بزانێ و بە بەشێک لە خۆی تێبگات، ئەوا دیارە بۆ هێشتنەوەی ئەو پێناسانە تێدەکۆشێ. دیارە ئەو دەمەش ناسنامەی کورد بوون وەک ناسنامەیەکی خۆیا و جیا لە ناسنامەکانی دیکە دەمێنێ، و کورد وەکی کۆمەڵگەلێکی خاوەن ناسنامەی خۆی دەناسرێ. ئەوەتا

• لەم ساڵانەی دواییدا گەلێک سیاسی و رۆشنبیر و بیرکەرەوەی عەرەب و ترک و فارس، کورد نەک هەر وەک کۆمەڵگەلێکی ئێتنی، یان **"گەلێک"**؛ بەڵکو وەک **"نەتەوەیەک"** دەناسن. **هیلال ناجی (هلال ناجي)** کە یەکێکە لە ناسیۆنالیستە رۆشنبیرە نێودارەکانی عەرەبی عێراق، لە نێوەڕاستی شەستەکاندا گوتی:

"راستییەکەی مەسەلەی کورد گرنگیپێدانێکی مەزن دروستدەکا نەک لەبەر ئەوەی نێوچەیەکی چیایی کە کوردەکان تێیدا دەژین لە عێراق جیا دەبێتەوە، چونکە خەڵکەکەی دەیانەوێ دەوڵەتێک بۆ خۆیان دابمەزرێنن؛ بەڵکو لەبەر ئەوەی زۆر هەن لەو باوەڕەدان کە سەربەخۆیی کورد، مانای ئەوەیە سەرچاوە نەوتە بەپیتەکان لە عێراقی عەرەبیمان دەپچڕێ و عێراق بێ بەش دەکرێ لێی. ئا لەمەوە وایان لێ هاتووە گرنگی دەدەن بە یەکێتیی دەستکردانەی عێراق. ئەم خەیاڵەش هەر لە بنەچەوە هەڵەیە. ناسیۆنالیتەی کورد راستییەکی بەرچاوە. کوردەکانی عێراقیش کەرەسەی ئاشکرای ناسیۆنالیتەیان هەیە، و بەرژەوەندیی ناسیۆنالیزمی عەرەب لەوەدایە کەدان بە مافی کوردەکاندا بنێ لە بڕیاردانی چارەنووسی خۆیاندا، بۆ وێنە لە سنووری یەکگرتنێکی فێدرالیێ، یان کۆنفێدرالیدا، کە ئەوە ببێتە سەرەتای هەرەوەزی و برایەتییەکی بەردەوام لە جیاتی ئەوەی خستنە پشتگوێی واقیع و مێژوو و ئاواتی گەلان لەلایەن ئێمەوە ببێتە هۆی ئەوەی ئەم گەلە (کورد)، زوو یان درەنگ، ئازادیی خۆی بە زۆری چەک دەست خۆی بخات، خۆ ئەگەر سەر نەکەوت، ئەوا ببێتە خەنجەرێکی ناپاکی و بدرێ لە پشتی هەموو بزووتنەوە ناسیۆنالیستە عەرەبییە رزگاریخوازەکان لە عێراقدا" (٥٨). **ناجی عەلوەش (ناجي علوش)** کە یەکێکە لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستانەی چەپیی عەرەب، لە کۆبوونەوەیەکی پرسیار و وەرامدا کە لە شوباتی ١٩٧٩ دا بۆ وتو وێژ لەسەر مەسەلەی **"نەتەوە"** و **"ناسیۆنالیزم"** و **"یەکێتیی عەرەب"** ساز کرابوو؛ لە بارەی مەسەلەی کوردەوە گوتی: "بەڵام ئەوەندەی پێوەندیی بە کوردەوە هەیە، ئەوا کورد گەلە و گەلێکیشە لە گەلە کۆنەکان. مێژووی عەرەب کە باسی عەرەب دەکا باسی کوردیش دەکا، تەنانەت لە پێش فتوحاتی ئیسلامیدا. لە بەر ئەوە

ناشیٚ بوونی ئەمانە وەک گەلێک بخرێتە پشتگوێ. (واتە) وەک گەلێک کە گیرو گرفتێکی ناسیۆنالیان هەیە وەک گیرو گرفتی عەرەبی. ئەمانە (کوردەکان) ئێستە بە سەر پێنج دەوڵەتدا بەشکراون. کوردەکان نەبوونە پارچەیەک لە عێراق هەتا ئەو پەیمانە بەسترا لە نێوان ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی و ئیمپراتۆرێتیی فارسیدا لە سەتەی رابوردوودا کە پێم وایە نێوی نرا پەیماننامەی ئەرزرۆم و یان لە ١٨٤١ یان لە ١٨٤٧ دا بوو، کە بە پێی ئەوە بەشێک لە کوردەکان خرانە سەر عێراق، و هەر بە پێی ئەوەش بڕیار درا کە عەرەبستان (خۆزستان) بۆ ئێران بێ، ئەوەش هەر تەنێ بۆ نەخشە کێشانی سنوور بوو. کوردەکان بە پێی ئەم بنچینەیە گەلێکی سەربەخۆن. جا ئەگەر ئێمەی عەرەب مافی ئەوەمان هەبێ بۆ یەکێتیی (عەرەب) تێبکۆشین، ئەوا ئەوانیش (کوردەکان) مافی ئەوەیان هەیە تێبکۆشن بۆی. ئێمە پێویستە ببینە هاوپەیمانیان و یارمەتیان بدەین و تێبکۆشین لە گەڵیان بۆ هێنانە دی ئەوە... خۆ ئەگەر بەم جۆرە بیر نەکەینەوە، ئەوا بیر کردنەوەکەمان لە یەکێتیی عەرەب لە چەشنی بیرکردنەوەی رەگەزخوازانەی شۆڤینیانەدا دەبێ، نەک لە چەشنی بیرکردنەوەی زانستانەی خاوەن رێبازی سیاسیی پێشکەوتنخوازانە... (٥٩).

هەر لە سەمینارەکەشدا عەلوەش دەبێژێ: "ئەی باشە هەڵوێستمان چی بێ بەرامبەر بە مەسەلەی کورد؟ هەڵوێستمان ئەوەیە کە باسمکرد بۆتان. ئێمە لە گەڵ مافی کورددایین بۆ یەکێتی و سەربەخۆیی و بڕیاری چارەنووس و لەگەڵ ئەوەدایین کە پێوەندییەک ببەستریٚ لە گەڵیاندا وەک هاو پەیمان، وەک نەتەوەیەکی سەربەخۆ. هەروەها لەگەڵ ئەوەدایین کە لە عێراقدا ئۆتۆنۆمییان هەبێ بەو پێیەی کە بەشێکن لە عێراق، چۆنکە هێشتا یەکێتیی ناسیۆنالیان نەهاتووەتەدی. بەڵێ لەگەڵ ئۆتۆنۆمییەکی راستەقینەدایین بە هەموو مانای وشە. ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین بۆ بڕینەوەی هەموو جۆرە ناکۆکی و خراپ لە یەکگەیشتنێک لە نێوان بزووتنەوەی ناسیۆنالیستانەی کورد و ناسیۆنالیستانەی عەرەبدا. بێگومان ئێستە خراپ لە یەکگەیشتن هەیە بە هۆی هەلو مەرجی رابوردووەوە. پێویستە لەسەرمان تێبکۆشین بۆ کۆتایی هێنان بەم بارە. چۆنکە مانەوەی ئەم بارە وەک خۆی، دەبێتە هۆی دوژمنایەتی لەنێوان

دوو گەلی دراوسێدا کە پێوەندیی مێژوویی دوورو درێژ و بەرژەوەندیی هاوبەشکاری دەیانبەستێ بە یەکەوە. مەسەلە نابێ هەروا بمێنێتەوە... هتد"( ٦ ). بەڵام راستو ڕەوانترین و بە ویژدانترین و ئازایانەترین داننان بە ناسنامەی کوردبووندا هەتا ئەورۆ هەر ئەو قسانەیە کە **موعەممەری قەززافی** لە رۆژی ١٨/١٢/١٩٨٠ دا و بە بۆنەی کۆڕێکی جیهانییەوە لە **مەدرید** بۆ لێکۆڵینەوە لە بیری قەززافی دەریبڕی. ئەوجا مرۆڤ بیروڕای هەرچییەک بێ بەرامبەر بە قەززافی، ئەگەر هاتو لە هەق لای نەدا، دەبێ دان بەوەدا بنێ کە ئەو قسانە یەکەمین داننان و تاقە داننانە بە مافی کورددا لەلایەن سەرۆک دەوڵەتێکی ئەم جیهانەوە. **قەززافی** گوتی: "ئەز عەرەبم و یەکێتیی خاکی عەرەب و یەکێتیی نەتەوەی عەرەبم لا گرنگە. بەڵام ئەمە وا لە من ناکات کە چاو لە راستی بپۆشم، یان فێڵ بکەم لێی و هەڵسو کەوتێکی ئیمپریالیستانە بنوێنم... کورد عەرەب نییە، و ئێمەش ناتوانین زۆری لێبکەین ببێتە عەرەب... ئەگەر بە ئارەزووی خۆی ویستی ببێتە عەرەب، ئەوە بەسەر چاو، بەڵام ئەگەر خۆی بە خاک و نەتەوەکەیەوە بەست، ئەوا ئازادە. بۆچی دەبێ شەڕ بکەین لە دژی؟ شەڕکردن لە دژی کورد بۆ لەنێو بردنی ئەم نەتەوەیە پێویست نییە. پێم وایە زۆر زەحمەتە کورد بە لەش (وەک بووەیەک) پاکۆ بدرێ. ئەم شەڕ و گیرو گرێیانە لە دژی کورد چارەسەر نین، چۆنکە خەباتی کوردانە درێژە دەکێشێ هەتا نەتەوەی کورد سەربەخۆ دەبێ و کەرتە پەرشو بڵاوەکانی خۆی کۆ دەکاتەوە... چارەسەری کۆتایی بۆ مەسەلەی کورد بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەسەر خاکی کوردستان - خاکی نەتەوەی کورد - دەکرێ. ئەز پشتگیریی خەباتی کورد دەکەم، بەڵام ئەمە بۆ بەرهەڵستیکردنی دەوڵەتە عەرەبییەکان و ترکیا و ئێران نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە کورد نەتەوەیەک پێکدێنن کە خاکێکی خۆی هەیە... پێویستە ئێمەش وازیان لێبهێنین و ئازاد بن لە دامەزراندنی دەوڵەتێکدا بۆ خۆیان لەسەر خاکی خۆیان... کورد خاکی خۆیان هەیە و نەتەوەیەکی بران، و پێویستە رێزی بگرین و ئەز دژی ئەوەم دزانە پەلاماریان بدرێ، ئەز دژی چەوساندنەوەیان و پەرشو بڵاو کردنەوەیانم لە جیهاندا... ئەز پشتگیریی خەباتی کوردەکان دەکەم

لە پێناوی نەتەوەیەکی کوردستانیدا کە جێی خۆی بگرێ لە خۆرهەلاتی نێزیکدا لە تەنیشت نەتەوەی عەرەب و ترک و ئێرانییەوە... " هەروەها لە رۆژی ٢ی مارتی ١٩٨٥ دا و بە بۆنەی دامەزراندنی سەرکردەیەتیی ناسیۆنالْ بۆ بەرێوەبەرێتیی هێزە شۆرشگێرە عەرەبەکان لە تەرابلوس گوتی: "ئەم بەیەک گەیشتنە، بێجگە لەوەی کە لەبارەی نەتەوەی عەرەبەوە باسمکرد، پشتگیرییەکی تازەش پێک دێنێ بۆ نەتەوەیەکی لەتوپەتکراوی ئازار دراوی دی، کە ئەوەش نەتەوەی کوردی برایە و هێندێک لە رۆلەکانی وان لەژێر ئالای ئەم سەرکردایەتییەدا. تەنانەت ئەو کوردە خەباتکارانەی لەگەلْ ئێمە نین، ئەڤرۆ هەست بەوە دەکەن کە شتێکی تازە لە دایکبووە بۆ سووتی ئەوان... رزگار کردنی نەتەوەی عەرەب، یەکخستنی نەتەوەی عەرەب لەسەر بنچینەیەکی پێشکەوتنخوازانەی گەلەمپەرانە. ئەمەش مانای لایەنگرییە، لایەنگریی نەتەوەی عەرەب بۆ خەباتی نەتەوەی خاوەن شانازیی کورد. هەروەهاش لە ئێستەوە خەباتی نەتەوەی عەرەب و خەباتی نەتەوەی کورد دەبنە پشتگیری یەکدی. ئێمە (ی عەرەب) خۆمان لەژێر باری چەوسانەوە و دەستدرێژی (ی بێگانە)دا بۆ سەر نەتەوەکەمان دەنالێنین و هەر لە رۆژانی جەمال پاشاوە گالتە بە مێژووی دوور و درێژمان دەکرێ تا ئەڤرۆ. ئێمە ناتوانین بکەوینە ناپاکی و خۆ کێشانەوە بەرامبەر نەتەوەیەک کە هەر تووشی ئەو ژانە تالە بووە کە نەتەوەی عەرەب تووشی بووەو تا ئێستەش پێوەی دەنالێنێ. وێستانی خۆکەسی (شخصي)ی من لە تەنیشت نەتەوەی کوردەوە لەبەر هۆکاری جوگرافیایی و سیاسی، یان مێژوویی نییە، واتە لەوانەیە پالپێوەنەری بنچینەییی من ئەو ئازار و ئێشە بێ کە مێژووی نەتەوەی عەرەب دەریبرپوە، و منیش لێیکۆلیومەتەوە. هەروەها (لەوانەشە) ئەو ژانە تالانە بێ کە ئێستە تووشی نەتەوەی عەرەب بووە، وایان لە من کردبێ هەر لە خۆمەوە خەمی نەتەوەیەکی لەتو کوتکراوی کۆلۆنیزەکراوی چەوساوەی وەک خۆمان بخۆم... خۆ ئەگەر وا نەبێ، ئەوا دیارە ناپاکی لەگەلْ خۆم و لەگەلْ هەموو ئەو نرخە نەمرانەدا دەکەم کە باوەرم پێ یانە. هیچم پێ ناکرێ ئەوە نەبێ کە بە تەواویی لایەنیی نەتەوەی کورد و سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی خاکەکەی بگرم. جا

کاتێک ئەم وتەیە ئاراستەی خەباتکارە کوردەکان بکرێ، تەنانەت ئەوانەی لێرە نین، ئەوا دەبێتە یارمەتییەک بۆیان، هەروەها بێگومان واشیان لێدەکات کە لایەنگیریی سەرکردەیەتیی ناسیۆنالی هێزە شۆڕشگێڕەکان بکەن و بێنە تەنیشت نەتەوەی عەرەب و مەسەلەکەیەوە، و ئەوجا خەباتیش دەبێتە خەباتێکی نێو کۆیی... و بۆ پێشەوە و خەباتی شۆڕشگێڕانە بەردەوامە" (رادیۆی تەرابلوس).

زانای سۆسیۆلۆژی بەنێوبانگی ترک **ئیسمایل بێشکچی** (لە ١٩٣٩ دا لە دایکبووە) کە چەند جارێک لەسەر ئەوەی لەبارەی کوردەوە شتی نووسیوە و لەسەر کوردی کردووەتەوە، لە کار دەرکراوە و گیراوە و ئازار دراوە. بۆ جاری دوایی لەسەر نامەیەک کە لە ١٩٨٠/٨/١٤ دا بۆ سەرکردەی یەکێتیی نووسەرانی سویسرەی نووسیبوو (١٠) ساڵ زیندانی کرا. بێشکچی لەو نامەیەدا بە شێوەیەکی گشتی باسی دۆزی کورد و چەوساندنەوەی کورد لە ژووروی کوردستاندا دەکات. **بێشکچی** لە نامەیەکدا کە بۆ **یونسکۆ** نووسیویەتی، باسی بیر و کارەکانی **ئەتاترک** دەکا و دەبێژێ: "گرنگترینی بەرهەمە شانازیدارەکانی ئەتاترک جەنگی ١٩١٩-٢٢، و ئەو حیزبەیە کە بەنێوی "**حیزبی گەلی کۆمار خواز**" ەوە دروستیکردووە. هەروەها بەشداریکردنی گەورەی لە دامەزراندنی کۆماری ترکدا، بەڵام بەرهەمە شانازیدارە گەورەکانی ئەتاترک دەبێ لەگەڵ بیرەکانیدا وەک یەکەیەک وەربگیرێن. جا لەم نامەیەشدا زۆر جار لەسەر مەسەلەی کوردستان دەوەستین. واتە ئێمە کارەکان و بیری ئەتاترک بە پێی پێوەندییان بە مەسەلەی کوردستانەوە دەپێوین، واتە ئێمە کارەکان و بیری ئەتاترک بەپێی پێوەندییان بە مەسەلەی کوردستانەوە دەنرخێنین. کاتێک دێتە سەر شیکردنەوە و نرخاندنی مانا و بیرەکانی ئەتاترک، ئەو دەمە نەتەوەی کوردستانی و کوردستان هەمیشە وەک نوختەیەکی بنچینەیی دێتە پێشمان. وا بەکورتی بیری ئەتاترک لەباری سەرنجی مەسەلەی کوردستانییەوە دەنرخێنین:

(١)- "پارچە پارچە کردنی کوردستان و خستنیە ژێر رکێفی باری

دابەشکرانی ئیمپریالیستانە و خستنە کاری سیاسەتی "دابەشکە و ببە بە سەرگەورە" بەرامبەر بە نەتەوەی کورد". **بێشکچی** هەر لەو نامەیەدا دەبێژێ: "لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەم و بەتەواوی لە کۆتاییی جەنگدا گەلێک کارەساتی گرنگی سەر بە مەسەلەی کوردستان روویان دا، یەکێک لە گرنگترینی ئەم کارەساتانە لە چارەکی یەکەمی ئەم سەتەیەی بیستەدا بوو دەورێکی گرنگی تواند لە مێژووی رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا و کارێکی مەزنی کردە سەر ژیانمان. ئەوەش دابەشکردن و پارچە پارچە کردنی کوردستان بوو. راستییەکەی ئەمە سەرەتای کارەساتەکان بوو. خستنە کاری (سیاسەتی) دابەشکردن بەرامبەر کوردستان و خستنیە ژێر رکێفی کەرتکەرتکردنی ئیمپریالیستانە و کۆلۆنیالیستانەوە، هۆکاری گرنگن لە مێژووی رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا:

دەستگرتن بەسەر مافی نەتەوەی کورددا کە دەولەتی رزگار بوو و سەربەخۆی خۆی دابمەزرێنێ، و دەستگرتن بەسەر مافی نیشتمانی و دیمۆکراسیی کورددا، ئەمە یەکێکە لەو کارەساتە کۆمەلایەتییە گرنگانەی کە کاریان کردووەتە سەر مێژووی رۆژهەلاتی نێوەڕاست و هەروەها ژیانی ئەڤرۆمان... هتد. هەولدان بۆ جیاکردنەوەی کورد لە یەکدی لەڕێی چاندنی لە غەم و تەلی دڕکاوی و روانگەی سەرنجدان و پاراستنی ئەم بارە و چەسپاندنی بەهۆی سەربازی لە تەپلی سەرەوە تا بەری پێ چەکدار کراو، یەکێکە لە کارەساتەکانی ئەم سەردەمەی ئێستەمان... هتد" (نامەی بێشکچی)

(٥)- دوا وشە

بەشدارانی بەڕێزی سەمینار

ئێستە دەمێنێتەوە سەر ئەوەی بزانین ئایا کورد نەتەوەیە، یان نەتەوە نییە؟ لە وەرامدا دەبێژم ئەوە مەسەلەیەکە، بەداخەوە، زۆرتر پێوەندیی بە سیاسەتی جیهانییەوە هەیە وەک لە زانست.

سیاسەتیش دەستکردی مرۆڤە، بە پێچەوانەی زمان و نیشتمان و کولتوور و

بنەچە و ڕەچەڵەک و هەستی نێو کۆییەوە کە ئەمانە هەموو بەرهەمی خۆڕسک و خۆزا و خۆکردن. نەتەوە، وەک لە وتاری سەمیناریی **"بیری نەتەوەییی کوردی"** (٦١) وهەروەها لە لێکۆڵینەوەی **"گۆڤاری نیشتمان و کۆمەڵەی ژێکاف"** دا (٦٢) ڕۆنم کردووەتەوە، زاراوەیەکە ئەڤڕۆ بەزۆری بۆ دیاریکردنی ئەو گەلانە بەکار دەهێنرێ کە خاوەنی دەزگەی دەوڵەتیی خۆیانن. **"دەوڵەت"**یش بوویەکی دەسکردە، نەک خۆکرد و خۆزا. مێژوو پێمانرادەگەیێنێ کە زۆر گەلی دەوڵەتدار هەبوون، پاش جەنگێک دەوڵەتەکەیان لەدەستچووە، یان دەوڵەتەکەیان دەوڵەتێکی دیکە جیا بووەتەوە لێی، و بووە بە دوو دەوڵەت یان چەند دەوڵەتێک. بۆ وێنە: ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی پێش جەنگی جیهانیی یەکەم یەک دەوڵەت بوو. پاش جەنگی جیهانیی یەکەم، هەموو ئەم دەوڵەتە عەرەبییانەی ئەڤرۆی لێدروستبوون. زۆر گەلی واش هەبوون کە دەوڵەتی خۆیان نەبوو؛ بەلاَم پاش جەنگێک یان شۆرشێک بوون بە خاوەن دەوڵەت. ئەوجا ئێستە ئەم پرسیارەی خوارەوە دێتە گۆڕێ. ئایا ئەو گەلەی دەوڵەتی هەبووە، و **بەهۆی دەوڵەتەکەیەوە بە "نەتەوە" ناسراوە**، پاش ئەوەی دەوڵەتەکەی نەماوە، **لە شەوو ڕۆژێکدا لە "نەتەوەیەتی" کەوتووە؟** ئایا ئەگەر هاتو گەلێکی بێ دەوڵەت بەهۆی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، یان بە پێی پێویستیی بەرژەوەندیی زلهێزێکی کۆلۆنیالیست، دەوڵەتێکی سەربەخۆی دەسکەوت، **ئایا ئەو گەلە لە شەوو ڕۆژێکدا دەبێتە "نەتەوە"؟** یان ئەگەر نەتەوەیەک دەوڵەتێکی هەبوو، و لە ئەنجامی جەنگێکەوە دەوڵەتەکەی بوو بە دوو دەوڵەت، ئایا ئەو نەتەوەیە **بە شەوو ڕۆژێک دەبێتە دوو نەتەوەی لە یەک جیاواز؟**

ئەوجا ئێستە ئەگەر گەلێک، یان کۆمەڵگەلێکی ئێتنی، یان با بێژین هەر کۆمەڵگەلێکی گەورە، کە بەلایەنی کەمەوە دوو هەزار ساڵێک بێ لەلایەن خۆ و لەلایەن بێگانەوە بەنێوی کوردەوە ناسرابێ، و لەسەر زەوییەک بژی کە نێزیکەی هەزار ساڵێک بێ بە **"کوردستان"** بەنێوبانگ بێ، و خاوەنی زمانێک بێ کە بەلایەنی کەمەوە ٦٠٠-٧٠٠ ساڵێک بێ پێیبنووسرێ. ئەوجا ئەم کۆمەڵگەلە گەورەیە کە نێزیکەی ٢٥ ملوێن دەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەسەر پێنج دەوڵەتی بێگانەی سیستەم جیاوازدا بەشکرابێ، و هێندێکیشی پەڕیبێتە

ئەم پەڕ و ئەو پەڕی جیهان و هەر بەشێک لێی جنسیەی دەوڵەتێکی بێگانەی دیکەی هەبێ، کەچی ئەمانە هەموو خۆیان هەر بە پێوەنداری یەک کۆمەڵگەل و یەک زمان و یەک سەرزەوی و یەک کولتوور بزانن، **و کە لێیان بپرسیت تۆ چیت، بەر لە هەموو شتێک بێژن : "کوردم"**. ببوورن -ئەوەتا جوانترین نموونە بۆ ئەمە ئامادەبوونی ئێوەیە لەم سەمینارەدا و هەمووشتان بەنێوی کوردەوە، ئەگەرچی هەرچەند کەسێکتان پێوەنداری دەوڵەتێکی دیکەن، ئێستە لام وایە مرۆڤ، تەنانەت ئەوانەی فرە بێ ویژدانانە و نابابەتانەش بۆ شت دەچن، زۆر زەحمەت دەبینن، ئەگەر بێتو سەرەڕای ئەم هەموو راستییە بابەتانەیەش ئەم کۆمەڵگەلە کوردە؛ نەک تەنێ بە "گەلێک" بەڵکو بە "نەتەوەیەک" یش دانەنێن... بێگومان ئەم سەمینارە سەمینارێکی پۆلیتۆلۆژیانە نییە، لەبەر ئەوە لەسەر مەسەلەی "نەتەوە" پتر ناڕۆم، گوێگران دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ سەر لێکۆڵینەوەکانی دیکەم لەم بارەیەوە. لە کۆتاییدا دەبێژم دانەنانی کورد بە نەتەوەیەک، یان گەلێک، یان بە کۆمەڵگەلێکی ئێتنی سەربەخۆ، بەرەئیی من، نابێتە هۆی سەندنەوەی ناسنامەی کوردبوون لە کورد. لەم رووەوە وتارەکەم بە هۆنراوەی شەست حەفتا ساڵێک لەمەو بەری هۆنەرێکی کورد کۆتایی پێدێنم کە گوتبووی:

کورد ئەوەند کوردن بەسەت شەیتان لە کوردی ناکەون - - ئێکە خەڵکی بۆچی بۆ خۆی دەردیسەر پەیدا دەکا؟

جا لەبەر ئەوەی چەند رۆژێکی کەمی ماوە بۆ جێژنی سەری ساڵی تازە، ئەوا هەر لە ئێستەوە پیرۆزبایی ساڵی نوێتان لێدەکەم، هیوام وایە ساڵی ١٩٨٦ بەختیاری بۆ بەشخوراوانی ئەم جیهانە و سەرکەوتن بۆ بیری ئازادی و یەکسانی لەگەڵ خۆی بهێنێ. هەربژین...

# (٦)- ژێدەکارەکان

(١)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە

Küchler, Hannelore: Öffentliche Meinung. Eine theoretisch-methodologische Betrachtung und eine exemplarische Untersuchung zum Selbstverständnis der Kurden. Inaugural Dissertation des Fachbereichs für Philosophie und Sozialwissenschaften der Freien Universität Berlin. 1978 Vorworts,. iii

کویشلەر، هەنەلۆرە: بیروڕای گشتی - سەرنجێکی تیۆرانەی میتۆدۆلۆژیانە و توێژینەوەیەکی نموونەیی لە تێڕوانینی خۆیی کورد. دکتۆرنامەی بەشی فەلسەفە و زانستەکانی کۆمەڵگە. زانستگەی ئازاد لە بەرلین ١٩٧٨. پێشەکی. ل iii.

(٢)- بۆ دەستکەوتنی زانیاریی پتر لەبارەی شێوەکانی زمانی کوردییەوە گوێگری بەڕێز دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو باسانەی کە لەم بارەوە نووسیومن، وەک "زمانی یەکگرتووی کوردی" بلاوکراوەی **"یەکێتیی نەتەوەییی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا" (نوکسە)**، بامبێرگ ١٩٧٦ و **"زمانی نووسینی کوردەکان"** بە ئەڵمانی لە **"ئەکتا ئیرانیکا"** دا کە ئینسکلۆپیدیایەکی ئێرانەوانییە.

وتارەکەم بەم جۆرەیە:

Jemal Nebez: Die Schriftsprache der kurden, in Acta Iranica. Encyclopädie permanent des Etudes Iraniennes, Deuxieme Serie, Monumentum H. S. Nyberg II. Diffusion Brill, Leiden 1975, S.97-122

(٣)- بیبلیۆگرافیستی ترکی عوسمانی شەمسەددین سامی (شمس الدین سامی) لە بیبلیۆگرافیاکەیدا کە بە ناوی (قاموس الاعلام) هوە لە ساڵی ١٣١٤ی کۆچیدا (٩٧/١٨٩٦) لە چاپ دراوە؛ دەبێژێ: **"هێندەی لەنێو کورددا زانا هەڵکەوتووە؛ هەر خەریکی زمانی عەرەبی و فارسی بوون، و گوێیان نەداوەتە زمانی خۆیان"**. (تەماشای بەرگی پێنجەمی لاپەڕە ٣٨٤٢ بکە). ئەم کۆپلەیەی سەرەوە لە ساڵی ١٩٧٠.دا سەرنجی راکێشا و وەرمگرت بۆ ئەو باسەی کە بە زمانی ئەڵمانی لەسەر میری کۆرەی رەواندز نووسیم لەژێر نێوی "پاشای کورد میر محەممەدی رەواندزی، بەنێوبانگ بە میری کۆرە؛ لە ئاوێنەی سەرچاوە رۆژهەڵاتی و رۆژاواییەکاندا"، هەمبورگ ١٩٧٠. - سەیری لاپەڕە ٧٢ بکە و نێوی کتێبەکەش بە ئەڵمانی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

Jemal Nebez: Der kurdische Fürst Mir Muhammadi

Rawandizi, genannt Miri Kora, im Spiegel der morgenländischen und abendländischen Zeugnisse. Ein Beitrag zur kurdischen Geschichte, Hamburg 1970.

جا لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا "قاموس الاعلام" م لەبەر دەستدا نییە؛ کۆپلەکەی نێو "قاموس الاعلام"م لە کتێبەکەی خۆمەوە وەرگرت.

(٤)- تەماشای ل ١١٢-١١٣ی دیوانی حاجی قادری کۆیی بکە کە لەلایەن چاپخانەی کوردستانەوە لە هەولێر لە ساڵی ١٩٥٣ دا بڵاو کراوەتەوە.

(٥)- ئەم هۆنراوەیەم لە ساڵی ١٩٥٧ دا لە بەهەشتی رەشید شەوقی بیست (تکایە تەماشای لاپەڕە (٧٠-٧٢) بکە. هەروەها لە هۆنراوەیەکی پیرەمێردیشدا هەیە).

(٦)- علي سيدو الگوراني: من عمان الى العمادية او جولة في كردستان الجنوبية، القاهرة ١٩٣٩.

(٧)- جارێکیان قوتابییەک لەو قوتابیانەم کە کوردییان نەدەزانی، بەڵام خۆیان بە کورد دەزانی، پێمیگوت: "زمان وەک زارۆ وایە. تۆ ئەگەر بێتو ژنەکەت دووگیان بێ و بە ڕێکەوت دوور بکەویتەوە لێی و پاش دوور کەوتنەوەت زارۆیەکت بێ و گەورە بێ، بێ ئەوەی تۆ دیبێتت، یان ناسیبێتت، هەرکاتێک زانیت زارۆیەکت هەیە، ئەوا ئەو زارۆکە بە زارۆی خۆت دەزانیت، با نەشتدیبێ یان نەشتناسیبێت. منیش لەو کاتەوە کە زانیومە خۆم کوردم، و کوردیش زمانێکی تایبەتیی خۆیان هەیە، زمانی کوردی بە زمانی خۆم دەزانم".

(٨)- علي حسني الخربوطلي: القومية العربية من الفجر الى الظهر، دون ذكر تاريخ الطبع، دار احياء الكتب العربية، ص ٥٢. هەروەها عبد الرحيم فودە؛ الاسلام والقومية العربية، دار احياء الكتب العربية ١٩٦١، ص ١٥.

هەروەها جەمال نەبەز: بیری نەتەوەیی کوردی نە بیری "قەومیەت"ی رۆژهەڵاتی و نە بیری ناسیۆنالیزمی رۆژاوایی یە، بنکەی چاپەمەنیی ئازاد، ستۆکهۆڵم ١٩٨٤، ل ١٩-٢٠.

(٩)- تەماشای کتێبی "التنبيه والاشراف" بکە کە لە لایەن عبد الله اسماعيل الصاوي یەوە لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٣٨ دا بڵاو کراوەتەوە (ل ٧٨). سەیر ئەوەیە لە لاپەڕە ٧٩ی هەر ئەو کتێبەدا بنەچە و ڕەچەڵەکی کورد دەبرێتەوە سەر "کوردی کوڕی ئەسفەندیاری کوڕی منۆچەر..." ابن حوقل یش کە لە ٩٧٧ دا مردووە بنەچە و ڕەچەڵەکی کوردی بۆ سەر عەرەب بردووەتەوە.

تەماشای ابو القاسم ابن حوقل: "کتاب صورة الارض" بکە کە لەلایەن J. H. Kramars ەوە لە شاری لایدن لە ١٩٦٧ دا بڵاوکراوەتەوە، چاپی دووەم، بەشی یەکەم، ل ٢٧١.

(١٠)- تەماشای کتێبی "مروج الذهب ومعادن الجوهر" بکە کە بە نێوی Les prairies

pavet de Courtille, دا لە سـالی ۱۹٦٦ دا لە بێـرووت لە لایەن d' or Berbier de Meynard چاپکراوە، بەرگی دووەم، ل ۲٤۹. بە پێی هێندێک چیرۆک؛ کورد هەمـوویان لە **"جنۆکە"** نین بەڵکو تەنیٚ **چوار یەکێکیان** لە جنۆکـە کەوتوونەتەوە. ئەمـانە گـوایە نەوەی **بەلقیـسی ژنی سلێمـانن**، کـە گـوایە دایـکی بەلقیس **"جنۆکە"** بووە. تەماشای کتێبی "کردشناسی" (کورد ناسی) نووسینی بە فارسی مراد اورنگ، ل ٦٨ بکە.

(۱۱)- تەماشای ئەو شاهنامەیە بکە کە لەلایەن رۆژهەڵاتناس Joannes Augustus Vullers ەوە لە شـاری لایدن بڵاوکـراوەتەوە، بەرگی یـەکـەم ل ۳٦، هەڵبـەستی ژمارە ۳۷ و ۳۸ بەم جۆرەی خوارەوەیە:

کنون کردزان تخمه دارد نژاد کزاباد نیاید بدل برش یاد

بودخانهاشان سراسر پلاس ندارند دردل زیزدان هراس

هەروەها تەماشای ل ٥٢ی هەر ئەو سەرچاوەیە بکە.

(۱۲)- تەماشای بیر و ڕای مینۆرسکی بکە لەم دوو سەرچاوەی خوارەوەدا:

Minorski, V.: "Les Origines des kurdes", "Travaux de XX Congres international des Orientalistes", Bruxelles 1940, pp. 143-152.

هەروەها تەمـاشـای وتاری مـینۆرسکی "الاکـراد احفـاد المیدیین"، بکە لە "گـۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری کـورد"دا، بەرگی یـەکـەم، بەغـداد ۱۹۷۳، ل ٥٥۲-٥٦۳. بۆ پشـتـگیریی قـسـەکانی مینۆرسکی؛ خـاوەنی ئەم سـەمـینارە بەڵگەی زمـانەوانی هێناوەتەوە. تەماشای ئەم سەرچاوەی خوارەوە بکە:

جەمـال نەبەز: " رەخنەی زمـانەوانی " لە گـۆڤـاری "تاسـۆی زانـکۆیی" دا، گـۆڤـاری زانکۆی سلەیمانی، ژمارە (۹) سالی دووەم، تەمووزی ۱۹۷۸ ل ۸٦ - ۹۲.

(۱۳)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Menzel, Theodor: "Yazidi", in "Handwörterbuch des Islam", Leiden 1941, S. 808

(۱٤)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Rudolph, Wolfgang und Salah (Soran), Hasan: Die Feizollabegi des Hochlandes von Bukan. Zur Chronik und Geschichte einer Kurdischen Aristokratenfamilie", in: "Baessler Archiv", Neue Folge, Bd. 15 Berlin 1967, S,285

(۱٥)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Rich, Claudius James: Narrative of a Residence in koordistan, vol I, London 1836-37, reprint westmead 1972, pp. 292-297.

(١٦)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Küchler, Hannelore: Öffentliche Meinung..

سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٢.

(١٧)- ئەم هۆنراوەیەم لە پەنجاکاندا لە دراوسێی کۆچکردووم بەهەشتی کاکە رەشید شەوقی لە سلێمانی بیست. (تەماشای سەرنجی ژێدەری ژمارە (٥) بکە).

(١٨)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Mustawfi, Hamd-Allah: Nuzhat al-qulub.The geographical part of Nuzhat al-qulub composed by Hamd-Allah Mustawfi of Qazwin in 740 (1340), translated by G. le Strange, Leyden 1919, Section 10, p. 105-107.

سەرنج: دوایی وەک بۆم دەرکەوت گەشتەوەری ئیتالیایی مارکۆ پۆلۆ Marco Polo گەلێک لەپێش مستەوفی دا باسی کوردستانی کردووە.

(١٩)- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢-١٠٥.

(٢٠)- هەر بۆ نموونە سەرنجی ئەو قسانە بدە کە سەددام حسەین لە رۆژی نەورۆز (٣/٢١)ی سالی ١٩٧٩ دا لە سلێمانی و هەولێر کردی (مجلة الحكم الذاتي، العدد ٤ السنة الرابعة ١٩٧٩ ص ٥ وص ٨).

(٢١)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Einjähriger Widerstand in Kurdistan, 15 august 1984 - 15 August 1985, herausgegeben von "kurdistan-komittee", Dokumentationsreihe, Nr. 1, Köln, Oktober 1985, S. 18.

(٢٢)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Gustav Chalupa: Nationalistische Ausschreitungen im Vielvölkerstaat Yugoslawien", im "Der Tagesspiegel", Nr. 12179, Berlin 5. 11. 1985, S.3.

سەرنج: ئەو کاتەی ئەم سەمینارە پێشکێش کرا یوگۆسلاڤیا پارچە پارچە نەبوو بوو نیستەکە سالی (٢٠٠٢)ەو ئەم چاپی دووەمە ئامادە دەکەین، یوگۆسلاڤیا لەتلەت بووە و چەند دەولەتێکی سەربەخۆی لێداکەوتووە.

(٢٣)- مەسەلەی ئەوەی لە سنووری ولاتی سۆڤیێتدا پارچەیەک کوردستان هەیە راستییەکە کە ناشاردرێتەوە، و گەلێک زانای سۆڤیێتی دانیان پێدا ناوە. بۆ نموونە:

ڕۆژهەڵاتناسی مەزنی سۆڤیێت خالفین لە پێشەکی کتێبەکەیدا "ململانێ لەسەر کوردستان" دەبێژێ: "لە سەرەتای سەتەی نۆزدەیەمدا بەشێک لە خاکی کورد کەوتە ژێر دەست رووسیاوە". مینۆرسکی کە خۆی ڕۆژهەڵاتناسێکی رووس بوو لە وتارەکەیدا لەسەر کوردستان لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامدا دەبێژێ: "کوردەکان لە پێش جەنگی جیهانیی یەکەمدا بەسەر تورکیا و ئێران و رووسیادا دابەشکرابوون...".

(٢٤)- بدلیسی، شرف الدین: شرفنامە، چاپی پەترسبورگ ساڵی ١٨٦٠، چاپی تازە ١٩٦٩، بەرگی (١) ل ١٣-١٤.

(٢٥)- هەر بۆ نموونە تەماشای ئەو نەخشەیە بکە کە میستەر ئێد مۆندس کۆنە ئەفسەری هێزی کۆلۆنیالیستی بەریتانیایی لە کوردستاندا و راوێژکەری وەزارەتی نێوخۆی عێراق هەتا کۆتاییی جەنگی جیهانیی دووەم، کێشاویەتی لە کتێبەکەیدا "کورد و ترک و عەرەب" کە بە زمانی ئینگلیزی لە لەندەن لە ساڵی ١٩٥٧ دا چاپکراوە، هەروەها ئەو نەخشەیەی کە دیپلۆمات و نانخۆری دەوڵەتی ئەمریکا میستەر ئیگلتن لە کتێبەکەیدا "کۆماری کوردی ساڵی ١٩٤٦" کە بە زمانی ئینگلیزی لە لەندەن لە ساڵی ١٩٦٣ دا چاپکراوە؛ کێشاویەتی. گەلێ "بەرهەمی" دیکەی لەم بابەتە لەم چەند ساڵەی دواییدا لە ئەورووپا دەرچوون.

(٢٦)- احمد عثمان ابوبکر: نصوص ثلاث رسائل للشیخ عبدالله النهري، مجلة "رۆژی کوردستان / شمس کردستان، العدد ٦٩، نیسان ١٩٨٥، ل٦.

(٢٧)- هیپۆتێزی کولتووری سینکرێتیستانەی کورد بیرێکی خۆمە و لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی دوور و درێژی کۆمەڵگەی کوردەوە پێیگەیشتووم کە بێگومان پێویستی بە توێژینەوەی پتر هەیە. شایانی باسە کە ئەم بیرەم بۆ یەکەم جار لەو وتارەدا باسکرد کە لە ڕۆژی ٢٣ی ئەیلولی ١٩٨٣دا لە مۆنیخ بە بۆنەی دووەمین کۆنگرەی سۆکسەوە پێشکێشم کرد. دەقی ئەو وتارە چەند سەعاتییە کە بەنێوی "ناکۆکیی نێوان ریزەکانی گەلی کورد و خاوکردنەوەی" یەوە بوو، بۆ چاپ ئامادە دەکرێ و لە هەلێکدا دەخرێتە بەر دەست خوێنەرەوە. سەرنج: هەتا ئەورۆ کە ساڵی (٢٠٠٢)ە هێشتا چاپ نەکراوە.

(٢٨)- هەر بۆ نموونە تەماشای ئەم دوو سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Soane, E. B.: To Mesopotamia and Kurdistan in disguise, London 1912. 2. Ed. 1926, p. 395. Nikitine, Basile: Les kurdes, paris 1956, p. 99.

(٢٩)- ئەم ژێدەرە لە کاتی تایپکردندا کەوتبوو، وا لێرەدا چاپدەکرێ. بۆ وێنە هۆنەرێکی زۆر بەنێوبانگی وەک خانای قوبادی (١٧٠٠-١٧٥٠) کە سوارچاکێکی زمان و ئەدەبیاتی فارسی بووە، شانازی بە زمانی کوردییەوە کردووە و گوتوویەتی:

هەرچەند مەواچان فارسی شەکرەن — کوردی جەلای من بەس شیرینترەن
مەعلوومەن جە دەور دونیای بەد ئەندیش — دلشادن هەرکەس وەزوان ویش

هەروەها مەحوی (١٨٣٠-١٩٠٤) گوتوویەتی:

کوردی زوبانی ئەسڵمە، گەر تەرکی کەم بە کول
بۆ فارسی، بەکوللی، ئەمن دەبمە بێ وەفا

ئەمە بێجگە لەوەی کە لە پەندی پێشینانی کوردیدا گەلێک نموونەی دی لەم بابەتە هەیە "شام شەکرە، وەلات شیرینترە".

هەر لەم بوارەدا شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٧-١٩٠٩) گوتوویەتی:

عەرەب ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم، ئەفزەڵن ئەمما؛ سەلاحەددین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو.

(٣٠)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:
Jemal Nebez: Sprichwörter und Redensarten aus kurdistan, Publikation der NUKSE, 1970, S. 70.

(٣١)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە بۆ نموونە:
Helmuth von Molteke: Briefe. Berlin 1841, S. 269-70.

(٣٢)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:
Volland: Aberglauben in Armenien und kurdistan in "Globus", 91 (1907).

(٣٣)- هەملتن دروستکەری شەقامی هەملتنە لە کوردستان و یەکێکە لەو بێگانانەی کە زۆر بەوێژدان و بابەتانە سەرنجی کورد و مەسەلەی کوردیان داوە. پاش دوور کەوتنەوەشی لە کوردستان و لە گەلێک دەرفەتدا هەوڵی داوە راستیی مەسەلەی کورد بخاتە ڕوو بۆ ئەورووپاییەکان و جیهان.

(٣٤)- تەماشای کتێبەکەی هەملتن بکە: Hamilton, A.M: "Road through kurdistan", London 1937, p.197

(٣٥)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:
Küchler, Hannelore: Fremdverständnis der Kurden.
(تێڕوانینی بیانیی لە کورد) چاپنەکراوە.

(٣٦)- تەماشای ئەو سەرچاوەیە بکە کە لە ژێدەری ژمارە (٢١) دا باسکراوە.

(٣٧)- تەماشای کتێبەکەی ئیگلتن بکە:
Eagleton, william Jr.: "The kurdish Republic of 1946", London 1963.

(٣٨)- کویشلەر، هەتەلوزە: سەرچاوەی هەرە پێشوو، ل ١١٢.

(٣٩)- سەرچاوەی پێشوو؛ هەر ئەوێ.

(٤٠)- لە رۆژی ١٩٨٤/٤/١٤ دا لە بەرلین سەمینارێکم سازکرد لەژێر نێوی "رەنگدانەوەی بیری کاژیک لە ئەدەبیاتی هۆزدە بۆرژوازیی کورددا". ئەم سەمینارە بەبۆنەی تێپەڕبوونی چارەکە چەرخێکەوە بەسەر دامەزراندنی کاژیکدا سازکرا.

(٤١)- جەمال نەبەز: ئۆتۆنۆمی، یان کوردستانێکی سەربەخۆ، یان بڕیاری چارەنووس لە ئازادی دا و بۆ ئازادی. وتاری سەمیناریی رۆژی ١١ی مایسی ١٩٨٥ لە ستۆکهۆلم (سوێد). بنکەی چاپەمەنیی ئازاد، ستۆکهۆلم ١٩٨٥.

(٤٢)- ئەم ژێدەرە لەم چاپە نوێیەدا خراوەتە سەری: لە راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ دا دەرکەوت کە زۆربەی ئەوانەی پێیان دەگوترن جاش؛ بەرووی رژێمی سەددامدا هەڵهاتنەوە و چوونە ریزی پێشمەرگەوە.

(٤٣)- بەعسییەکان بە وەزیرەکانی "نێوچەی ئۆتۆنۆمی" دەبێژن "ئەمین" بۆ ئەوەی وشەی "وەزیر" بەکار نەهێنن؛ نەوەک نێوچەکە لە دەوڵەتێک بچێ و تامی "فیدراسیۆنێک" بدات.

(٤٤)- مجلة الحكم الذاتي (ئۆتۆنۆمی) يصدرها المجلس التشريعي لمنطقة كردستان، العدد (٢)، السنة التاسعة، اربيل ١٩٨٥ ص ٤٧.

(٤٥)- سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥.

(٤٦)- سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٨.

(٤٧)- لە گێڕانەوەی ئەم هۆنراوانەیەی "ئەحمەدی" دا پەنام بردە بەر بیرەوەریی خۆم. ئەم هەڵبەستانەم لە دەورانی منالیدا لەبەر کردووە و لەوانەیە بەتەواوی لەرووی وشەبەندییەوە سەتی سەت وانەبن، بەڵام لەرووی ماناوە بەتەواوی وانە. ئەمەشم بۆیە باسکرد؛ چونکە لەم کاتەدا "ئەحمەدی" م لەبەر دەستدا نییە.

(٤٨)- خانمی Corinne Taor پەیامنێری رۆژنامەی فەرەنسی Liberation لە ژمارەی رۆژی ١٩٨٤/١/١٧ی دا باسی گوندێکی کوردستانی داگیرکراوی ترکیا دەکات و دەبێژێ: "خەڵکەکەی ئەوێ هەموو پێیان وایە کە حکوومەت بڕیاری داوە کە لەو کونرەوەرییەدا بیانهێڵێتەوە، خەڵکەکە دەبێژن: "ئەمە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە ئێمە کوردین. تەماشاکە ئێمە مافمان لە هیچ شتێکدا نییە. نە شەقامان هەیە، نە کارەبامان هەیە، نە زێرابمان هەیە، ئایا ئێمە هەموومان پێشمەرگەین؟ لێرە هیچ جۆرە سەربەستییەک نییە بۆ کورد". پەیامنێر ئەوجا لەبارەی هەوڵنەدانی زارۆی کوردەوە بۆ فێربوونی زمانی ترکی دەبێژێ: "دیاردەیەکی دیکەی کۆلۆنیزەکردنی (کوردستان) پەروەردە کردنە؛ کە بەکارهێنانی زمانی کوردی بەتەواوی رێبەند کردووە (ترکیا دان بە بوونی کورددا نانێ). لە گوندی کەمینە ئەو مامۆستایەی کە دانراوە بۆ فێرکردنی دەرزی کولتووری ترک، مامۆستایەکی لاوی

٢٧ ساڵییە نێوی ئەحمەدە. ئەحمەد هەر لەسەرەتاوە کارەکەی بەوە دەستپێکرد کە وێنەیەکی گەورەی ئەتاترک ؛ دامەزرێنەری کۆماری ترکیای بە هەموو دیوارەکانی قوتابخانەدا هەڵواسی، ئەو ئەتاترکەی کە خاوەنی ئەو قسەیەیە کە کوردەکان تیزی پێوە دەکەن و دەبێژێ: "چەند بەختیارە ئەو کەسەی کە دەتوانێ بەخۆی بێژێ ترکە"، بەڵام ئەحمەد پاش دووساڵ مامۆستاییکردنیش هێشتا هەر خۆی ئاڵای ناسیۆنالی ترک لەبەردەم پۆلی قوتابخانەکەدا هەڵدەکات. ئەحمەد دەبێژێ: "زارۆکان دێنە قوتابخانە چۆنکە بە زۆرەملێ دەیانهێنن؛ ئەگەنا گاڵتەیان پێیدێ. هیچ کاتێکیش خۆیان خەریک ناکەن بە فێربوونی زمانی ترکییەوە" تەماشای:

Corinne Taor: Represailles türque en pays kurde, Liberation, 17.10.1984

کۆرین تاۆر: تۆڵەسەندنەوەی ترک لە وڵاتی کورددا، رۆژنامەی لیبەراسیۆن ١٩٨٤/١٠/١٧.

(٤٩)- لێرەدا حەز دەکەم کۆپلەیەک لە قسەکانی مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی (١٨٨٠- ١٩٤٨) بهێنمەوە بە نموونە کە لە سەرەتای کتێبی "خوڵاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان"دا نووسیوێتی و ئەو هۆیە دەخاتە روو کە بۆچی دەستی کردووە بە نووسینەوەی مێژووی کورد.

ئەمین زەکی دەبێژێ:

"کاتێک وشەی گشتگری عوسمانی لە ترکیادا نەما و دوو وشەی ترک و تورانی جێیان گرتەوە. ئەوجا منیش بەپێی سروشتی بارەکە خۆی، و وەک هەموو ئەو رەگەزە عوسمانییانەی کە ترک نەبوون، هەستێکی زۆر خەستم بە نەتەوایەتیی لە ترک جیاوازی خۆم کرد. ئەمە وای لە من کرد کە هەستی ناسیۆنالیستانەی بەتین، و جۆشی بەهێزی نیشتمان پەروەرانەی خۆم دەرببرم. بەڵام (ئەوەی راستی بێ) هیچم نەدەزانی لەبارەی ئەو گەلەوە کە سەر بەوم. چۆنکە لەپێش ئەوەدا هیچ کاتێک ئەوە نەهاتبوو بە بیرمدا کە بگەڕێم بەدوای مێژووی ناسیۆنالی کورددا. نە لە سەردەمی خوێندنمدا و نە لەدوای ئەوە. ئەوەش سەبارەت بەوەبوو کە وشەی "عوسمانی" کە هەموو رەگەز و گەلێکی ژێردەستەی (ئیمپراتۆرێتی)ی دەگرتەوە، تا هەندازەیەک دەماری هەر یەکێکمانی سڕ کردبوو، ئێمەی رۆڵەی نەوەکانی دیکەی (ناترکی) نێو ئیمراتۆرێتیی عوسمانی. "خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من اقدم العصور التاريخية لحد الآن)- الترجمة العربية للاستاذ محمد علي عوني، الطبعة الثانية، بغداد ١٩٦١، الصفحة (ح): ئەم دانپێدانانەی ئەمین زەکی دەریدەخات کە **هۆکاری دەرەکی** لە پەیدا کردن و چلووره پێبەستنی **"تێڕوانینی خۆیی"** دا دەورێکی گەورە و هێندێک جاریش دەورێکی سەرەکی هەیە.

(٥٠)- سەددام یەکێکە لەو نموونانە.

رۆشنبیر و نیشتمان پەروەری ترک بەهەشتی ئێندیجە کەماڵ یەکێک بوو لە

ترکەکانی قرم و کەسایەتییەکی ناسراوی ترک بوو، لە شەستەکاندا لەشاری مۆنیخ دەژیا و بوو بووینە دۆست و هاوڕێی یەک. پاش کودەتاکەی جەمال گویرسێل لە ئەنقەرە، کریماڵ بەگ لەسەردانێکی ئەنقەرەدا چاوی بە گویرسێل کەوتبوو، و باسی مەسەلەی کوردی کردبوو لەگەڵی، وەک کریماڵ بەگ خۆی گێڕایەوە بۆم بە گویرسێلی گوتبوو: وا باشترە لاپەڕەیەکی تازە لە مەسەلەی کورددا هەڵبدرێتەوە. کریماڵ بەگ گوتی : گویرسێل هەر نێوی کوردی بیست، داچڵەکی و گوتی: "چۆن چۆن؟؟" گوتم: کارێک بکەین کە کورد رابوردوویان بیر بچێتەوە و بیانکەینە براو دۆستی خۆمان. با لە کوردستاندا کوردەکان بە زمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن و خۆیان خۆیان ببەن بەڕێوە. ئەوساکە مێژوو ئەمە بۆ جەنابت تۆمار دەکات... با وا بکەین ئەگەر رۆژێ لە رۆژان کوردەکان دەستیان رۆیشت وەک دوژمن هەڵسو کەوت نەکەن لەگەڵمان... کریماڵ بەگ گوتی قسەکەم تەواو نەکردبوو، گویرسێل چاوی پەڕییە پشتی سەری و گوتی: چی چی؟؟؟... باش بزانە تا ترکێک بژێنی، نە دان بە بوونی کورددا دەنێین و نە رێدەدەین زمانی کوردی بە رەسمی بناسری". کریماڵ بەگ گوتی: منیش گوتم: جا باشە کە ترکێک نەما، ئەوسا من و تۆ ترکایەتی بۆ کێ بکەین؟؟؟ گویرسێل بەسەربادانێکەوە گوتی: سەیرە، وامزانی تۆ ترکێکی ناسیۆنالیستی و ترکت یەکجار خۆش دەوێ... کریماڵ بەگ گوتی: منیش گوتم: باوەڕ بکە ئەمەی گوتم لە خۆشەویستیی ترک بوو، حەز دەکەم وا لە کوردەکان بکەین دەست بکەنە ملمان، نەک تف بکەنە روومان. ئەوەم گوت و بە تووڕەیی و دڵشکاوییەوە مالاواییم لێکرد".

(٥١)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Taghi Habibi Shalmani: Betrachtungen über die ethnische Identität der Iranischen Kurden, Dissertation der Universität Köln 1985, S. 112.

(٥٢)- باسی "قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم" م لەو نامیلکەیەدا کردووە کە بەنێوی "هێندێک لە کێشە بنەڕەتییەکانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم" ەوە لەلایەن چاپەمەنیی ئازادەوە لە ساڵی ١٩٨٤ دا لە ستۆکهۆڵم بلاو کراوەتەوە. هەڵوێستی ئەم قوتابخانەیەشم بەرامبەر "نەتەوە" و "ناسیۆنالیزم" لەو لێکۆڵینەوەیەدا دەرخستووە کە لەژێر نێوی "گۆڤاری نیشتمان، تەمووزی ١٩٤٣ تا مایسی ١٩٤٤، زمانی حالی کۆمەڵەی ژێکاف و ئیدیولۆژیی هوردە بۆرژوای رۆشنبیری ناسیۆنالیست لە کوردستاندا "بە کوردی و ئەڵمانی لەلایەن **"ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر"**ەوە بلاو دەکرێتەوە، تەماشای ل ٢٣-٢٧ی ئەو بەرهەمە بکە کە لەم رۆژانەدا لەلایەن بنکەی چاپەمەنیی ئازادەوە لە چاپدەدرێ. سەرنج:... ئەم بەرهەمە لەچاپدراو بلاوکرایەوە.

(٥٣)- تەماشای وتاری Necdet kurdakul بکە لە رۆژنامەی ترکی Dünya دا،

ڕۆژی ٢٨ ی ئەیلولی ١٩٦٧ لە دژی ئەو وتارەی کە لە "گۆڤاری کۆمیسیۆنی ئینتەرناسیۆنالی یاسازانان" دا لە ساڵی ١٩٦٧دا لەبارەی چەوساندنەوەی "کەمایەتیی کورد"ەوە لە ترکیا بڵاوکرابووەوە.

(٥٤)- علي اصغر شميم همداني: كردستان، تبريز ١٣١٢، ص ٥٣.

(٥٥)- سەیری پەراوێزی نمرە (٥٣) بکە.

(٥٦)- سەیری لاپەڕە (٤٦) بکە.

(٥٧)- الدكتور ناجي معروف. عروبة العلماء المنسوبين في بلاد الروم والجزيرة و شهرزور و اذربيجان الى البلدان الاعجمية. الجزء الثالث، الجمهورية العراقية - وزارة الثقافة والفنون - سلسلة كتب التراث، رقم ٦٨، بغداد ١٩٧٨، ص ٩٧-٢٠٧.

(٥٨)- جمال نبز: حول المشكلة الكردية، من منشورات الاتحاد القومي للطلبة الاكراد في اوروبا (نوكسه) ١٩٦٩، ص٥٩.

(٥٩)- ناجي علوش: حوار حول الامة والقومية والوحدة، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، الطبعة الاولى، ايلول ١٩٨٠، ص ٨٧-٨٨.

(٦٠)- ناجي علوش: سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨-٨٩.

(٦١)- سەمیناری **"بیری نەتەوەیی کوردی نە بیری (قەومییەت)ی ڕۆژهەڵاتی و نە بیری (ناسیۆنالیزم)ی ڕۆژاواییە"** لە ڕۆژی ٨/١٨ی ١٩٨٤ دا لە ستۆکهۆڵم و بەبۆنەی سێیەمین کۆنگرەی سۆکسەوە خوێندرایەوە. سەمینارەکە لەلایەن "سۆکسەوە" بڵاوکرایەوە و لە بنکەی چاپەمەنی ئازاد لە ستۆکهۆڵم چاپکرا.

(٦٢)- تەماشای ژێدەری ژمارە (٥٢) بکە.

## (٧) - چەند تێبینییەک

(١)- وشەی "پێوەندارێتی" م لەجیاتی (انتماء)ی عەرەبی کە بەرامبەر بە affiliationی ئینگلیزی و appartenanceی فەرەنسی و Zugehörigkeitی ئەلمانییە و، وشەی "ناسنامە" شم لە جیاتی (هویة)ی عەرەبی و identityی ئینگلیزی و Identitätی ئەلمانی دارشتووە، هەروەها وشەی "پێناسە"م لەجیاتی (مُعَرِفة) و (مُشَخَّصة)ی عەرەبی و Merkmalی ئەلمانی و، وشەی "باوک فەرمانی" و "دایک فەرمانی" م بۆ "نظام الابوة" و "نظام الامومة"ی عەرەبی بەکار هێناوە، هیوام وایە لەجێی خۆیاندا بن.

(٢)- سەرنجێک بدە لە ژێدەری ژمارە (٥) و ل ٧-٧٢.

لەم ژێدەرەدا ناوی بەهەشتی کاکە رەشید شەوقی هێنراوە کە بە پێویستی دەزانم چەند تێبینییەک لەسەر ئەم کەسایەتییە بنووسم، پالپێوەنەری سەرەکیشم بۆ ئەمە ئەوەیە ئەمسال (١٩٨٥) لە هەولێر نامیلکەیەک بەنێوی "مستەفا شەوقی و پەیژە "وە لەلایەن مومتاز حەیدەرییەوە بلاوکرایەوە کە سەعید ناکام پێشەکییەکی بۆ نووسیوە. مومتاز حەیدەری هەولیداوە بە هۆی گەلێک کەسی گوایە "شارەزا" وە کەسایەتیی مستەفا شەوقی دیاریبکات و هەر لەوێدا بیرو رای هێندێکیشیانی تۆمار کردووە کە هیچیان -سەعید ناکام گوتەنی- "نرخی گوێزێکی پووچی لەمەڕ ساخ کردنەوەی مستەفا شەوقییەوە نییە". هەر لەو جێیەدا سەعید ناکام هاتووە بە سەرو گوێلاکی ئەوانەدا کە بە "زانا" نێوی بردوون و کەچی ئەو گوتەنی: ئەوەیان لەباردا نییە "کەسایەتیی مستەفا شەوقییەک ساخ بکەنەوە کە -گوایا- چل سالێک دەبێ مردووە".

سەعید ناکام دەبێژێ:

لەچاپدانەوەی گۆواری (پەیژە) کە لە رۆژی خۆیدا کەلەبەرێکی گەورەی پڕ کردووەتەوە، لەگەڵ لێدوان و لێکۆلینەوەی ناوەرۆکی ئەو سیپارە بەنرخە، کارێکی هێنجگار پەسەند و بەجێیە و ئەم تەقەلایەی کاک مومتاز حەیدەری سوپاسهەلگر و شیاوی ئافەرینە.

بەلام ئەرێ سیپارەی (پەیژە) کێ نوسیوویەتی؟ کێ هەیە بە راشکاوی بێتە زمان و پێمان بلێ خاوەنی ئەم هەستە پاکە و ئەم بیرە دلسۆزانەی کوردایەتییە، کێ بووە و چۆن ژیاوە و لە کوێ سەری پڕ لە ئاواتی بەدی نەهاتووی ناوەتەوە؟

دەربڕینی رای جۆراو جۆر بۆ ساخ کردنەوەی بناخەی کێلە شێن و ئەشکەوتی شانەدەری و شوێنەوارەکانی نارام سین لە کوردستاندا جێی خۆیەتی، بەلام ئایا رەوای حەقە مێژووزان و نووسەر و کوردناسەکانمان سەبارەت بە تێکۆشەرێکی جێی شانازیمان کە چل سال لەمەو پێش کۆچی دوایی کردووە و ئەوانەی دیویانە هێشتا

زیندوون و ماون وەلامێکی دوودلانە بە دەمی داچەقاوەوە دووپات بکەنەوە؟

پیاو گریانی دێ. گریان بۆ مستەفا شەوقی تا کە ساڵی ١٩٢٦ سەرنوسەری (بانگی کوردستان) بووە و پاشان گۆواری (پەیژە)ی بلاو کردووەتەوە و بەتەما بووە پاشتر (رۆژنامەیەکی کوردی بۆ رایی بێنێت) ولە پڕێکا وەکو بەردی بن گۆم بێ سەروشوێن چووە، گریان بۆ ئەو تا چونکو بە هیچ ناچێ... گریان بۆ نەتەوەی کوردیش تا کەوا کەڵە پیاوانی پەنجا ساڵ لەمەوبەری خۆی ناناسێت و لەبیریان دەکا، چونکە شتی لەم بابەتەمان زۆرن.

گریان بو ئەو زانایانەمان کە گوایە خەوو خواردنیان لە خۆیان حەرام کردووە و شاعیری کوردی کۆن تازە دەکەنەوە و مردووی ناوداری کورد دەژیێننەوە و بچووکترین رستەی کتێبە کۆنێک ناوی کوردێکی ئەو سەردەمەی هێنابێ، لێیدەدوێن و بنکەیێکی شانازیی نوێمان بۆ لەسەر دادەمەزرێنن، کەچی کاتێ پرسیاری مستەفا شەوقییان لێدەکرێ بە منجەمنجی واق ورمانەوە دەڵێن: مستەفا شەوقی ئەفسەرێکی کوردی سوپای عوسمانی بووە و، کاتێ گەراوەتەوە کوردستان کاری میری نەکردووە و هەر خەریکی خەبات و تێکۆشان بووە و مستەفا شەوقی زابت تەجنیدی قەزای رەواندز بووە و ساڵی ٩٣٨ یان ٩٣٩ لە رەواندز مردووە، کەسیش نازانێ لە کوێ نێژراوە.

مستەفا شەوقی شاعیرێکی کوردستانی سەر بە ئێرانە و لە بنەماڵەی قازییەکانە

مستەفا شەوقی ناوی راستیی (رەشید شەوقی) یەو ئەو (ناوی) مستەفایەی بۆ خۆ شاردنەوە لە خۆی ناوە و سەردەمێک بەڕیوەبەری رۆژنامەی (دیاری کوردستان)ی ساڵح زەکی ساحێبقران بووە.

مستەفا شەوقی زابتێکی عوسمانی بوو کە هاتەوە کوردستان لە سوپای عێراقدا کرا بە زابت و گەیشتە پلەی موقەددەم، خزمی ماڵی (مەحەی دگل)ی کۆنەفرۆش بوو لە گەڕەکی سەرکارێزی سلێمانی.

شاکر فەتاح. گۆواری رۆشنبیری نوێ ژمارە ٨٣- ل: ٥١

شەمسەدین سلێمان سلاحشور. سەرچاوەی پێشوو.

د. مارف خەزنەدار، هەر ئەو سەرچاوەیە.

کەریم شارەزا. سەرچاوەی پێشوو لاپەرە -٦١-

د. عیزەدین مستەفا رەسول، هەر ئەو سەرچاوەیە لاپەرە -٥٢-

ئەم گشت زانیاری ساخ کردنەوە و ئاگادارییە چەوت و چەواشانە کە هیچی نرخی گوێزێکی لەمەڕ ساخ کردنەوەی مستەفا شەوقییەوە نییە، لەلایەن زانا و نوسەرەکانەوە دەربڕاون و بە مەبەستی رۆنکردنەوە و تیشک خستنە سەر ژیانی خەباتگێڕ و نووسەر و سیاسییێکی خوێنگەرمی کورد کە -گوایا- چل ساڵ دەبێ مردووە!".

لێرەدا خۆم بە بەرپرسیار دەزانم ئەم گرێکوێرەیە بڕەوێنمەوە:

ڕاستە... هەق وا بەلای سەعید ناکامەوە، بەڵام توانج تێگرتن و سەر کۆنەکردنی ڕووت، هیچ سووتێکی نییە. سەعید ناکام دەبوو هۆی ئەم کلۆلییەی کە ئەو بۆ ی دەگری، بێ پەردە بخستایە ڕوو. ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئەو دەمەی کە مستەفا شەوقی دەژیا و تێدەکۆشا، زمان و کولتووری کورد هێشتا نەبوو بووە دەسکەلایەک بە دەست هەلپەرست و خۆبژێن و کوڕی ڕۆژەوە بۆ نان پەیدا کردن و سنگ دەرپەڕاندن و ماستاو ساردکردنەوە بۆ ملهوڕان، وەک ئەمڕۆ. لەبەر ئەوە زۆربەی هەرەزۆری هوردە بۆرژوای ڕۆشنبیری کورد گاڵتەی بەوانە دەهات کە خزمەتی کولتووری کوردیان دەکرد. بەڵگەشم بۆ ئەمە ئەوەیە کە خۆم هەر لە تەمەنی ١٨-١٩ ساڵییەوە هەڵسو کەوتم لەگەڵ ئەو بەساڵدا چووانە دەکرد کە لە دەیەکان و بیستەکان و سییەکان و چلەکاندا خەریکی کوردایەتی بوو بوون، وەک مستەفا شەوقی و عارفە سوور و ڕەفیق حیلمی و ئەنوەر سایب و بەشیر موشیر و ماررووف جیاووک و ئەمین ڕەواندزی و عەلی کەمال و تۆفیق قەزاز و کەریم زانستی و ڕەفیق چالاک و جەمال عارف و محەممەد عەلی کوردی و شاکیر موجریم و ئسماعیل حەقی شاوەیس و عەبدول خالیق ئەسیری و جەمیلی ڕۆژبەیانی و عەلی باپیراغا و گیوی موکریانی و ئەنوەر مائی و مەلا محەممەدی قزڵجی و عەلائەددین سجادی و گەلێک بەرێزی دیکە کە ئێستە زۆربەی هەرە زۆریان نەماون. مەبەستیشم لەوە؛ تەنێ کۆ کردنەوەی کولتوور و زادەی بیری کورد بوو. کەچی زۆر کەس لە کوردە، گوایە ڕۆشنبیرەکانی ئەو دەمە، تانووتیان دەدا لێم، کە گەنجێکی وەک من لە باتی دوو ڕابواردنی شەوانی بەغدا و "چوار قسەی خۆش" هێندە "بێ زەوقم" کاتی خۆم لەگەڵ ئەو "پیرە خەرەفاوانە" دا دەبەمە سەر. ڕاستییەکەی ئەو بەرێزانە منیان وەک هاوڕێیەکی خۆیان تەماشا دەکرد و بە چاوی هەرزەکارێک نەیاندەڕوانییە من. لەبەر ئەوە بەسەرهاتە سیاسییەکانی خۆیان بێ پرنگانەوە دەگێڕایەوە بۆم، کە هەر یەکەیان لاپەڕەیەکی گرنگ بوو لە مێژووی نەتەوەی کورددا.

دە مستەفا شەوقی یەکێک بوو لەو "پیرە خەرەفاوانە"ی کە من شانازیم بە دۆستایەتییەوە دەکرد. مستەفا شەوقی بەڕێکەوت لە سلێمانی دراوسێشم بوو، و جاری وا هەبوو، لە شەوانی فێنکی هاویندا تا بەرەبەیان لە حەوشەکەی ماڵی دایکم پێکەوە دادەنیشتین و قسەماندەکرد. نێوی ڕاستەقینەی مستەفا شەوقی کاکە ڕەشید برای علی ئاگا بوو، کە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو لە سلێمانی و کابرایەکی زۆر قسە خۆش بوو. هەروەها خزمی قازی ئەحمەد موختار بوو کە هەردووکیان ماڵیان لە تەنیشت مزگەوتی دوودەرگا و نێزیک ماڵی هاوڕێی منالیم مەلا عەبدوولی مەلا سەعید و ڕۆستەمە زلەوە بوو، کە ڕەنگە ئێستە ئەو مزگەوت و خانووانە نەمابن. کاکە ڕەشید لە کۆتاییی جەنگی جیهانیی یەکەمدا لە سوپای عوسمانیدا ئەفسەر بوو، ماوەیەکیش لە هەورامان وەک ئەفسەر خزمەتی کردبوو. کاکە ڕەشید گەلێک بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە بۆم کە لە بیرەوەریەکانمدا نووسیومن. جا وەک بەهەشتی کاکە ڕەشید باسیدەکرد، ماوەیەک سەرنووسەری گۆڤاری "دیاریی کوردستان" بوو بوو، بەڵام دوایی ناخۆشی کەوتبووە نێوان وی و ساڵح زەکیی خاوەن گۆڤارەوە لەسەر ئەوەی ساڵح زەکی پێیگوتبوو "کاکە ڕەشید وتارەکانت زۆر توندو

تیژن و ئەگەر وا بکەیت ئەوا گۆڤارەکەمان دادەخەن" - لەبەر ئەوە کاکە ڕەشید هەوڵی دابوو خۆی ئیجازەی گۆڤارێک وەربگرێ، بەڵام دەستی نەکەوتبوو، لەبەر ئەوە ویستبووی کاتنامەیەک دەربکا بە نێوی "پەیژە" وە کە لە شێوەی گۆڤاردا بێ بەڵام بەنێوی گۆڤارەوە نەبێ، ئەوەشی بۆ نەچوو بووە سەر. کاکە ڕەشید پیاوێک بوو حەزی بە مەتحی خۆی و سنگ دەرپەڕاندن نەدەکرد، لەبەر ئەوە بۆ شوێنە ونی؛ خۆی نێو نابوو "مستەفا شەوقی". سەردەمێکیش لە سوپای عێراقدا ئەفسەر بوو بوو. جارێکیان بە یادی ئەو کاتەوە چیرۆکێکی خۆشی گێڕایەوە بۆم و گوتی: "تازە سوپای عێراق دامەزرابوو، داواکرا لێم وتارێک بەزمانی عەرەبی لەبەردەم سەرکردەی سوپای عێراقدا بخوێنمەوە و لەوێدا باسی ئازایەتیی لەشکری عێراق بکەم، جا لەبەر ئەوەی لە عەرەبیدا زۆر کز بووم، ناچار بووم بە کوردیی بینووسم و بیدەم بە خێرە و مەندێک بیکات بە عەرەبی بۆم، بەڵام لە نووسینەکەدا دوو وشەی زۆر سەیر سەرنجیان ڕاکێشا ئەوەش "قاعا صفصفا" بوو، ئەوجا چونکە وتارەکەش بەو دوو وشەیە کۆتاییی هاتبوو وە گوترابوو "ئەگەر بێتو بێگانە پەلاماری ئەم وڵاتە بدات، ئێمەش دەچینە سەریان و خاکیان بە تووڕەکە دەبێژین"، ئەوا دوو هەفتە لەسەر یەک هەر پراوەی ئەو دوو وشەیەم دەکرد و دەمگوت و دەمگوتەوە. ڕۆژی خوێندنەوەی وتار؛ خەڵکەکەیان ڕیز کرد و گوتیان ئەوا ئەفسەرێکی کورد وتارێک بە عەرەبی دەخوێنێتەوە، ئەو دەمە منیش دەستمکرد بە خوێندنەوەی وتارەکە و هەر خوا خوای ئەوەشم بوو بگەمە سەر ئەو دوو وشەیە، کە گەیشتمە سەریان جۆش گرتمی و خۆم پێنەگیرا و تا هێزم تێدا بوو پێمدا بە ئەرزدا و گوتم: ونجعلهم صفا قنقعا"، هەر ئەوەم گوت و هەموو خەڵکەکە دایانە هارەی پێکەنین".

کاکە ڕەشید دراوسێیەکی بەوەفا و کوردێکی نیشتمان پەروەر و مرۆڤێکی هەژار دۆست و بێفیز و دەمار بوو. لەساڵی ١٩٥٨ دا و بە پێشنیازی کاکە ڕەشید و پێکەوە لەگەڵ مامۆستایان فایەق عارف و دوکتور عەلی تۆفیق هەوڵی دامەزراندنی سندووقێکمان دا بۆ یارمەتیی ئەوانەی لەسەر سیاسەت نانبڕاو دەکران و دەگیران، یان لە سەر کارلادەبران و، بەتەما بووین سندووقەکە نێو بنێین "سندووقی رووتە" یان "کۆجیلەی هەژار". بەڵام کودەتای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بوو بە هۆی نەهاتنە دی پرۆژەکەمان.

کاکە ڕەشید گەلێ هۆنراوەی کۆنی لەبەر بوو کە لە هیچ جێیەک بڵاو نەکراونەتەوە. زۆربەی زۆری ئەوانەم لەلای خۆم نووسیبووەوە و لە کوردستان بە جێمهێشتبوون، دەربەدەریی خۆم و کارەساتەکانی ٦٣ بوون بەهۆی لەنێو چوونیان. لەگەڵ ئەوەشدا لە ١٩٧٩/١٢/٢٧دا لە بەرلین وتارێکم نووسی لەژێر نێوی "شاکیر موجریم و گەنجینەیەکی ون بوو"؛ هەوڵم دا هێندێک لەو هۆنراوانەی لە شاکیر موجریم و کاکە ڕەشید بیستبووم و لەبیرم مابوون بخەمە سەر کاغەز -وا ڕێککەوت لەو ڕۆژانەدا دوکتور عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ لە بەرلین بوو، گوتی وتارەکەم بدەرێ دەیبەم بۆ وڵات لەوێ بۆت بڵاو دەکەمەوە، بەڵام کە پاش دوو ساڵ چاوەڕوانی، وتارەکە بڵاو نەکرایەوە و دوکتور عیزەددین مستەفا ڕەسووڵم چاوپێکەوتەوە و لە وتارەکەم پرسییەوە، ڕەنگێکی هێنا و برد و گوتی: "ون بووە"... نامەوێ درۆ بکەم؛ نەمتوانی باوەڕ بە قسەکەی بکەم، دوایی دەرکەوت بۆم دابووی بە ڕۆژنامەیەک کە

بەعسییەکان لە بەغدا دەریاندەکرد و کوردێکی سەر بەو دەزگەیەی بەعس دزیبووی وبەنێوی خۆیەوە بلاوی کردبووە، ئەمسالٚ جارێکی دی هەمان وتارم نووسییەوە و ناردم بۆ گۆڤاری "خوێندکاری کورد"، کە زمانی حالی سۆکسە بوو، کوردۆ عەلی دەریدەکرد، بەلاٚم کوردۆ عەلی دیشکەمی لە سۆکسە کرد وئێدی گۆڤارەکەی دەرنەکرد.

بەکورتی: "مستەفا شەوقی" کاکە رەشیدی برای عەلی ئاگا یە و نە زابت تەجنید بووە لە رەواندز و نە خزمی حەمەی دگلیش بووە وەک دکتور عیزەددین نابەرپرسیارانە فەرموویەتی. کاکە رەشید حیزب حیزبێنەی نەدەکرد تا هاورێ حیزبییەکانی بتێک دروستبکەن لێی. پاش کودەتای قاسم لە ١٩٥٨ دا و تیژبوونی ململانێی پارتی دیمۆکراتی کوردستان و حیزبی کۆمۆنیستی عیراق لە کوردستاندا؛ دەیگوت: "نەبەز... ئەم حیزب حیزبێنەیەی ئەمرۆ هەر شەرە گەرەکەکەی دوێنێیە". هەزاران چرا لەسەر گۆڕی پیرۆزی...

سەرنج: وشەی "کاتنامە" م لەجیاتی (مجلة دورية) Periodical دارشتووە.

جەمال نەبەز

# دۆزی ناسیۆنالی کورد

## ئۆتۆنۆمی یان کوردستانێکی سەربەخۆ یان
## بڕیاری چارەنووس لە ئازادیدا و بۆ ئازادی

وتارێکی سەمینارییە لە ڕۆژی شەممەی ١١/٥/١٩٨٥ دا لە ستۆکهۆلم ل
کۆبوونەوەیەکی کوردە ئاوارەکانی دانیشتووی سویددا خوێندرایەوە.

# چەند وشەیەک بۆ چاپی دووەمی دۆزی ناسیۆنالی کورد

لەم رۆژانەدا کە ١٧ ساڵ تێدەپەڕێ بەسەر پێشکێشکردنی ئەم سەمینارە و چاپ و بڵاوکردنەوەیدا، خوێنەرەوەی بەڕێز دەبینێ کە هێشتا کێشەی ناسیۆنالی کورد لەبارەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆوە لەنێو حیزب و کۆمەڵە سیاسییەکانی کوردستاندا جێگیر نەبووە. بێگومان ئەو کارەسات و رووداوانەی کە لە نیوەڕاستی هەشتاکانەوە (کاتی پێشکێشکردنی سەمینار) هەتا ئەورۆ روویان دا؛ بەتایبەتی جەنگی دووەمی کەنداو (عێراق-کوێت) وشکانی لەشکری سەددام و راپەڕینی مەزنی بەهاری ١٩٩١؛ بوونە هۆی دامەزراندنی "هەرێمی نەفڕین" و رێکرانەوە بۆ کوردی سێ پارێزگەکە پەرلەمانێک بە هەڵبژاردنێک پێکبهێنن و حکوومەتێکی کوردستانی رێکبخەن، هەڵبژاردن بەگشتی بەشێوەیەکی دیمۆکراسیانە چوو بەڕێوە و دوو حیزبە گەورەکە بوونە حیزبی حکوومەت و پەرلەمانی کوردستانیش لە ١٩٩٢ دا بڕیارێکی دا کە پێوەندیی کورد لەمەولا بە حکوومەتی نێوەندییەوە دەبێ بە شێوەیەکی فیدەرالیانە بێ. بەڵام سەیر ئەوەیە کە ئەم دوو حیزبە نەک هەر دەستوورێکی فیدەراڵییان لە رێی پەرلەمانەوە دەرنەکرد و هێزە چەکدارەکانیان لە لەشکرێکی یەکگرتوودا کۆ نەکردەوە؛ بەڵکو چەند ساڵێکیش بە چەک چوون بە گژ یەکدا و ژمارەیەکی زۆریان لە یەک کوشت و لەم ماوەیەدا گرێدایی ئەم دوو حیزبە بە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە بەپێی بارو دۆخەکە توندتر بوو. بێجگە لەوەش هەر دوو حیزبەکە زۆرو کەم هەوڵیان دا پشتی حیزبی دیکە بگرن دژی ئەوەی بەرامبەریان. لەم مەیدانەدا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان زیانی لێکەوت؛ کاتێک پشتی حیزبی سۆسیالیست و پێ کێ کێ ی گرت دژی پارتی و لەو پێناوەدا تووشی شەڕ بوو لەگەڵ

لەشکری ترک و . . ٧٠ پێشمەرگەیەکی یەکێتی کوژران و بێجگە لەوەش ناچار بوو "تنازلات"ێکی یەکجار زۆر بکا بۆ ئەو ترکمانانەی کە بەنێوی "بەرەی ترکمانی"یەوە لە باشووری کوردستاندا کاردەکەن و دان بە بوونی کوردستاندا نانێن.

شایانی باسە ئەز لە سالی ١٩٩٣ ەوە لەگەڵ هەردوو حیزبەکە؛ پارتی و یەکێتی و هەموو حیزبەکانی دیکە خەریکم کە شەڕ و هەرا و بەگژ یەکدا چوون بوەستێنن و یەکبگرن و پەرلەمان و حکوومەتی یەکگرتووی کوردستان زیندوو بکەنەوە. پەیمانی واشنتن کە لە پایزی ١٩٩٨ دا بە نێوبژینی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، لە لایەن بەرێزان مام جەلال تالەبانی و مەسعود بارزانییەوە ئیمزا کرا، سەرکەوتنێک بوو بۆ ئاشتی، لەگەڵ ئەوەشدا هەتا ئێستە ئەو ئاشتینامەیە بە تەواوی نەخراوەتە کار.

شان بە شانی ئەمە باسی فێدەراسیۆنیش کز بووە و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش دژی فێدەراسیۆنن. ئەمە لەپاڵ ئەوەدا کە هەردوو حیزبەکە هەردەم بەبۆنە و بێ بۆنە باسی ئەوە دەکەن کە دەوڵەتیان ناوێ، وەک ئەوەی پێیان گوترابێ دەبێ دەوڵەتتان بوێ.

ئەوەی لێرەدا ئاشکرایە کە ئەگەر ئەمریکا لە عێراق بدا و چەند "جەنەراڵێک" بتوانن لە بەغدا دەست بگرن بەسەر شارەکەدا و هێزی چەکداری کورد هیچ دەورێکی نەبێ و لەوەوپێش ئەم مەسەلەیە لەگەڵ ئەمریکا باش باس و تاوتۆ نەکرابێ، ئەوا کورد هەتا هەتا دەیدۆڕێنێ. تەنانەت ئەگەر کورد بتوانن کەرکووکیش بگرن هیچ سوودێکی نییە، مەسەلەکە مەسەلەی دەستگرتنە بەسەر دەسەڵاتی نێوەندیدا. ئەمەش بە پیلانێکی سەربازی دەبێ کە هێزەکانی پێشمەرگەی هەموو لایەک پاش رێککەوتن لەگەڵ کاربەدەستانی سوپایی ئەمریکا ئەو دەورە ببینن. خۆ ئەگەر کەسانێک بێن وەک نەجیب سالحی و نزار خەزرەجی و وەفیق سامەرایی و خۆیان ئامادە کردبێ بۆ ئەوەی جارێکی دی بێنەوە سەر خوانی ئامادە کراو، دەبێ رێ بگیرێ لێیان.

ئەوەی باسکردنی بە پێویست دەزانم ئەوەیە، هەر لە نیوەڕاستی هەشتاکانەوە هێزێکی ناحیزبی بە سەرۆکایەتیی هاوبیری هێژا جەوادی مەلا بەنێوی "کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان"ەوە کەتووەتە کار. کۆنگرە هەوڵ دەدا بۆ سەربەخۆییی کوردستان لەڕێی دیپلۆماسیێتییەوە.

ئەوەی پێوەندیی بەم چاپە نوێیەوە هەیە ئەوەیە دوو بەندی تازەم خستووەتە سەر کە لە دەقی چاپی یەکەمدا نەبوون. ئەمەش لە لاپەڕە ــــ ەوە تا ــــ درێژە دەکێشێ.

سەرنج: وەک خوێنەرەوە دەبینێ پێشگۆتنەکەی "سۆکسە"م وەک خۆی هێشتووەتەوە بێ دەستکاری.. چۆنکە سۆکسە ئەو سەردەمە سۆکسەی ڕاستەقینە بوو، دەسکەلای دەستی هیچ حیزبێک نە بوو و، هێشتا لە ڕێی ڕاستی بیری نەتەوەییی کوردی لای نەدابوو.

بەرلین ١٦/٣/٢٠٠٢ جەمال نەبەز

# وشەی سۆکسە

میوانە بەڕێزەکان، هاوبیرە خۆشەویستەکان، خوشک و برا ئازیزەکان

بەنێوی ڕێکخراوی خوێندکارانی سۆسیالیستی کورد لە ئەورووپا (سۆکسە) لقی سوێد، سڵاوی ئازادی و یەکسانیتان ئاڕاستە دەکەین و هەمو لایەکتان بەخێربێن.

بە پێویستمان زانی ئەم سەمینارە بگرین بەتایبەتی لەم ڕۆژەدا لە مێژووی گەلەکەمان، کە ئەوەتا وەک دەبینین ڕۆژ بە ڕۆژ جەماوەری گەلەکەمان بەوپەڕی دڵخۆشی و شانازییەوە دەچێ بە دەنگی داواکەرانی کوردستانێکی ئازاد و گەلێکی یەکسانەوە. لەوەتەی بیری نەتەوەیی کوردی سەر بە قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم، بە شێوەیەکی ڕێکخراو لە کوردستاندا هاتووەتە کایە بەر لە چارەکە چەرخێک لەمەوبەر، ئەوەش لەنێو چوارچێوەی کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوە و یەکێتیی کورد (کاژیک)دا، قەد ڕۆژێ لە ڕۆژان جەماوەری کورد وەک ئەمڕۆ دەوری نەداوە و باوەشی نەکردووەتەوە بۆی، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتی تۆقاندن و کوشتن و بڕینەی کە داگیرکەرەکانی کوردستان لە دژی هەڵگرانی بیری نەتەوەیی بەکاریان هێناوە بەنیازی لەنێو بردنی بیری نەتەوەیی و هاوبیرانمان، دەمێک بە نێوی برایەتی و دەمێک بەنێوی چینایەتی و دەمێک بەنێوی ئاینەوە. بەڵام چۆن هەرچی تاریکایی جیهان هەیە ئەگەر کۆبێتەوە؛ ناتوانێ ڕۆشنایی مۆمێک بشارێتەوە، ئاواش بیری نەتەوەیی کورد کە لەسەر بنەمای بیری ئازادی و یەکسانی مرۆڤ دامەزراوە، ڕەسەنی و پتەوی و فیداکارێتیی سەد هەزاران شەهید و هەڵگرانی بیر و قەڵەمی دڵسۆز زیندوو ماوەتەوە تا ئەمڕۆ. ڕۆڵەی کوردی بە شەرەف لە هەموو پارچەیەکی کوردستانی بریندارردا کەوتوونەتە جمو جۆڵ و بەرەنگاریکردنی پیلانەکانی ڕژێمە داگیرکەرەکان و هەموو بیرێکی بێگانە بە کۆمەڵگەی کورد و دژ بە یەکگرتنی نەتەوەی کوردمان و هەوڵدانی هەموو لایەکی دڵسۆز بۆ ڕزگارکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان لەم گێژاوەیەی کە دوژمنی داگیرکەر بۆی ڕێکخستوین.

ئێمە نەتەوەیەکین هیچمان کەمتر نییە لەو نەتەوانەی دەور و بەرمان لەبارەی بوونی مەرجەکانی نەتەوەوە، ئیدی بۆچی بگەڕێین بە دوای ئۆتۆنۆمی دا و خۆمان لەو نەتەوانەی دی بەکەمتر بزانین و بکەوینە دووبەرەکێی یەکدی و برایەتی کردنی رژێمە داگیرکەرەکان؟ بۆ کوردستان نەبێتە کوردستانێکی ئازادی وا کە بتوانێ دۆستایەتی و برایەتیی هەمو گەلەکانی دەوروبەری خۆی و جیهان بکات.

بۆ ئەم مەبەستە هیوا دارین هەمو لایەکمان سوود ببینین لە وتاری سیمیناری مامۆستا و برامان کاک جەمال نەبەز. بفەرموون.

زۆر سوپاس

## ١- سلاو و کردنەوەی سەمینار

بەشدارانی بەڕێزی سەمینار:

سلاوێکی برایانەی شیرینتان لێ بێ، و زۆر سوپاستان دەکەم بۆ هەلگرتنی ئەرکی بەشداریی ئەم سەمینارەی ئەمڕۆ، بەڕاستی ئەوەی زۆرتر پالی بە منەوە نا کە لە ماوەی نۆ مانگدا بۆ جاری دووەم لە ئەلمانیاوە بێمە سوێد و بە خزمەتتان بگەم، ئەو هەستە بەرزە بوو کە سالی رابوردوو؛ لە کوردە ئاوارەکانی دانیشتووی سوێدم دی، کاتێک کە سەمیناری "بیری نەتەوەییی کوردی، نە بیری "قەومیەت"ی رۆژهەلاتی و نە بیری ناسیۆنالیزمی رۆژاواییە"م پێشکێش کرد. ئامادە بوونی ئەمجارەشتان بە ژمارەیەکی گەلێک پتر لە جاری پێشوو، نیشانەیەکە بۆ ئارەزوو و خواستی گەرانتان بەدوای لێکۆلینەوە و چارەسەری گیروگرفتەکانی کۆمەلگەی کورددا.

بەشدارانی بەڕێزی سەمینار:

ئەو جۆش و خرۆشەی کە لە کۆمەلانی کوردی دەبینم، چ لە کوردستان و چ لە دەرەوەی کوردستان؛ بۆ پەیداکردن و خوێندنەوەی نووسینەکانی من؛ کە بەداخەوە لەبەر بێهێزیی دەسەلاتی ماددی، لەبارەی تەکنیک و هونەری چاپەمەنییەوە زۆر پێشکەوتووش نین، بەلام لەگەل ئەوەشدا لە ماوەیەکی یەکجار کورتدا لە بازێڕدا نامێنن و ئەم دەست و ئەو دەست دەکەن؛ ئەمە وام لێدەکا کە سەرەڕای هەموو پڕکاری و تەگەرە و بەرهەلستێکی بەردەمم، تاپێمبکرێ لەسەر تێکۆشانی رۆشنبیرانەی بابەتانەی زانستانەی خۆم بڕۆم کە یەکێک لە بەرهەمەکانی ئەوە ئەم جۆرە سەمینارانەیە کە لە ئەورووپا، چ بۆ کورد و چ بۆ رۆژهەلاتی و چ بۆ ئەورووپایی پێکیدەهێنم. هەر لێرەدا زۆر بە پێویستی دەزانم سوپاسێکی گەرم پێشکێش بە رێکخراوی خوێندکارانی سۆسیالیستی کورد لە ئەورووپا (سۆکسە SOKSE) بکەم کە ئەم سەمینارەی رێکخست و بەمە دەرفەتی رۆنکردنەوەی مەسەلەیەک لە مەسەلانەی رەخساند کە پێوەندییان بە پاشەڕۆژی کورد و کوردستانەوە هەیە. هەر لەم هەلەشدا

دەمەوێ سوپاسێکی یەکجار گەرمی بنکەی چاپەمەنیی ئازاد بکەم کە بە خەباتێکی بێوچان و لێبڕانێکی زۆر، بەرهەمی ئەم سەمینارانە و گەلێک بەرهەمی دیکەی رۆشنبیری دەخاتە بەردەم خوێنەرەوە، هیوام وایە لەم فەرمانە پیرۆزەدا سەرکەوتوو بێ.

بەشدارانی بەڕێزی سەمینار:

سەمیناری ئەمڕۆمان لە "دۆزی ناسیۆنالی کورد" دەدوێ و پێوەندیی بەو پێشنیازانەوە هەیە کە لەلایەن کورد و ناکوردەوە خراون و دەخرێنە بەردەم چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە. جا بەپێی سروشتی باسەکە خۆی، ناچارم لە هەڵوێستی ئەو کۆمەڵ و ڕێبازە سیاسییانە بدوێم کە بەرەنگاری ئەم مەسەلەیە بوون و دەبن و هەوڵی چارەسەرکردنیان داوە و دەیدەن. لەبەر ئەوە وتارەکەم بابەتانە؛ واتە رەخنەگرانە دەبێ. ئەوانەی لەم سەمینارەدا دانیشتوون دەبێ بزانن کە مەبەستم لە باسکردنی هەڵوێستی رابوردوو، یان ئەمڕۆی هێندێک رێبازی سیاسی بەرامبەر دۆزی ناسیۆنالی کورد؛ تەنێ بۆ خزمەتی زانست و گەیشتنە راستییە، نەک پاشقول گرتن لەم و لەو. بەتەواویش دڵنیام لەوەی لە هەرجێیەک دڵڕاگرتنی نابابەتانە و پێدا هەڵدانی ناشایستانە هەبوو، ئەوا زانست لەو جێیە بار دەکات و مەسەلەکەش دەبێتە قوربانی ماستاوکردن و دووڕوویی و هیواشم وایە هەموو لایەکمان لەوە بەدووربین. جارێکی دی سوپاستان دەکەم.

## ٢- چوونە نێوباس

رێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان؛ هەروەها گەلێک لە رۆناکبیرانی کورد و تەنانەت ناکوردیش، لەم دە ساڵەی دوایییەدا، واتە: لەپاش هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوولەوە لە ٢٦ ی مارتی ١٩٧٥ دا، کەوتوونەتە وتووێژ و دەمەتەقێ لە بارەی دیاریکردنی ئەو پەڕی ئامانجی داخوازییەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی ئەمڕۆی کوردەوە. ئەم پارت و کۆمەڵە سیاسییانە، هەروەها ئەم رۆشنبیرانە، هێشتا لەنێو خۆیاندا لەسەر مەسەلەی باسکراو نەگەیشتوونەتە

یەک بڕیار. هێندێکیان دەبێژن: کورد دەبێ لە داخوازییەکانی شۆڕشی ئەیلوول لانەدات و هەر وەکوو جاران داوای "ئۆتۆنۆمی" بکات لە سنووری ئەو دەوڵەتانەدا کە کوردستان بەستراوە پێیانەوە؛ بەڵام ئەو ئۆتۆنۆمییە کە ئەمجارە داوا دەکرێ، دەبێ "ئۆتۆنۆمییەکی راستەقینە" بێ. هێندێکیشیان دەڵێن: بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە "ئۆتۆنۆمی" بەکاری کورد نایەت، لەبەر ئەوە دەبێ کورد یەکسەر بۆ "کوردستانێکی سەربەخۆ" هەوڵ بدات. هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزمیش کە بیرەکەیان بۆ یەکەمین جار لەکۆتایی پەنجاکاندا لە "کۆمەڵەی کاژیک" و دوای ئەوەش لە نێوەڕاستی هەفتاکاندا لە چارچێوەی "پارتی سۆسیالیستی کورد" (پاسۆک)دا خۆی ڕێکخست، هەر وەک جاران؛ داوای مافی بڕیاری چارەنووس دەکەن بۆ نەتەوەی کورد، و دەڵێن ئەو بڕیارە کە لەلایەن نەتەوەی کوردەوە دەدرێ، دەبێ "لە ئازادیدا و بۆ ئازادی" بدرێ. وا ئێمە لێرەدا دەمەتەقێیەک لەگەڵ ئەم بیروڕایانە دەکەین.

## ٣- سەرنجێکی مێژوویی/کوردستان و بیری سەربەخۆیی

هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی ناسیۆنالی سەربەخۆ، وەنەبێ داخوازییەکی تازەی هێندێک لە ڕۆناکبیرانی ئەم سەردەمەی کورد، یان هێندێک لە ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئەمڕۆی کورد بێ. بەڵکو ئاواتێکی یەکجار کۆنە. وەک لە وتاری "بیری نەتەوەییی کوردی"دا باسمکرد کە لە ساڵی پێشوودا هەر لێرە لە ستۆکهۆڵم دام (١)، بەڵگەی مێژوویی هەیە بۆ ئەوەی کە بیری دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنال لە کوردستاندا بەلایەنی کەمەوە لە سەتەی شانزەیەمدا بووبێ. لەو وتارەدا ڕۆنم کردەوە کە بوونی ئەم بیرە لەنێو کورددا؛ بووە بەهۆی ئەوەی کە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بکەونە خۆیان و بەپێی پایەی تێگەیشتنی کۆمەڵانی خەڵکی ئەو سەردەمە؛ بە دەستاوێژ (وسائل)ی ئایینییەوە بەربەرەکانێی ئەم بیری "جیابوونەوە خوازی"یە بکەن. یەکێک لەم دەستاوێژانە ئەو دۆگما ئایینییە بووە کەمفتی ترک خواجە سەعدەددین (١٥٣٧-١٥٩٩) لە کتێبەکەیدا "تاج التواریخ" دەیگێڕێتەوە و

دەبێژێ "پێغەمبەری ئیسلام دۆعای لە کورد کردووە کە هیچ کاتێک یەکنەگرن، چۆنکە یەکبوونی کورد دەبێتە هۆی تێکدانی هەموو جیهان (٢) و هەر لەبەر ئەوەشە کە کورد لەوساکەوە و تا ئێستاش نەیانتوانیوە دەوڵەتی مەزن و فەرمانڕەوایی گەورە دابمەزرێنن" (٣). بێجگە لەوەش گوتم بیرکەرەوەی گەورەی کورد ئەحمەدی خانی (١٦٥١/١٦٥٠ - ١٧٠٦) لە سەتەی هەڤدەیەمدا، بەکردەوە، خەڵکی هانداوە بۆ تێکۆشان لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا و داوای لە کورد کردووە کە ناکۆکی و دووبەرەکی نێو خۆیی بخەنە ئەولاوە و لەژێر سایەی شایەکی کوردا یەکبگرن و خۆیان لە ژێردەستەیەتیی ترک و عەجەم رزگار بکەن و دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ یان دروست بکەن. سەردارانی کوردی وەک جونبولات پاشا و میرەکانی موکریان و ئەردەلان و بابان و سۆران و بادینان لە سەتەکانی ١٧ و ١٨ و ١٩ دا بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی و قاجار بەرگرییان لە خۆیان کردووە؛ بۆ ئەوەی ولاتەکەیان "نیوە سەربەخۆ" بمێنێتەوە و بەجارێ نەکەوێتە ژێر چنگی عوسمانی و سەفەوی و قاجارەوە. بەدرخان پاشا (١٨٠٢-١٨٦٧)ی میری بۆتان لە نیوەی یەکەمی سەتەی رابوردوودا لەشکری گەورەی دروستکردووە و دراوی بەنێوی خۆیەوە لێداوە و بانگی یەکێتیی هەموو کوردستانی داوە. شێخ عوبێدوڵڵای نێری لە ساڵی ١٨٨٠/١٨٨١ دا لەرێگەی رێکخستنی هێزێکی سوپاییەوە ویستویەتی کوردستان بکات بەیەک. شاعیران و رۆناکبیرانی سەتەی نۆزدە، وەک حاجی قادری کۆیی (١٨١٥-١٨٩٢) و شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٧-١٩٠٩) و کوردی (١٨١٢-١٨٥١؟) و.. هتد. بە هۆنراوەکانیان، کەمو زۆر، خزمەتی بیری سەربەخۆیی کوردستانیان کردووە. لەکۆتاییی سەتەی نۆزدە و سەرەتای سەتەی بیستەمدا هەتا هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم، شۆرشگێرانی کوردی وەک مەلا سەلیمی خێزانی و عەبدولسەلامی بارزانی بیری سەربەخۆیی کوردستانیان لە مێشکدا بووە. کۆمەڵە کوردییەکانی ئەو سەردەمە، وەک "عەزمی قەومی" و "هێڤی" و "تەعالی و تەرەقیی کوردستان" و "تەشکیلاتی ئیجتماعیە" و کۆمەڵەی "میللەتی کورد" و.. هتد لەرێی رێکخستنی سیاسییەوە و بەپشتگیریی

نوێنەرانی سەرکردەیەتیی کلاسیکی کورد، بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ تێکۆشاون و بۆ ئەمەش هەوڵی دۆزینەوەی هاوکار و هاوپەیمانیان داوە. لەپێشدا لەڕێی وتووێژەوە لەگەڵ قەیسەرەکانی رووسیا، ئەوجا پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر (١٩١٧) و شکانی دوڵەتی عوسمانییش لە ١٩١٨ دا، لەگەڵ هێزی سەرکەوتووی سوێندخۆران رێککەوتوون و توانیویانە لە ١٩٢٠ دا مافی کورد لە پەیمانی سێڤردا بەسەر سوێندخۆراندا بسەپێنن؛ ئەو پەیمانەی لە ماددەی ٦٢-٦٤ دا رێی بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ خۆشکردووە.
دوای بەستنی پەیمانی لۆزان لە ١٩٢٣ دا و پاشگەزبوونەوەی سوێندخۆران لە بەڵێنی خۆیان و دابەشکردنی کوردستان بەزۆر بە سەر پێنج دەوڵەتدا، ناسیۆنالیستەکانی کورد بە راپەڕینی چەکدارانەی خۆیان؛ ئەوەیان دەربڕیوە کە کوردستانێکی سەربەخۆیان دەوێ و هەر لەو پێناوەدا و لە سنووری سیاسیی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا شۆڕشی خوێنینیان هەڵگیرساندووە و قوربانییەکی یەکجار زۆریان داوە. ئەو شۆڕشانەی لە بیستەکان و سییەکاندا بە سەرۆکایەتیی شێخ سەعیدی پالۆ و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و شێخ مەحموودی پەرزنجی و قەدەم خێر و سەردار رەشید و سمایل خانی سمکۆ و ئیحسان نووری و سەیید رەزا و قۆچگیری و بارزانییەکان روویان داوە و تەنانەت ئەو بزووتنەوانەی لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا سەریان هەڵداوە؛ هەموو بۆ سەربەخۆییی کوردستان بوون. ئەم بیری سەربەخۆییەی کوردستان برپڕەی پشتی بیر و ستراتیژیی سەرکردەیەتیی کلاسیکی کورد بوو. گەورەترین سەرکردەی کلاسیکی کورد لە ماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا؛ بەهەشتی قازی محەممەد (١٨٩٣-١٩٤٧/٣/٣١) بوو کە بۆ سەربەخۆییی کوردستان تێدەکۆشا. ئەوانەی باوەڕ بەم قسەیە ناکەن، فەرموو با بچن دوا وتاری بەهەشتی قازی محەممەد بخوێننەوە؛ تا تێبگەن کە قازی محەممەد هەر مەهاباد و بۆکان و سنە و کرماشانی بە کوردستان نەدەزانی، بەڵکو سەربەخۆییی و یەکگرتنی هەموو کوردستانی لە خەیاڵدا بوو. کە مەڵبەندی کاری قازی محەممەد لەلایەن سوپای فارسەوە لە ١٩٤٦/١٢/٢٧ دا گیرا، کاربەدەستانی فارس نەخشەیەکیان لە ژوورەکەی دەرهێنا کە قازی هەڵیواسیی بوو بە ژوور

سەری خۆیدا، ئەو نەخشەیە نەخشەی هەموو کوردستان بوو. ئەم هەواڵە یەکێک لە سەرکردەکانی سوپای ئێران کە نێوی نەجەفقولی پسیان بووە و خۆی لە پەلاماردانی مەهاباددا بەشدار بووە، دەیگێڕێتەوە و نەخشەکەش پێشان دەدات (٤). بەڵێ کۆماری کوردستان لای قازی محەممەد و کوردی ئەو سەردەمە "کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی" نەبووە. ئەم درۆشمەی کە ئەوەتە بە دەستمەوەیە بە ئاشکرا دەری دەخات کە نێوی رەسمی "کۆماری کوردستان" "دەوڵەتی جمهوری کوردستان" بووە (٥) نەک "کۆماری مەهاباد". شایانی باسە کە سەرکردەیەتیی کلاسیکی کورد لە هەڵگرتنی ئەم ستراتیژەدا بەتەنێ نەبوو، بەڵکو هوردە بۆرژوای رۆشنبیری کوردیش، بە ناسیۆنالیست و مارکسیستییەوە؛ تا کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم پشتگیریی سەرکردەیەتیی دەستەی کلاسیکی کوردی دەکرد بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی کوردستان. گۆڤاری "نیشتمان" کە زمانی حالی "کۆمەڵەی ژ.ک (ژێکاف)" بوو، ئەو کۆمەڵەیەی کە لە ساڵی ١٩٤٢ دا لەلایەن هوردە بۆرژوای رۆشنبیری ناسیۆنالیستی کوردەوە دامەزرابوو؛ لەبارەی ئامانجی "ژێکاف"ەوە دەبێژێ: (٦)

"کۆمەڵەی ژ.ک بە پێچەوانەی هەمو بەرهەڵست و قۆرت و چەلەمەییکی وەکو دوژمنایەتیی خۆ بە خۆ، دووبەرەکی و خۆ خۆری، پولپەرستی و بێگانە دۆستی کە لە رێگای پێشکەوتن وە سەرکەوتنی کوردا هەیە؛ بەهەمو هێز و توانای خۆی تێئەکۆشێت تا زنجیر و کەلەمەی دیلی و ژێردەستی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد داماڵێ و لەم کوردستانە لەتو کوتەی ئێستا کوردستانێکی گەورە و رێکوپێک بێنێتە بەرهەم کە هەموو کوردێک بە سەربەستی تیا بژیت."

"سەربەخۆیی کوردستان" بەشێک بوو لە پرۆگرامی حیزبی کۆمۆنیستی کوردستانی عێراق" کە بە "حیزبی شۆرش" نێوی رۆیبوو، هەروەها بوو بە ئامانجی ئەو "بەرە" (جبهة) یەی کە لەم حیزبەوە هەڵقولی بە نێوی "حیزبی کۆمۆنیستی عێراق" / کۆمەلی "وحدة النضال" (= یەکێتیی تێکۆشین) یش

کە لە ساڵی ١٩٤٤ دا دامەزرا. ئەویش هەر "سەربەخۆیی کوردستان"ی کردبوو بە ستراتیژی دووری خۆی. گۆڤاری "یەکێتیی تێکۆشین" کە زمانی حاڵی ئەم "لقی کورد" ە بوو؛ لە ژمارە (٣)ی ساڵی (١) دا، واتە لە بەهاری ساڵی ١٩٤٥ دا دەبێژێ: ئەوانەی مسئەلەی کورد تأیید بکەن جهودمان لەگەڵ یان توحید ئەکەین وە ئەمانەی ضدی مسئەلەی کورد بن بە چاونکی دوژمنانە تەماشیان ئەکەین - چی لە کورد وە چی لە غیریِ کورد - و ضد یان هەول ئەدەین»... "ایمە هەر ایشیکمان کردبیت وە هەر ایشیک بکەین پیشی هەمو شتێک تەماشای مصلحەتی نیشتمانی کوردستانو مللەتی کوردمان کردوە وە ئەکەین لەژێر روناکی ضروفی واقعی کورد و عالمی، چۆنکە ایمە پیش هەمو شتیک نیشتمان پەروەری کوردین، و حزبی سەربەخۆیی وآزادی نیشتمانی کوردستانین... ایتر بابو بەرزی وولاتی کورد و شاری مللەتی کورد و شاری مللەتی کورد بکەوینە تی کوشین! «لجنەی مرکزی لقی کورد»

بەکورتی؛ هەموو ئەو کۆمەڵە کوردییانەی کە هوردە بۆرژوای رۆشنبیری کورد دایمەزراندوون، هەر لە جەنگی جیهانیی یەکەمەوە تا کۆتاییی جەنگی جیهانیی دووەم، وەک حیزبی "سەربەخۆییی کوردستان" و حیزبی "خۆیبوون" و کۆمەڵەی "زەردەشت" و کۆمەڵەی "برایی" و کۆمەڵەی "یەکێتی" و کۆمەڵەی "دارکەر" و کۆمەڵەی "پشتیوانی" و کۆمەڵەی "پێشکەوتن" و کۆمەڵەی "هیوا" و کۆمەڵەی "ژ.ک" و.. هتد، کەموزۆر، بۆ "سەربەخۆییی کوردستان" تێکۆشاون. دیارە، وەک لەمەوبەر گوتمان، بە سەرکردەیەتیی رێبەرانی کلاسیکی کورد. چۆنکە دەستەی هوردە بۆرژوای رۆشنبیری کورد ئەو دەمە نە بەچەندایەتی و نە بە چۆنایەتی ئەوەی لە باردا نە بوو کە بتوانێ سەرکردەیەتیی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستانەی کورد بخاتە ژێر دەستی خۆی و ئەمەشم لە سەمیناری "بیری نەتەوەیی کوردی"دا رۆن کردووەتەوە و بەشدارانی بەرێز دەکارن بگەرێنەوە سەری.

## ٤- کورد و بیری ئۆتۆنۆمی

بیری "ئۆتۆنۆمی"، یان وەک فارسەکان دەبێژن "خودمختاری"، یان وەک عەرەبەکان دەبێژن "الحکم الذاتي"، - ترکەکان جاریٚ نەگەیشتوونەتە باسی "ئۆتۆنۆمی" (پێکەنینی ئامادەبووان) -ئەم بیرە لە ڕۆژهەلاتدا، بەلام بە جۆرێکی تایبەتی لە سەتەی ڕابوردوودا، بووە.

ترکە عوسمانییەکان کاتی خۆی بە دیانەکانی بولگارستان جۆرە مافێکی "بەڕێوەبەرێتیی خۆیی" (الادارة الذاتیة) یان دابوو، کە بەمەیان دەگوت "ویلایەتی مومتازەی ڕۆم ئیلی شەرقی". هەروەها کە دەستوورە بنچینەییەکەی ئێران (قانون مشروطه)یش لە سالی ١٩٠٦ دا دەرچوو، جۆرە مافێکی بەڕێوەبەرێتیی خۆیی لەژێر نێوی "قانون ایالت وولایت"دا دەستنیشان کردبوو، کە هیچ کاتێک نەخرایە کار. ئەوەی ڕاستی بیٚ؛ ئەم "بەڕێوەبەرێتیی خۆیی"یە؛ نە لە سنووری دەولەتی عوسمانی، و نە لە سنووری ئیمپراتۆرێتیی قاجاری دا؛ مانا و نێوەرۆکێکی ناسیۆنالی نەبووە. هیچ نێوچەیەک مافی بەڕێوەبەرێتیی خۆیی لەسەر بنچینەی "ناسیۆنالیتەیی" پێنەدرابوو. مەسەلەی ئۆتۆنۆمی لە ڕۆژهەلاتی نێزیکدا بۆ یەکەمجار لە کۆنگرەی ڕاپەڕینی ئیسلامی (مؤتمر النهضة الاسلامیة)دا باسکرا کە لە مەککە بە سەرۆکایەتیی زانای ئیسلام عەبدولڕەحمانی کەواکیبی (١٨٤٩ - ١٩٠٣) -کە ئەویش خۆی مەلایەکی کورد بوو- لە سالی ١٨٩٩ دا بەسترا. کۆنگرە داوای لە حکوومەتی عوسمانی کرد کە "چەشنە سەربەخۆییەکی جۆری لە بەڕێوەبەرەیتیدا بدا بە هەموو ئەو گەلانەی لە دەولەتی عوسمانیدا دەژیان، بەمەرجێک کە بگونجیٚ لەگەلٚ ڕەوشتو خوو وسروشتی ولاتەکەی خۆیان، وەک میرنشینەکانی ئەلمانیا و ویلایەتەکانی ئەمەریکا و کۆلۆنییەکانی بەریتانیا و ڕووسیا" (٨). لێرەدا بە ئاشکرا دەبینین کە ئەم داخوازییەی "کۆنگرەی ڕاپەڕینی ئیسلامی" چاو لێکەرییەکی دۆخ و باری سیاسیی دەولەتانی ڕۆژاوا بووە. هەروەها لە دەستووری بنچینەیی ئێراندا؛ هەرچەندە باسی "ایالت

وولایەت" هەبوو، بەڵام باسی کورد یان ئازەری یان بلووچ یان فارس یان ترکمان نەهاتبووە پێشەوە. ئەو بەندانەی کە لە "دەستووری بنچینەییی ئێران"دا سەر بە مەسەلەی "ایالت وولایت"ن ئەمانەی خوارەوەن:

"بەندی نەوەت: لە هەموو وڵاتی لە چاوێنی بەدووری (ئێران)دا ئەنجومەنی ئەیالەتی وویلایەتی بەپێی نەریتنامەی تایبەتی دروستدەبێ و دەستوورە بنچینەییەکانی ئەو ئەنجومەنانە بەم پێیەی خوارەوە دەبێ:

بەندی نەوەتو یەک: ئەندامەکانی ئەنجومەنە ئەیالەتی و ویلایەتییەکان راستەوخۆ لەلایەن دانیشتووانەوە هەڵ دەبژێررێن، بەپێی نەریتنامەکانی ئەو ئەنجومەنە ئەیالەتی و ویلایەتییانە.

بەندی نەوەتو دوو: ئەنجومەنە ئەیالەتی وویلایەتییەکان دەسەلاتی چاودێریی تەواویان هەیە لەو ریفۆرمانەدا کە سەر بە سووتی گشتین، ئەمەش لە سنووری دەستوورە بڕیار لەسەر دراوەکاندا دەبێ.

بەندی نەوەتو سێ: وێنەیەکی هەموو جۆرە مەسرەف و داهاتێکی ئەیالەت و ویلایەتەکان لەلایەن ئەنجومەنە ئەیالەتی وویلایەتییەکانەوە چاپ و بلاو دەکرێتەوە".

وەک دەبینین لەم بەندانەدا باسی گەل و زمان و تایبەتکارە ناسیۆنالەکان نەکراون.

بیری "ئۆتۆنۆمی" لەسەر بنچینەی خۆبەرێوەبردنی گەلێکی خاوەن زمانێکی تایبەتی و کولتوورێکی تایبەتی و دانیشتووی هەرێمێکی تایبەتی، لە کاروباری نێوخۆیی خۆیدا؛ بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا، و بگرە لە رۆژهەلاتی نێزیکدا، لەلایەن کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیاوە داهات کە لەپاش جەنگی جیهانیی یەکەم پێیان نایە بەشێک لە کوردستانی عوسمانییەوە و سەبارەت بە هەلومەرجی ناوچەکە و بەرژەوەندیی ئابووریی خۆیان بیری ئۆتۆنۆمییان هێنایە کایەوە؛ بۆ ئەوەی بەرەنگاریی بیری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆی پێبکەن. چۆنکە هاتنە کایەی دەوڵەتێکی

سەربەخۆی کورد؛ سووتی ئەوانی تێدا نەبوو، بەتایبەتی دەوڵەتێکی کورد بە سەرۆکایەتیی پیاوێکی وەک شێخ مەحموودی بەرزنجی (١٨٨٢-١٩/١٠/١٩٥٦) کە تەشی رێسی تەخت و تاجی بەریتانیا نەبوو، بە زیانی بەریتانیا و بەرەی کۆلۆنیالیستەکان تەواو دەبوو. هەر لەبەر ئەوە بوو، لەکاتێکدا کە ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان لە ١/١٢/١٩١٨ دا بە "فەرماندار"ی خوارووی کوردستان بەرەسمی دەناسی، کەچی چوون فەیسەڵێکیشیان لە سووریاوە هێنا و لە ٢٢/٨/١٩٢١ دا، واتە هەر لەکاتی ماندانی (انتدابی) خۆیاندا کردیان بە مەلیک بەسەر ئەو وڵاتەوە کە خۆیان پێیان دەگوت "مێزۆپۆتامیا" (٩) و دوایی نێویان نا "عێراق" و لە ٢٤/١٢/١٩٢٢ دا بەزمی ئۆتۆنۆمییان بەبای گوێی کورددا دا. ئەمە لە کاتێکدا کە هێشتا پەیمانی سێڤر لە کایەدا بوو. بەپێی ئەو بەیاننامەیەی کە کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیا و هاوکارە عەرەبەکانیان لە بەغدا بڵاویان کردەوە، بەڵێنیان بە "دەستەی نەتەوەکان" (عصبة الامم) و کورد دا کە:

"حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیای گەورە و حکوومەتی عێراق دان بە مافی ئەو کوردانەدا دەنێن کە لە سنووری عێراقدا دەژین، کە حکوومەتێکی کوردیی تایبەتیی خۆیان لەو هەرێمانەدا دابمەزرێنن کە کورد زۆربەی زۆری دانیشتووەکانیان پێک دێنن. هەردووکیان هیوایان وایە، کە کەرتە جۆرجۆرەکانی کورد بە زووترین کات لە نێوخۆیاندا لەسەر شێوە و قەوارەی ئەو حکوومەتە رێکبکەون کە ئارەزوویانە و نوێنەرێکی رەسمیی خۆیان بۆ بەغدا بنێرن، تاکو پێوەندیی سیاسی و ئابووریی خۆیان لەگەڵ هەردوو حکوومەتی بەریتانیا و عێراقدا باسبکەن" (١٠).

بێگومان ئەم بەیانە درۆیەکی دڵخۆشکەرە بوو لە کاتی خۆیدا لەلایەن بەریتانیای گەورە و کاربەدەستانی عەرەبی عێراقەوە کە لە گەڵ کورددا کرا. هەر پاش لەکارخستنی پەیمانی سێڤر و ئیمزاکردنی پەیمانی لۆزان لە نێوان سوێندخۆران و ترکیای کەمالی دا (١٩٢٣)، بەریتانیا و عێراق هەموو جۆرە بەڵێن و پەیمانێکیان لە بارەی ئۆتۆنۆمیی خوارووی کوردستانەوە خستە

پشتگوێ و کە لە شوباتی ١٩٢٩ دا شەش نوێنەری کورد لە پەرلەمانی عێراقدا داوای "بەڕێوەبەرێتییەکی خۆیی" (الادارة الذاتية) یان کرد، نوێنەرانی بەریتانیا و بەردەستە عەرەبەکانیان، هەردوولا، خۆیان کەڕ کرد لێی (١١). جا وەک چۆن بەریتانیا، پاش ئیمزاکردنی پەیمانی سێڤر لە ١٩٢٠ دا و هەتا بەستنی پەیمانی لۆزان لە ١٩٢٣ دا زوڕنای ئۆتۆنۆمییان بۆ کورد لێدەدا، هەر ئاواش ژۆن ترکەکانی سەرکردەی دەوڵەتی لە جەنگدا شکاوی عوسمانی، هەر دەنگی دەهۆڵی ئۆتۆنۆمییان دەدا بەبای گوێی کورددا، و دەیانگوت کە ئامادەن "ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان" (ویلایەتێکی مومتازە) بە کورد بدەن. ئەنوەر پاشای سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی و سەرۆکی کۆمەڵی "اتحاد و ترقی" بە پەلە "لیژنەیەکی وەزیرانە"ی پێکەوە نابوو بۆ ئەوەی لەگەڵ نوێنەری کوردەکان بکەوێتە وتووێژ (١٢)؛ کە دیارە هەڵوێستی ژۆن ترکەکان و کاربەدەستانی ترکیا پاش پەیمانی لۆزان، نەک بەرامبەر مەسەلەی "ئۆتۆنۆمیی کوردستان"، بەڵکو بەرامبەر کورد بە گشتی، شتێکی ئاشکرایە و پێویست بە لێدوان ناکات.

لە پاش ڕەنگرشتن و بزمار کوتکردنی سنووری ئەو دەوڵەتە دەستکردانەی کە پاش بەستنی پەیمانی لۆزان هاتنە کایەوە و کوردستانیان بەسەردا دابەشکرابوو، وەک ترکیای کەمالی و عێراقی فەیسەڵ و ئێرانی پەهلەوی و سووریا، زۆر و کەم؛ لە هێندێک لەم وڵاتانەدا، هەر کاتێک بزووتنەوەی کوردایەتی بەهێز ببوایە و باسی سەربەخۆیی کوردستان بهاتایەتە پێشەوە و کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان گوشاریان بۆ داگیرکەران بهێنایە، باسی "ئۆتۆنۆمی" دەهاتە کایەوە. ئەمەش هەمووی بە پرس و ڕا و پیلانی بەریتانیا وفەرەنسا بوو کەلە سووریا و لوبنان و ئێران و فەلەستین و میسردا دەستیان زۆر دەڕۆی و بەرژەوەندییان وای پێویست دەکرد کە سنووری ئەم دەوڵەتانە بپارێزن. بۆ وێنە لەکاتی دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە ٢٢ /١/١٩٤٦ دا بە سەرۆکایەتیی قازی محەممەد، کاربەدەستانی فارس لە تاران کەوتنە جرتوفرت و ڕێکخستنی پرۆژەیەکی "خودموختاری"، و ئەوەبوو قوام السلطنە ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی ئێران، پاش پرس و ڕا بە بەرەی ڕۆژاوا و سۆڤێت، کەوتە باسی

"ئۆتۆنۆمی" بۆ کوردستان و ئازەربایجان. هەروەها ئەوەبوو باگیرۆڤ، سەرۆک وەزیرانی ئەو دەمەی کۆماری ئازربایجانی سۆڤیاتی، بەو وەفدە کوردەی گوتبوو کە لە مانگی نۆڤەمبەری ١٩٤٥ دا چووبوونە باکۆ بۆ وتوویژ؛ کە دەبێ جاری باسی "سەربەخۆیی کوردستان" نەکەن و بە "جۆرە مافێک" رازی بن لە سنووری کۆماری ئازربایجاندا کە ئەویش "کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی" دەبێ (١٣)، ئەوجا کە رۆژی خۆی هات، سۆڤێت پشتگیریی مەسەلەی سەربەخۆیی هەموو نەتەوەی کورد دەکات (١٤). هەروەها لە خوارووی کوردستاندا و لەپاش پەرەسەندنی شۆرشی بارزان کە لە ١٩٤١ ەوە دەستیپێکرد و تا ١٩٤٥ درێژەی کێشا؛ سەرۆک وەزیرانی ئەو دەمەی عێراق نووری سەعید، کە بنکدار و باوەرپێکراوی بەریتانیا بوو لە عێراقدا؛ پرۆژەی "بەرێوەبەرێتییەکی خۆیی" (ادارة ذاتیة) بۆ "لیوا کوردەکانی عێراق" ئامادە کرد و ئینگلیزەکانیش کەوتنە ئامۆژگاری کردنی کورد کە بەم "بەرێوەبەرێتییە نێوخۆیی"یە رازی بن و جاری داوای "سەربەخۆیی کوردستان" نەکەن تا شەر دەبرێتەوە، کە رۆژی خۆی هات؛ ئەو کاتە بەریتانیا پشتگیریی کورد دەکات. هەروەها فەرەنساییەکانیش لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا بەتەمای ئەوە بوون لە هێندێک ناوچەی کوردستانی سووریادا "بەرێوەبەرێتییەکی خۆیی" دابمەزرێنن، کە ئەوە بوو ئەو "هێلکە زێرینە" هەر نەکرا. جا لەبەر ئەوەی "ئۆتۆنۆمی"، یان "بەرێوەبەرێتیی خۆیی" تەنێ وەرامێکی داگیرکەرانی کوردستان بوو بەرامبەر بە داخوازیی "سەربەخۆیی کوردستان" و دەخرایە بەردەم لەکاتی بەهێزبوونی بزووتنەوەی کوردایەتی و مەترسیی تێکچوونی سنووری ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەشکردووە، دیارە هەر کاتێک ئەو مەترسییە نەمایە، یان کەم ببوایە، ئەوا مەسەلەی "ئۆتۆنۆمی" لەبیر دەبرایەوە. بۆ وێنە: لە ئێراندا؛ داروودەستەی موسەددیق (مصدق) و شۆڤێنیستە فارسەکانی هاودەنگی موسەددیق؛ بەربەرەکانێی پرۆژەی قوام السلطنە یان کرد و لە پەرلەماندا دایانە دواوە (١٥). هەروەها وەزیرە عەرەبەکانی وەزارەتی نووری سەعیدیش پرۆژەکەی نووری سەعیدیان لە عێراق دایە دواوە (١٦). پاش برانەوەی جەنگی جیهانیی دووەم و پاش لێدانی بزووتنەوەی کوردایەتی بە رووخاندنی

کۆماری کوردستان و تێکشکاندنی شۆرشی بارزان و پێشێلکردنی بزووتنەوەی کوردایەتی لە ترکیا بە گێرانی قەسابخانەی دێرسیم و کوژاندنەوەی شۆرشی کوردە عەلەوییەکان لە ١٩٣٨ / ١٩٣٩ دا لەرێی بەکارهێنانی "گازی ژەهراوییەوە" و تەسلیم کردنی رۆژاوای کوردستان بە عەرەبە ناسیۆنالیستەکانی سووریا لەلایەن کۆلۆنیالیستە فەرەنساییەکانەوە، ئەوجا باسی "ئۆتۆنۆمی" لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە برایەوە. بەلام کارەساتەکانی جەنگی جیهانیی دووەم کە بوون بە هۆی شەهید بوونی سەرکردەیەکی کلاسیکی گەورەی وەک قازی محەمەد و دەربەدەربوونی سەرکردەیەکی کلاسیکی گەورەی دیکەی وەک مستەفا بارزانی (١٩٠٩؟ -١٩٧٩/٣/١) و نەبوونی سەرکردەیەکی کلاسیکی وا لە مەیداندا کە بتوانێ جێی ئەو دوانە بگرێتەوە، رێی بۆ هوردە بۆرژوای رۆشنبیری کورد کردەوە؛ کە پتر بێتە سەر شانۆی سیاسەتی کوردایەتی و بە بانگاشەی چوونە ژێر ئالای سەرکردەیەتیی بارزانییەوە بکەوێتە چالاکی. جا هەرچەندە بارزانی لە ١٩٤٧ ەوە تا ١٩٥٨ لە سۆڤیێت پەنابەر بوو، و لەم ماوە دوور و درێژەدا هیچ پێوەندییەکی بەم رۆشنبیرانەوە نەمابوو، بەلام ئەمانە توانیان سوود لە نێوو پایەی کۆمەلایەتیی بارزانی وەربگرن و بەنێوی وییەوە لەنێو خەلکدا بکەونە کار کە گوایە بارزانی سەرکردەی "پارتی دیمۆکراتی کورد"ە، ئەو حیزبەی کە لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ دا لەلایەن هوردە بۆرژوای رۆشنبیری کوردەوە دروستکرا. شایانی باسە کە کشانی لەشکری سۆڤیێت بەسەر بەشێک لە کوردستاندا لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا و دامەزراندنی کۆماری کوردستان، بە رەزامەندی، یان بە بێ دەنگیی سۆڤیێتەکان، شان بە شانی ئەو تاقیکردنەوە تفت و تالانەی کە کورد لەگەل بەریتانیا و فەرەنسا و بەرەی رۆژاوادا هەیبوو؛ هەر لە جەنگی جیهانیی یەکەمەوە تا کۆتاییی دووەم؛ قورسایی و رێزێکی بۆ سۆڤیێت لە نێو کورددا دروستکردبوو. لەهەمان کاتدا نا هومێدییەکی زۆری لە دل و دەروونی کورددا بەرامبەر بە بەرەی رۆژاوا و بەتایبەتی بەریتانیا پەیدا کردبوو. هەروەها پێوەندیی رۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمە، بەتایبەتی لە عێراق و ئێراندا، بە رۆشنبیرانی چەپ و مارکسیستی

عەرەب و فارسەوە؛ کۆمۆنیزمی بە رۆشنبیرانی کورد وەک "رەچەتەی رزگاری" ناساندبوو. هەموو ئەم هۆیانە و گەلێک هۆی دی کە لە کارەکانی دیکەمدا بە دوور و درێژی باسمکردوون، بوون بە هۆی ئەوەی هوردە بۆرژوای رۆشنبیری کورد بیری مارکسیێتی بکاتە ئیدۆلۆژیی خۆی، کە ئەوەتا تا ئەمڕۆش هەر وایە. جا لەبەر ئەوەی مارکسیستە عەرەب و فارس و ترکەکان؛ دژی بیری جیابوونەوەی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد بوون، ئەوا یەکێک لە مەرجە پێویستەکانی نێزیک بوونەوەی هوردە بۆرژوای مارکسیستی بێهێزی بێجەماوەری کورد لە مارکسیستە عەرەب و ترک و فارسەکان ئەوەبوو، باسی سەربەخۆیی کوردستان بە هیچ جۆرێک نەکرێ، بەڵکو باسی مافی "هاونیشتمانیێتی" و ئەو پەڕەکەی "ئۆتۆنۆمی" بکرێ. بێجگە لەوەش باسی "ئۆتۆنۆمی" لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە کە کوردستانیان بەشکردووە؛ گیروگرفتی وا یەکجار گەورەی نەدەهێنانە بەردەم، وەک بیری سەربەخۆیی کوردستان دەیهێنایە پێشەوە. چۆنکە ئەو دەوڵەتانە؛ سەربەخۆیی کوردستانیان بە "ناپاکیی مەزن" (الخیانة العظمی) دەدایە قەڵەم، و بەپێی قانوون بە توندی سزایان دەدا. لە هەموو ئەمانەش بترازێ؛ هوردە بۆرژوای کورد -بە پێچەوانەی سەرکردەیەتیی کلاسیکەوە، کە جەماوەری رەشو رووتی کورد پشتگیری دەکرد؛ خۆی هیچ جەماوەرێکی لە کوردستاندا لە پشتەوە نەبوو. بێجگە لەوەش کە جەنگی جیهانیی دووەم براپەوە -وەک لەمەوبەر گوتم- سەرکردەیەکی کلاسیکی دەسەلاتداری خاوەن جەماوەری وەک قازی محەممەد یان بارزانی چنگ نەدەکەوت کە هوردە بۆرژوای رۆشنبیر خۆی بخاتە پاڵی. لەبەر ئەوە هوردە بۆرژوای کورد ناچار بوو ستراتیژی خۆی بگۆڕێ و لە "سەربەخۆیی کوردستان"ەوە بیکاتە "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان".

بە کورتی؛ پاش تەواو بوونی جەنگی جیهانیی دووەم؛ درۆشمی "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان" لە درۆشمێکی رەشە خەڵەتێنی کاتیی داگیرکەرانی کوردستانەوە، بوو بە درۆشمێکی هەمیشەیی هوردە بۆرژوای رۆشنبیری مارکسیستی کورد. ئەوجا درۆشمی هوردە بۆرژوای مارکسیستی کورد و درۆشمی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەشکردووە؛ بە تەواوی وەک

درۆشمە فریودەرە کاتییەکەی کۆلۆنیالیستە ئەورووپاییەکان و درۆشمی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانی لێهات؛ واتە بوو بە درۆشمی "پاراستنی یەکێتیی نیشتمانی"ی ئەو وڵاتانەی کوردستان نووسێنراوە پێیانەوە، کە ئەنجامی ئەمەش بەربەرەکانێی "جیابوونەوە خوازی" بوو. بەکورتی درۆشمی هوردە بۆرژوای کورد بوو بە "پاراستنی یەکێتیی نیشتمانیی عێراق و ئێران و ترکیا و سووریا و ... هتد". هێندێ جاریش هوردە بۆرژوای کورد گەلێک پەرگیرتر و خەستتر لە کۆمۆنیستە عەرەب و ترک و فارسەکان و گەلێک توندتر و شێتانە تر لە داگیرکەرانی کوردستان دژی ئەو کوردانە دەوەستایەوە کە باسی سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد، و بەنێوی بەربەرەکانێی "جیابوونەوە خوازی"یەوە دوژمنایەتی دەکردن و دەکەوتە خراپەکاری لەگەڵیان و تەنانەت جاسووسیکردن بە سەریانەوە؛ و ئەم دژایەتیکردنی "جیابوونەوە خوازی"یەش لە پرۆگرامی حیزبەکەیاندا دەیاننووسی و لە رۆژنامەکانیاندا بە ئاشکرا بڵاویان دەکردەوە و بە بۆنە و بێ بۆنە، باسیان دەکرد کە "جیابوونەوە خواز" نین و "یەکێتی"ی ئەو دەوڵەتانەیان دەوێ کە کوردستانیان بەشکردووە. بۆ وێنە لە مانگی ئابی ١٩٥٨دا مێشیل عەفلەقی سکرتێری گشتیی پارتی بەعس و ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری گشتیی پارتی دێمۆکراتی کوردستان لە تەلەفزوێنی بەغدادا بەیەکگەیشتن، ئیبراهیم ئەحمەد بە زمانی عەرەبی گوتی:

"ئەو هاوبەشییەی رۆڵەکانی کورد و عەرەب هەڵیانبژاردووە، باوو باپیرانیشمان هەر هەڵیان بژاردووە، کاتێک لە چاخە جۆر جۆرەکانی مێژوودا پێکەوە وەستاون و بەرگرییان لەم وڵاتە (عێراق) کردووە... برا کوردەکانتان شانازی بە راپەرینی ناسیۆنالیستانەی عەرەبەوە دەکەن لە خەباتە رزگاریخوازانەکەیدا و دڵنیاشن هەر هەنگاوێک کە عەرەب بینێ بەرەو یەکگرتن، یان یەکێتیی عەرەبی و گەشە پێدانی هێزی عەرەب، دەبێتە خێر و بێر و دەرژێ بەسەر کورددا". (تەماشای رۆژنامەی "الجمهورية" ی بەغدا بکە،ساڵی یەکەم، ژمارە (١٣)، هەینی ١١ی ئابی ١٩٥٨.

پرۆگرامی پارتی کە لە کۆنگرەی چارەمی حیزبدا کە لە ٦ی تشرینی یەکەمی

١٩٥٩ دا لە بەغداد بەسترا، لە مادده (٦)ی بەندی (أ)ی دا دەبێژێ:

"أ- بۆ بەهێزکردنی پێوەندیی پرایانە و دۆستانە لە نێوان هەردوو گەلی عەرەب و کورد و هەموو کەمایەتییە ناسیۆنالەکانی وەک ئاسووری و ترکمان و ئەوانی دیدا تێدەکۆشین، هەروەها بۆ بەهێزکردنی یەکێتیی نیشتمانی تێدەکۆشین و کار بۆ فراوانکردنی مافە ناسیۆنالەکانی گەلی کورد دەکەین لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی لە چارچێوەی یەکێتیی عێراقی و جێگیرکردنیدا لە دەستووری هەمیشەیی و بەربەرەکانێی بیروڕای شۆڤێنیانە و کۆسمۆپۆلیتییانە و جیابوونەوە خوازانە (دەکەین)".

هەروەها لایەنگرانی جەلال تالەبانی، پاش جیابوونەوەیان لە سەرکردەیەتیی بارزانی لە ١٩٦٤ دا و لەو کۆبوونەوەیەدا کە بە "کۆنگرەی شەشەمی پارتی" نێونرا و لە کۆتاییی مارتی ١٩٦٥ دا سازکرا، پرۆگرام و پێڕۆیەکی نێوخۆییان دەرکرد، لە برگەی دووەمی بەندی چوارەمیدا دەبێژێ:

"٢- بەهێزکردنی خەباتی عەرەبی-کوردی لەسەر بنچینەی پێوەلکانی هێزە پێشکەوتنخوازە عەرەبییەکان و کوردییەکان لە چارچێوەی بەرەیەکی یەکگرتوودا، لەگەڵ بەربەرەکانێی جیابوونەوە خوازانە و پێوە نووسێنەرانە".

شایانی باسە کە لەو پرۆگرامەی پارتیدا کە لە کۆنگرەی شەشەمی حیزب لە ١٩٦٤ دا بڕیاری لەسەر دراوە، هەروەها لەو پرۆگرامەدا کە لە کۆنگرەی هەشتەمی حیزب لە ١٩٧٠ دا بڕیاری لەسەر دراوە، باسی "یەکێتیی نیشتمانیی عێراق"ی تێدایە، بەڵام وشەی "بەربەرەکانێی جیابوونەوە خوازی" تێدا نابینرێ. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو چینی هوردە بۆرژوای مارکسیستی کورد بە سەرۆکایەتیی تالەبانی پاش ئەوەی لە ١٩٦٤ بەو لاوە لە نێو پارتیدا دەسەڵاتیان کەمبووەوە، پارتی کەوتبووە ژێر رکێفی بارزانی و لایەنگرەکانییەوە. دیسانەوە ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە سەرکردەیەتیی کلاسیکی کورد؛ ستراتیژی خۆی واتە "سەربەخۆییی کوردستان"ی هەر بەسەر زاری گۆڕیبوو، نەک لە کانی دڵەوە، ئەگەرچی بە ناچاری، لە دەمەدەمی

کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەمەوە و، لەبەر خاتری پێکەوە کارکردن لەگەڵ هوردە بۆرژوای رۆشنبیری مارکسیستی کورد و رەچاو گرتنی هەلومەرجی جیهانیدا، بە ئاشکرا باسی سەربەخۆیی کوردستانی نەدەکرد.

جا هەرچەندە دەستەی هوردە بۆرژوای کورد، بەوپەڕی تیژی و زۆر بە گەرمییەوە؛ دژی "جیابوونەوە خوازی" دەوەستا، بەڵام هێشتا هەر لە تۆمەتی "جیابوونەوە خوازی"، چ لەلایەن چەپییەکانی عەرەب و ترک و فارسەوە، و چ لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە؛ رزگاری نەدەبوو. ئەم "تۆمەتە"، بەتایبەتی لە دەورانی قاسمدا، زوو زوو دەخرایە پاڵ هوردە بۆرژوای کوردی سەر بە "پارتی دیمۆکراتی کوردستان" و "گوناهبار" دەکرا بەوەی گوایە دەیەوێ "دەوڵەتێک بە یارمەتیی ئەمریکا دابمەزرێنێ". رۆژنامەی "اتحاد الشعب" زمانی حاڵی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە ١١ی مایسی ١٩٥٩ دا دەینووسی: "دەزگەکانی پەیمانی بەغدا بە سەرۆکایەتیی ئیمپریالیستە ئەمریکاییەکان کەوتوونەتە چالاکی بۆ ئامادەکردنی کەینوبەین و دەستدرێژکردنە سەرکۆمارە ساوا پاڵەوانەکەمان و جارێکی دی پەنایان بردووەتە بەر قاو داخستن و نۆکەر کرین و چەک و پارە دابەشکردن و دامەزراندنی بنکە بۆ کۆبوونەوەی دار و دەستەی بە کرێگیراوو دەرەبەگە کوردەکان و ... هتد لە ژێر درۆشمی گوایە "حکوومەتی کوردی" دا و "ئامادەییی ئەمریکا بۆ یارمەتیدانی گەلی کورد بۆ وە دەستهێنانی سەربەخۆیی" و گوایە ئەو "مەترسییەی کە کۆماری عێراق بۆ پاشە رۆژی نەتەوەی کورد دروستیدەکات". لەپاش هەڵگیرساندنی شۆرشی ئەیلوولەوە لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ دا هەتا هەرەسهێنانی شۆرش لە ٢٦ ی مارتی ١٩٧٥ دا درۆشمی هوردە بۆرژوای کورد بەربەرەکانێی بیری سەربەخۆیی کوردستان بوو.

لە ساڵی ١٩٦٣ دا و کاتێک جەلال تاڵەبانی چوو بۆ میسر بۆ هاوبەشیکردن لە کۆنگرەی "یەکێتیی عەرەبی" دا کە لە نوێنەرانی عێراق و میسر و سووریا پێکهاتبوو، و لە قاهیرە بەسترا. مام جەلال لە بیرخەرەوەیەکدا کە لە ١٩٦٣/٤/٨ دا دابووی بە کۆنگرەکە، لە پاڵ باسکردنی مەسەلەی کورددا،

گوتبووی ئەو مافەی دەدرێ بە کورد دەبێ جۆرێک بێ کە رێی "مەترسیی جیابوونەوەی کورد" بگرێ (١٧). بەلاّم لەگەلْ ئەمەشدا مام جەلال لە تۆمەتی جیابوونەوە خوازی رزگاری نەبوو بوو. سەرنووسەری رۆژنامەی "الاهرام" محەممەد حەسەنەین هەیکەل (محمد حسنین هیکل) لە ژمارەی رۆژی ١٩٦٣/٦/٢٨ی ئەم رۆژنامەیەدا نووسیبووی":

"... هێندەی کارەکە پێوەندیی بە هەلْوێستی کۆماری یەکگرتووی عەرەبەوە هەیە بەرامبەر مەسەلەکە (مەسەلەی کورد)، ئەوا جەمال عەبدولناسر رەئیی خۆی بۆ جەلال تالْەبانی ئاشکرا کرد و گوتی: "حەز دەکەم بەر لە هەموو شتێک پێتبێژم، کەوا ئەز دژی هەموو جۆرە کردارێکی جیابوونەوە خوازانەم لە هەر نیشتمانێکی عەرەبدا بێ، و کۆماری یەکگرتووی عەرەب بەربەرەکانێی هەموو جۆرە رێبازێکی لەم بابەتە دەکات، ئەوجا هەلْ و مەرج هەرچی چۆنێک دەبێت با ببێت".

پرۆگرامی دەستەی لایەنگرانی تالْەبانیی سالْی ١٩٦٧ مان باسکرد کە ئاشکرا دژی "جیابوونەوە خوازی" دەدوێ. ئەوجا دەبێ بزانین کە بەربەرەکانێی مەسەلەی "جیابوونەوە خوازی" لەلایەن ئەم دەستەیەوە لەپاش هاتنەوە سەر کاری بەعسییەکان لە ١٩٦٨ دا و پێکەوە کارکردنی هەردوو لایان لە دژی شۆرشی ئەیلوول بە سەرکردەیەتیی بارزانی، گەیشتە هەندازەیەک تامی تێدا نەما. پاش ئەوەی رژێمی بەعس ئیجازەی رۆژنامەیەکی بە زمانی عەرەبی بە نێوی "النور"ەوە بەم دەستەیە دا، رۆژنامەکە بوو بە زمانی حالْی رژێمی بەعس و دەستاوێژێک بۆ پەلاماردانی "جیابوونەوە خوازی". جا ئەمە وەنەبێ هەر رەوشی رۆژنامەی "النور" بووبێ. بەلْکو دەزگەی راگەیاندنی لایەنگیرانی تالْەبانی کە هەتا بەستنی پەیمانی مارتی ١٩٧٠ لە نێوان بارزانی و بەعسدا، هەر بە نێوی "پارتی دیمۆکراتی کوردستان"ەوە چالاکییان دەنواند، بەگشتی بەم جۆرە بوو. بۆ وێنە: گۆڤاری "رزگاری" کە ئەویش زمانی حالْی ئەم دەستەیە بوو، و لەلایەن نەوشیروان مستەفا وشازاد سائیبەوە لە سلەیمانی لە سالْی ١٩٦٩ دا دەرچوو، لە ژمارە (٢)ی دا کە لە رۆژی ١٩٦٩/٤/٢٧ دا

دەرچووە، لە ژێر سەر نێوی "بۆچی دژی جیابوونەوەین" دەنووسێ: (تەماشای فۆتۆکۆپی ئەو نووسینە بکە) لە لاپەرە ۱۰۲ ی ئەم سەمینارەدا.

ئەمە وا، و پاش تێکشکانی شۆرش، لە گەلێک رووەوە هەلو مەرجێکی تازە لە رۆژهەلاتی نێوەراستدا هاتە پێشەوە و پێبەپێی ئەوە هوردە بۆرژوای مارکسیستی کورد کەوتە حالێکی واوە کە ئێدی نەیتوانی لەسەر بەزمی کۆنی بروا بەرێوە. لەبەر ئەوە هەرەسەکە، لە چاو هوردە بۆرژوای کورددا، ئەم ئەنجامانەی خوارەوەی لێدەرچوو:

(۱) پاش ئەوەی هوردە بۆرژوای کورد سی سالی رەبەق (۱۹٤٦-۱۹۷٦) پروپاگەندەی بۆ "حیزبی تاقانە" و "تاکە نوێنەر" و "تاکە پێشرەو" دەکرد، و کاتی خۆی جەنگێکی چلێپایی (صلیبی) لە دژی کاژیک هەلگیرساندبوو، چونکە کاژیک تاکە حیزبێک بوو لە کوردستاندا بێجگە لە "پارتی"، ئەمجا پاش هەرەسەکە بۆیدەرکەوت کە بوون و مانەوەی تاقە یەک رێکخراوی سیاسی لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، کارێکی نەشیاوە. بەتایبەتی، چونکە هوردە بۆرژوا دەیویست خۆی لەسەرکردەیەتیی کلاسیک جیا بکاتەوە و خۆی سەربەخۆ بکات، لەبەر ئەوە ناچار بوو بە نابەدلی دان بەوەدا بنێ کە "پلورالیزم" مافێکی خەلکی کوردستانە. ئەم رێبازەش لە نووسینەکانی "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان" و "سەرکردەیەتیی کاتیی پارتی دیموکراتی کوردستان" (سەردەمی کاک سامی) (۱۸) و نووسینەکانی "لیژنەی ئامادەکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان" (۱۹) و نووسینەکانی حسیک و حسک (۲۰) و ئەدەبیاتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (۲۱) و زۆربەی هەرە زۆری رێکخراوە کوردییەکاندا بەدی دەکرێ. ئەم رێبازە تازەیە، واتە بوونی پلورالیزم لە ریزەکانی هوردە بۆرژوای کورددا "رەوایەتی"یەکی پەیدا کرد بۆ ئەوەی چەند رێکخراوێک دروست بێن پاش هەرەسەکە. بەلام هەر زوو دەرکەوت کە ئەم "پلورالیزم"ە لە باوەرەوە نەهاتبوو، چونکە هەر زوو ئەم رێکخراوانە لە سەر سەرکردەیەتی و رێبەریتی و تاکە پێشرەویتی کەوتنە گیانی یەک و ئەمەش هەتا ئەمرۆ هەر وایە: لەنێو ئەو کۆمەلانەدا "ی.ن.ک"

لە هەمـــوو لایەکـــیـــان پتـــر روو بەرەو بیـــری تۆتـالیـــتـــێـرانەی ئەڤانگاردیستانەیە(٢٢).

(٢) بەرەی هوردە بۆرژوای کـورد تێکڕا، لـە "بیـری نەتەوەیی کـوردی"یەوە گەلێک دروشم و سەرەتا و شێوازی کار و بنەمای ئیدیۆلۆژییانەی وەرگرت کە لە وتاری "رەنگدانەوەی بیری کاژیک لـە ئەدەبیاتی هوردە بۆرژوازیی کورددا" (٢٣) بە دووورودرێژی باسمکردوون. بەڵام لێرەدا هەر پەنجە رادەکێشم بۆیان:

(أ)- مـەسـەلـەی "مـافی بڕیاری چارەنووس" بۆ کـورد، لای هێندێک لە رێکخـراوە هوردە بۆرژواکـانەوە، پاش هـەرەسـەکـە هاتە پێشـەوە، بەڵام وەک دەردەکـەوێ لای هێندێکیـان؛ یان تاوی مـزدەیە، یان بۆ تەفـرە دانە. بۆ وێنە "یەکێتیی نیشتـمانیی کوردستـان" لە سەردەمێکی تایبـەتیدا باسی "مافی بڕیاری چارەنووسی کـورد" ی دەکـرد، (تەمـاشـای بـەیانی ی.ن.ک بکـە هی رۆژی ١٨/ ١/ ١٩٨٣ بە زمانی عـەرەبی و لە ژێر نێوی "بیان الاتحاد الوطني الكردستاني حول اوسع حملة تقوم بها قوات الفاشية في كردستان" کە لە دێڕی دوایدا دەبێژێ: "فـاننا ندعـو مـرة اخـرى الى ضـرورة تجـاوز كل الخـلافـات والتناقضات الثانوية و توحيد كل الجهود الوطنية للنضال المشترك لاسقاط السلطة الفـاشـيـة لتـحـقـيق حكم الائتـلاف الوطني الديمقـراطي الذي يضـمن الاسـتقلال والديمقراطيـة للعراق وحق الشعب الكردي في تقرير مصيره بنفسـه". کەچی کـە سەرکردەکانی لەگەڵ کاربەدەستـانی رژێمی بەغدا کـەوتنەوە وتووێژ، ئەو رژێمـەی کـە خـۆیان بە فـاشـسـتـیـان دادەنا و دەیانویست بیـرۆخـێنن؛ وتووێژەکـەیان بەوە پاسـاو دا کە لەبەر خـاتری "سوپـای عێـراق" و یـەکـێـتـیی نیشتـمانیی عێراق؛ واتە پاراستنی "سنووری عێـراق" کردووە. ئەوجا "بڕیاری چارەنووسی نەتەوەی کورد" -واتە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان- لە کوێ و "خاتری سوپای عێراق" و "یەکێتیی نیشتـمانیی عێـراق" و پاراستنی سنوورە دەستکردەکـانی لە کـوێ؟ هەروەها راستـیی ئەم تەفـرەدانە لە خوێندنەوەی ئەو پیـلانەدا دەردەکـەوێ کـە "ی.ن.ک" لە سـاڵی ١٩٨٤ دا لە بارەی "ئۆتـۆنۆمی کـوردستـان"ەوە دابووی بە رژێمی بەعس، و تـەنانەت باسی کـەرکووکی تێـدا

نەکردبوو (٢٤) شایانی باس لێرەدا ئەوەیە هەرچەندە هوردە بۆرژوای کورد پاش هەرەسەکە، دروشمی "بڕیاری چارەنووس" ی لە "نەتەوەییەکانەوە" وەرگرت، بەلاّم نەتەوەییەکان هەر باسی بڕیاری چارەنووس بە رووتی ناکەن، بەلّکو دەلێن دەبێ ئەو بڕیارە "لە ئازادی دا و بۆ ئازادی" بدرێ کە لە شوێنی خۆیدا باسیدەکەم.

(ب)- هێندێک دەستەی هوردە بۆرژوای کورد، پاش هەرەسەکە، دانی بەوەدا نا کە کوردستان کۆلۆنییەکە و لەلایەن داگیرکەرانی ترک و عەرەب و فارسەوە دادەدۆشرێ. تەنانەت "کۆمەلّەی مارکسیی لینینی" دانی بەوەشدا نا کە چینی کرێکاری کوردستان هیچ جۆرە "بەرژەوەندییەکی نێو کۆیی" لەگەلّ چینی کرێکاری ترک و عەرەب و فارسدا نییە (٢٥) کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بیری کاژیکە و چارەکە چەرخێک لەمەوبەر گوتراوە.

(ج)- هوردە بۆرژوای کورد تێکڕا دانیان بەوەدا نا کە دەبێ بەڕێوەبەرانی بزووتنەوەی کوردایەتی پشت بە جەماوەری کورد و دەسەلاّتی گەلەکەی خۆیان ببەستن (٢٦)، نەک بە بێگانە. کە ئەمە یەکێک بوو لە بنچینە بیرییەکانی کاژیک و لە کاژیکنامەدا باسکراوە (٢٧).

(د)- دان بەوەدا نرا کە داگیرکەرانی کوردستان هەموو بەرامبەر مەسەلەی کورد یەک هەلّوێستیان هەیە، با لە نێو خۆشیاندا ناکۆک بن. ئەمەش بەندێکە لە بەندەکانی کاژیکنامە (٢٨).

(هـ)- هەلّبژاردنی شێوەی کارکردنی نهێنی لە جیاتی کارکردنی ئاشکرا(٢٩). کە ئەمەش شێوەی بنەڕەتی کارکردنی کاژیک و بیری نەتەوەییە(٣٠). بەلاّم دەبێ ئەوە بزانین؛ هەرچەندە بۆرژوای کورد دوای هەرەسەکە بە ناچاری رووی لەم جۆرە شێوازە نهێنییە کرد، بەلاّم ئەوەی راستی بێ، هەر کاتێک ماوەی درابێتێ بە ئاشکرا کاریکا کردوویەتی. هەرچی بیری نەتەوەیی کوردییە، پێی وایە هیچ کاتێک بە ئیجازەی داگیرکەرانی کوردستان کار بۆ مەسەلەی کورد و کوردستان ناکرێ.

(و)- مارکسیستە هوردە بۆرژواکان پاش ئەوەی چل ساڵی رەبەق پێرەویی هیپۆتێزی ستالینیان کرد لەبارەی "نەتەوە"وە، ئەمجا هاتنە سەر ئەوەی وەکو کاژیک و بە پێچەوانەی هیپۆتێزی ستالینەوە - "ئابووریی نێوکۆیی" بە مەرجێک دانەنێن لە مەرجەکانی نەتەوە- بۆ وێنە، ئەو راپۆرتە سیاسییەی کە کاک سامی کاتی خۆی بۆ کۆنفرانسی بەرێوەبەرێتیی کاتی (قیادەی موقت) لە ساڵی ١٩٧٦ دا ئامادەی کرد بوو و کۆنفرانس بڕیاری لەسەر دابوو بە دانانی بە پرۆگرامی پارتی / بەرێوەبەرێتیی کاتی، لە ل .٨ دا دەبێژێ:

"فالارض المشتركة واللغة الواحدة والتأريخ المشترك والنفسية المشتركة التي تظهر في الادب والتراث التي هي من شروط الامة الواحدة كلها واضحة بينة في الامة الكردية".

بە کوردی: "سەرزەوینی نێوکۆ ویەکێتیی زمان ومێژووی نێوکۆ وهەستی دەروونیی نێوکۆ کە لە وێژە و کەلەپوردا دەردەکەوێ و لە مەرجەکانی نەتەوەیەکن، هەموو ئاشکرا ودیارن لە نەتەوەی کورددا".

وەک دەبینین باسی "ئابووریی نێوکۆیی" خراوەتە پشتگوێ، ئەگەرچی پرۆگرامی بەرێوەبەرێتیی کاتی پارتی "وەک حیزبێکی مارکسی لینینی" تاریف دەکات.

هەروەها راپۆرتی کۆمیتەی نێوەندیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران بۆ کۆنگرەی چارەم دەبێژێ:

"در نتیجه کرد تمام شرایط لازم یک ملت را داراست.. زیرا که سه علت مهم و بنیادی وجود یک ملت که عبارتند از زبان مشترک، سرزمین مشترک، خصلت وشیوهء زندگی مشترک که کاملا در مورد کرد صدق میکند، والبته زندگی مشترک اقتصادی هم اغلب به یک شرط مهم برای یک ملت بحساب نمی اید".

به کوردی: "لە ئەنجامدا کورد هەموو مەرجە پێویستەکانی نەتەوەیەکی هەیە

چۆنکە سێ هۆی گرنگ وبنچینەییی بوونی نەتەوەیەک کە، بریتین لە زمانی نێوکۆیی وخو ورەشت وهەڵسوکەوتی وەک یەک لە ژیاندا، هەموو بە سەر کورد دا دەچەسپێ. دیارە ژیانی ئابووریی نێوکۆیی بەزۆری بە مەرجێکی گرنگ بۆ بوونی نەتەوەیەک نایەتە ژمارە"

(٣)- دروشمی "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان" و "دیمۆکراسی" بۆ ئەو وڵاتەی پارچە کوردستانەکە نووسێنراوە پێوەی، وەک عێراق، یان ئێران، یان... هتد، کە شۆرشی ئەیلوول هەڵیگرتبوو، هەروەک خۆی مایەوە. بەڵام ئەم جارەبە شێوەی "ئۆتۆنۆمیی راستەقینە"، ئەگەرچی سنوور و تایبەتکارەکانی "ئۆتۆنۆمیی راستەقینە" هەتا ئێستە دیارینەکراون.

## ٥- ئەو بەڵگانەی کە لە دژی سەربەخۆبوونی کوردستانن

### أ- کورد تا ئێستە دەوڵەتی نەبووە، لەمەو دواش نابێ بیبێ

یەکێک لەو بەڵگانەی کە لە دژی سەربەخۆییی کوردستان دەخرێتە پێش چاو ئەوەیە کە گوایە کورد لە کۆندا هیچ کاتێک دەوڵەتێکی نەبووە، جا لەبەر ئەوەی لە رابوردوودا و تا ئێستەش هەروا بووە، دەبێ لەمەولاش هەر وابێ. ئەم بەڵگەیە بە تایبەتی لەلایەن داگیرکەرانی کوردستان و ئەو هێزانەوە دەهێنرێتە پێش کە پشتی ئەم داگیرکەرانە دەگرن. بۆ وێنە لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە ساڵی ١٩٦٥دا لە قاهیرە بە سەرۆکایەتیی ناسر کرا؛ بۆ ئاڵوگۆر کردنی بیری ناسیۆنالیستە عەرەبەکان. سەرۆکی وەفدی عێراق دکتۆر عەبدولعەزیز دووری مامۆستای مێژوو لە زانستگەی بەغدا گوتی:

"تا ئێستە لە مێژوودا هیچ میرنشینێک یان دەوڵەتێکی کوردی پەیدا نەبووە و نێوی کوردستانیش نێونکە لەم دواییەدا پەیدا بوو... هتد" (٣١).

بۆ دەمەتەقێ لەگەڵ ئەم بەڵگەیەدا جارێ دەبێ بزانین کە "دەوڵەت" لە رۆژانی کۆندا؛ مانا و واتە (مفهوم)ی ئەمرۆی بە هیچ جۆرێک نەبووە. دەوڵەتی کۆن، بە تایبەتی لە رۆژهەڵاتدا، بریتی بووە لە فەرمانرەواییی تاکە کەسێک، یان تاکە خێزانێک بەسەر نێوچەیەکدا، یان بریتی بووە لە فەرمانرەوایی و

سەرکردەییی تیرەیەک بەسەر چەند تیرەیەکی دیدا. ئەوجا پەیدا بوونی ئەم دەزگەی فەرمانڕەوایییە؛ بەهۆی سەرکردەیەتیی خێزانێکی خانەدانەوە بووبێ، یان بە هۆی سەرکردەیەتیی بەرەبابێکی ئاینییەوە بووبێ، یان بەهۆی سەرکەوتنێکەوە بووبێ لە مەیدانی شەڕدا، ئەوا ئەو دەوڵەتەی لە ئەنجامدا دامەزراوە، بەزۆری بەنێوی ئەو خێزانەوە، یان ئەو تیرەیەوە، یان ئەو بەرەبابەوە نێونراوە کە فەرمانڕەوایی کردووە. بۆ وێنە: دەوڵەتی ئەمەوی (٦٦١/٦٦٢-٧٥٠) و عەبباسی (٧٥٠-١٢٥٨) بەنێوی بنەماڵەی ئەمەوییەکان و عەبباسییەکانەوە بووە؛ نەک بەنێوی گەلی عەرەبەوە. هەروەها دەوڵەتی عوسمانی (١٢٩٩-١٩٢٤) و سەفەوی (١٥٠١-١٧٢٢) و قاجاری (١٧٩٤-١٩٢٥)یش بەنێوی بنەماڵەی عوسمان و سەفی ددین و قاجارەوە بوون نەک بەنێوی ترک و فارس و ترکمانەوە. جا ئەگەر ئەمانەی نێومان بردن دەوڵەتی کۆن بووبن لە ڕۆژهەلاتدا، ئەوا کورد دەوڵەتی لەم بابەتەی گەلێک هەبووە: وەک دەوڵەتی حەسنەوییە کە لە دەوروبەری ٩٥٩ دا دروستبووە، وُ دەوڵەتی دۆستەکی (٩٩٠-١٠٩٦) کە ئەمەی دوایییان پێوەندیی سیاسی و سوپایی بە دەوڵەتی بیزانتینەوە بووە. هەروەها لەم چەند سەتەیەی دوایشدا، کورد دەوڵەتی وەک سۆرانی بووە کە بە شایەتیی ئەو ئەوروپایییانەی بەوێدا تێپەڕیون وەک دوکتۆر رووس ی ئینگلیز، جۆری بەڕێوەبەرێتیی دەوڵەتی سۆران لە هی دەوڵەتی عوسمانی گەلێک رێکو پێکتر بووە (٣٢). هەروەها کورد دەوڵەتی وەک دەوڵەتی بۆتانی بووە کە لەشکری رێکو پێک و تۆپی گەورە و تفاقی جەنگی باشی بووە- و پێوەندیی بە ئەوروپاوە هەبووە، و بۆ یەکگرتنی هەموو کوردستان تێکۆشاوە. شایانی باسە کە هەتا ساڵی ١٥١٥ لە کوردستاندا گەلێک دەوڵەت هەبوون لە شێوەی میرنشیندا، کە بە سەربەخۆییی تەواوەوە فەرمانڕەوایییان کردووە و مێژووی ئەم دەوڵەتانە لە "شەرەفنامە"دا بە دوور و درێژی باسکراوە. ئێمە کە باسی ئەو دەوڵەتە کوردیيانە دەکەین چاو لەوە دەپۆشین کە بنەماڵەی ئەییوبییەکان بە سەرکردەیەتیی سەلاحەددین، کە بنەماڵەیەکی کورد بوون لە میسر و سووریا و گەلێک وڵاتی دیکەدا، دەوڵەتی بە دەسەڵاتی ئەییوبییان دامەزراندووە، و بنەماڵەی براخۆییەکان لە

بلووجستاندا دەوڵەتێکی گەورەیان دامەزراندووە. چۆنکە ئەم دوو دەوڵەتە لە کوردستاندا نەبوون. هەروەها چاو لەوەش دەپۆشین کە لە کوردستانی ئەمڕۆدا و حەوت سەت ساڵێک پێش هاتنی عیسا ئیمپراتۆرییەتێکی گەورە بە نێوی "ماد"ەوە دروستبووە، کە مادەکان بە قسەی گەلێک لە کەڵە ڕۆژهەڵاتناسەکانی وەک مینۆرسکی (١٨٧٧-١٩٦٦)، باوو باپیری کوردی ئەمڕۆ بوون. ئێمە باسی ئەمانە ناکەین و بەنێو بردنی ئەو دەوڵەتانەی لەم هەزار ساڵەی دواییەدا لە کوردستاندا دروستبوون بەس دەکەین. ئەوەش دەخەینە بەر چاو کە دەوڵەتی خوارووی کوردستان کە بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحمود لە ١٩١٨/١١/٢ دا دامەزرا و بەریتانیای گەورە لە ١٩١٨/١٢/١دا بە ڕەسمییەت ناسی، ئەمە چەند ساڵێک لەپێش ئەوەدا بوو کە دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی ترکیا دروست بێن.

بەڵام ئەگەر ئێمە بەم حسێبە و بەڵگەیە لێکیبدەینەوە، هەر کەسێک کە لە کۆندا دەوڵەتی نەبوویێ، ئەمڕۆش نابێ دەوڵەتی ببێ، ئەوا دەبوو ئەمڕۆ ترک دەوڵەتی نەبووایە، چۆنکە ئەم دەوڵەتەی ترک لە ١٩٢٣ دا دروستبوو، و ئەو دەوڵەتەی کە بەنێوی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانییەوە لە ١٢٩٩ ەوە تا ١٩٢٤ ژیا؛ دەوڵەتی ترک نەبوو، بەڵکو دەوڵەتێکی بنەماڵەیی بوو کە لە چەندین گەل و تیرە و ئاینێک پێکهاتبوو، و ئەوانەی بە ترکی قسەیان دەکرد، لە چاو عەرەب و کورد و ئەرمەن و لاز و چەرکەس و یۆنانی و بولگاری و ئەلبانی و.. هتد دا کەمایەتییەکی یەکجار کەم بوون. ئەمە بێجگە لەوەی لە کاتی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانیدا و هەتا کۆتاییی سەتەی نۆزدەیەمیش بە ترک دانە قەڵەم وەک جنێو وەها بوو کە بە یەکێکیان بگوتایە "تۆ ترکیت" زۆر پێی ناخۆش بوو دەیگوت "ئەز نەترکم، ئەز عوسمانیم". هەروەها لە پێش کودەتای ڕەزا خاندا لە ئێرانی ئەمڕۆدا، دەوڵەتێک بەنێوی "دەوڵەتی فارس"ەوە نەبوو. دەوڵەت بەنێوی بنەماڵەی قاجارەوە بوو. بنەماڵەی قاجارەکان ترکمان بوون، فارس نەبوون. لەپێش قاجارەکانیشدا زەندییەکان کە بنەماڵەیەکی کورد بوون؛ فەرمانڕەوا بوون. ئەوجا پێش ئەوانیش نادر شای هەوشار و سەفەوییەکان بوون؛ کە نادر شا کوردی هەوشار و سەفەوییەکانیش لە بنەماڵەیەکی شێخی

دەروێشی کورد بوون و فارس نەبوون. دەوڵەتی ناسیۆنالی ترک و فارس و عەرەب لەم سەتەیەدا دامەزران. ترکیا -وەک گوتمان- لە ١٩٢٣/١٩٢٤ دا دروستبوو. دەوڵەتی ناسیۆنالی فارس لە ئێراندا لە ١٩٢٥ دا دروستبوو. تەنانەت نێوی "ئێران" بە ڕەسمی لە ئەورووپا لە ساڵی ١٩٣٤ەوە خرایە کار. عێراق لە ١٩٢١دا دروستبوو، پاکستان لە پێش ساڵی ١٩٤٨دا پارچەیەک بوو لە هیندستان، و بەنگلادێشیش تا سەرەتای هەفتاکان پارچەیەک بوو لە پاکستان. گەلێک دەوڵەتی ئەفریقایی هەن کە لەم چەند ساڵەی دواییدا دامەزران. جا ئەگەر ئەمە وابێ، هەر کەسێک لە کۆندا دەوڵەتی نەبووبێ، نابێ ئێستەش دەوڵەتی ببێ، ئەوا دیارە هەر لەبەر ئەمە، نەدەبوو، نەک هەر ترک و فارس، بەڵکو دەبوو عێراق و پاکستان و بەنگلادێش و زۆر لە ئەفریقاییەکان دەوڵەتیان نەبێ. هەروەها ئەو کاتە پێچەوانەی ئەمەش هەر ڕاست دەبوو. با ئێمە لە کورد بگەڕێین کە باوو باپیرانیان ئیمپراتۆرێتییەکی وەک میدیایان دروستکردووە و بێینە سەر خەڵکی دی... مادام سریانەکانی ئەمڕۆ و ئەرمەنییەکانی ئەمڕۆ و قیبتییەکانی ئەمڕۆ و ئەوانەی لە لوبنان خۆیان بە فینیقی دەزانن، ئەمانە هەموو؛ نەوەی ئەو سریان و ئەرمەنی و قیبتی و فینیقییانەن کە لە کۆندا دەوڵەتی گەورە گەورەیان هەبووە، ئەی باشە بۆچی ئەمڕۆ دەوڵەتیان نییە و بۆچی ڕێگەیان نادرێ دەوڵەتیان ببێ؟ ئەوجا جوولەکەکانیش کە چەند هەزار ساڵێک لەمەوبەر دەوڵەتی بەنی ئیسرائیلیان دامەزراندووە، زۆریش بەهێز بوون و لە قورئانیشدا نێویان هەیە، ئەی بۆچی هەر ئەو عەرەبە شۆڤێنیستانەی وەک عبدالعزیز الدوری کە ڕێ لە کورد دەگرێ بە بیانووی ئەوەوە کە گوایە کورد لە کۆندا دەوڵەتی نەبووە، ئەمڕۆش نابێ بیببێ، ئەی بۆچی هەر ئەو عەرەبە شۆڤێنیستانە نایانەوێ ئیسرائیل دەوڵەتی هەبێ؟ خۆ ئیسرائیل لە کۆندا دەوڵەتی هەبووە! ئەوجا ترکە شۆڤێنیستەکانیش کە دەڵێن تا ئێستە کورد دەوڵەتی نەبووە، ئەی خۆ دەزانن کە ئەرمەنییەکان دەوڵەتیان هەبووە، ئەی بۆچی ڕێ نادەن بەوان کە ئەمڕۆ دەوڵەتێکیان هەبێ؟؟!

کەواتە ئەم بەڵگەیەی کە دەبێژێ ئەوەی لە کۆندا دەوڵەتی نەبووە، نابێ

ئەمرۆش دەوڵەتی هەبێ، تەنێ بیانووە و بە کورد دەگیرێ و بەڵگەیەکی بێ سەر و بنە، و راستییەکەشی ئەوەیە کە کورد لە کۆندا دەوڵەتی هەبووە، ئەگەر چی دەوڵەت بە نێوی کوردەوە نەبووە و بنەماڵەیی بووە. بەڵام ئێستەش با بێینە سەر ئەوەی بزانین ئایا ئەم بەڵگەیە خۆی لە خۆیدا ژێر بێژانەیە؟

ئەوی دەڵێ هەر گەلێک لە کۆندا دەوڵەتی نەبووبێ، ئەمرۆش نابێ بیبێ، دیارە "پێوانە"ی ئەو کەسە "کۆنی"یە و لای وی هەموو شتێک دەبێ "کۆن" بێ و "لەکۆنەوە" بووبێ، ئەگەنا مافی ژیانی نییە. راستە کورد دەڵێ "هەر کۆنە بەگیرە"، بەڵام ئەمە لە هەموو بارێکدا راست نییە. هەموو "کۆنەیەک" وەک "شەراب" نییە، تا کۆنتر بێ نرخی پتر بێ. خواردن و خواردنەوە تا کۆنتر بن؛ خراپتر و بێکەڵکتر دەبن. مرۆڤ هەتا پیرتر بێ، بێهێزتر و پەرپووتتر دەبێ. خانوو بینا تا کۆنتر بن زووتر دەتەپێن. بەڵام دوور نییە هێندێک بڵێن: "دەوڵەت" شتێکی "مەعنەوی"یە وەک ئەمانەی سەرەوە ماددی نییە. بەڵێ... ئەگەر "دەوڵەت" بە شتێکی "مەعنەوی" ، واتە بە "ویستەی کۆمەڵێک خەڵک" بدرێتە قەڵەم بۆ پێکەوە ژیان، ئەوا دەبێ بزانین کە پێویستە ئەو "ویستە"یە سەرەتایەکی دەربڕین، واتە کاتێکی دەستپێکردنی هەبێ. ئەوانەی چەند هەزار ساڵێکە دەوڵەتیان هەیە، وەک یۆنانییەکان، رۆژێک لە رۆژان دەستیانکردووە بەوەی ویستەی خۆیان دەربڕیوە، و هەموو کارێکیش دەبێ سەرەتای دەستپێکردنی هەبێ، و هەموو هاتنە بوونێکیش سەرەتایەکی دەستپێکردنی پێویستە، هەموو مرۆڤێک کاتێکی لەدایکبوونی هەیە و کەس ناتوانێ بەڵگە بهێنێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانەی تا ئێستا لە دایک نەبوون، نابێ ئێدی لە دایک بن. ئەو شتەی کە سەرەتای دەستپێکردن و کۆتاییهاتنی نییە، واتە لە "ئەزەل" ەوە تا "ئەبەد" (لە هەتاوە تا هەتا) بووە و هەیە و دەبێ، ئەوە هەر خودێیە. جا لەبەر ئەوەی دەوڵەت دەستکردێکی مرۆڤە، دەبێ سروشتێکی مرۆڤانەی پێوە بێ، نەک سروشتێکی ئێزدانی. واتە دەبێ سەرەتایەکی دەستپێکردنی بێ کە ئەو سەرەتایەش ویستەی دەستپێکەران دیاریدەکات.

دروستکردنی دەوڵەت، هەر دەوڵەتێک بێ و هەر گەلێک دروستی بکات هەر

مانای سەربەخۆییە. سەربەخۆییش بەبێ بوونی ئازادیی بڕیاردان و ئازادیی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە بەکردەوە، نایەتە دەست. بوونی ئازادیش پێویستی بە بوونی دەسەڵاتە. ئەوی بێ دەسەڵات بێ، دیارە ئازاد نییە و ئەوی ئازاد نەبێ، دیارە دەسەڵاتیشی نییە. ئازادی و دەسەڵات تەواوکەری یەکن، لەبەر ئەوە ئەوانەی دژی سەربەخۆییی کوردستانن، مانای ئەوەیە دژی ئەوەن کە کورد، دەسەڵاتی بەقەد دەسەڵاتی ئەو گەلانە بێ کە کوردستانیان دابەشکردووە و دەوڵەتی خۆیان هەیە. بەکورتی ئەوانە دژی ئەوەن کە ئازادیی کورد هێندەی ئازادیی ئەو گەلانە بێ کە کوردستانیان لە خۆیان بەشکردووە. واتە ئەوانە گەلی کورد لە گەلانی ترک و فارس و عەرەب بە کەمتر دەزانن، ئیدی با هەزار و یەک جار باسی "برایەتی" بکەن.

جا لەبەر ئەوە ئەو بەڵگەیەی کە دەبێژێ: ئەوی لە کۆنەوە دەوڵەتی نەبووە، نابێ ئەمڕۆش بیبێ، مانای وایە ئەوی لە کۆندا لە سەربەخۆییدا ئازاد نەبووە، ئەمڕۆش نابێ لەوەدا ئازاد بێ. ئەمەش بەڵگە دەداتە دەست ئەوانەی دەسەڵاتیان هەیە و لەو ڕووەوە ئازادن، تا ڕێ بە گەلە بێدەسەڵاتەکان نەدەن دەسەڵات پەیدا بکەن و ئازاد بن، و هەر بەم بەڵگەیەش بەربەرەکانێی ئەو گەلە بێدەسەڵاتانە بکەن. بەڵام تاقیکردنەوە پێشانیداوە کە ئەم بەڵگەیە هەتا ئەو کاتە بڕ دەکات کە ئەو گەلە جارێ نەیتوانیوە دەوڵەتی خۆی دروستبکات. کاتێ ئەو گەلە بێ دەوڵەتە دەوڵەتی خۆی دروستکرد، ئەو دەمە بەڵگەکە، یان دەستبەجێ، یان بەرەبەرە، نامێنێ و هەر ئەو دەسەڵاتدارانەی کە دوێنێ دەیانگوت ئەوی دەوڵەتی نەبووە نابێ بیبێ، کاتێک دەبینن تێکۆشانی گەلە بێدەوڵەتەکە گەیشتووەتە هەندازەیەک کە بەری دەسەڵاتی ناگیرێ، دەچن دان بە واقیعدا دەنێن و ئەم بەڵگەیە ئیدی ناهێننە پێشەوە. بۆ وێنە: فەرەنساییەکان لە سەرەتاوە بە هەموو جانەوەرێتییەکەوە دژی گەلی جەزائیر دەجەنگان، کاتێک زانییان پێیاناناکرێ، ناچار بوون دانبنێن بە سەربەخۆیی جەزائیردا و ئەو بەڵگەیەی کە دەیگوت جەزائیریەکان "کۆن" دەوڵەتیان نەبووە و "پارچەیەک" بوون لە فەرەنسا، ئەو بەڵگەیە نەما. کاتێک کە بەنگالییەکان ویستیان لە پاکستان جیان ببنەوە، پاکستانییەکان بە هەموو جانەوەرێتییەکەوە

دژی گەلی بەنگالی وەستان. کە هیندستان لەشکری ناردە بەنگالەوە و لەشکری پاکستانی بەزاند، پاکستان ناچار بوو دانبنێ بە سەربەخۆیی بەنگالدا و ئەو بەڵگەیەی کە دەیگوت بەنگاڵ "بەشێک" بووە لە پاکستان و "دەوڵەتی" نەبووە و نابێ بیبێ، نەما. هەروەها ترکە شۆڤێنییەکان بە سەرۆکایەتیی ژۆن ترک جەمال پاشای سەففاح، لە ماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، ژمارەیەکی زۆر عەرەبیان لە سووریا خنکاند لەبەر ئەوەی داوای سەربەخۆیی وڵاتی عەرەب و جیابوونەوەی لە ئیمپراتۆریتیی عوسمانییان دەکرد، کەچی کە عەرەبەکان سەربەخۆیی خۆیان دەسکەوت، ئەوجا ژۆن ترکەکان ناچار بوون دانبنێن پێیاندا و بەڵگەی باسکراو نەما. کە ئیسرائیل خەریک بوو ببێ بە دەوڵەت لە ١٩٤٨/٥/١٤ دا هەمموو عەرەب بەربەرەکانێیان کرد، و بە تایبەتی میسر، بە بیانووی ئەوەوە کە دەوڵەتی نەبووە و نابێ بیبێ، کەچی ئەوەتە ئەمڕۆ میسر لەگەڵ ئیسرائیل پەیمانی کەمپ دیڤیدی بەستووە و گەلێک لە دەوڵەتە عەرەبەکانی دی دەمودوانییان بەرامبەر ئیسرائیل وەک جاران نەماوە و هاکا ئەوانیش لەگەڵی رێککەوتن.

بەمەی سەرەوەدا دەردەکەوێ؛ ئەو بەڵگەیەی کە دەبێژێ: "ئەوی دەوڵەتی نەبوویێ، نابێ لەمەو دواش بیبێ"، هەر پاش دامەزراندنی دەوڵەتەکە، زوو یان درەنگ، نامێنێ. واتە ئەو بەڵگەیە تەنێ مەسەلەی دەسەلاتە. دەبێ ئەوەش بزانین کە هەمموو جۆرە سەربەخۆیینەک -وەک لەمەوبەر گوتم- بریتییە لە دەستکەوتنی جۆرە دەسەلاتێک. بۆ وینە: تەنانەت مەسەلەی "ئۆتۆنۆمی"ش هەر وایە. "ئۆتۆنۆمی" کە بریتییە لە سەربەخۆییەکی کەچوکەل، لە دەسەلاتێکی سنووردار بەولاوە چی دی نییە. ئەو بەعسییانەی کە لە نێوەڕاستی پەنجاکانەوە هەتا کۆتایی پەنجاکانیش دژی ئەوە بوون کە نێوی کورد بە هیچ جۆرێک ببرێ، ناچار بوون لە ١٩٦٣ دا لە ترسی پێشمەرگەی کورد و لە بێهێزی خۆیان؛ باسی "لامەرکەزییەت" بکەن و لە ١٩٧٠ دا ناچار بوون باسی "ئۆتۆنۆمی"ش بکەن. ئەوەش بە ڕۆنی دیارە کە کورد هەر لە عێراقدا -درۆ یان ڕاست- بۆیە دەتوانێ باسی "ئۆتۆنۆمی" بکات، چۆنکە هەر لە عێراقدا توانیویتی تا هەندازەیەک "دەسەلات"ی خۆی بسەپێنێ بەسەر

داگیرکەرانی وڵاتەکەیدا.

### ب- سەربەخۆیی کوردستان مانای بێهێزی پرۆلیتاریای ترک و فارس و عەرەب و کوردە

ئەوانەی ئەم بەڵگەیە دەهێننە پێشەوە، دەبێژن کە سەربەخۆیی کوردستان، مانای جیاکردنەوەی پرۆلیتاریای کوردە لە پرۆلیتاریای ترک و فارس و عەرەب و، ئەمەش مانای بێهێزکردنی چینی پرۆلیتاریای ئەو وڵاتانەیە کە کوردستان نووسێنراوە پێیانەوە، ولە ئەنجامدا خزمەتێکە بۆ ئیمپریالیزم و سەرمایەداری و کۆنەپەرستی.

ئەم بەڵگەیە؛ بەتایبەتی بەڵگەی کۆمۆنیست و مارکسیستەکانە، و زۆر بە تایبەتی تر، هی ئەو داوودەزگە کۆمۆنیست و مارکسیستانەیە کە لەسەر هێڵی سیاسەتی حیزبە کۆمۆنیستەکانی عێراق و ئێران و ترکیا و سووریا دەچن بەرێوە؛ کە هەر لەکۆنەوە خۆیان بە هاوهێڵی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێت و یەکێتیی سۆڤێت زانیوە و دەزانن. بۆ توێژینەوەی ئەم بەڵگەیە جارێ با ئێمە لەوە بگەڕێین کە ئایە لە کوردستان یان لە عێراق یان لە ترکیا یان لە ئێران یان لە سووریا چینێکی "پرۆلیتاریا"ی، بەو جۆرەی مارکس بۆی چووە، ئەمڕۆ هەیە یان نا؟ جارێ لەوە بگەڕێین، بەڵام ئەوەی زۆر ئاشکرا و ڕۆنە ئەوەیە، ئەم چوار دەوڵەتەی نێومان بردن -وەک لەمەوبەر گوتم- هەموو لەپاش جەنگی جیهانیی یەکەم دروستبوون: عێراق لە ١٩٢١دا، ترکیا لە ١٩٢٣/١٩٢٤دا، ئێران لە ١٩٢٥دا، سووریا لە ١٩٤٦دا، واتە کوردستان هەر پاش جەنگی جیهانیی یەکەم لەم دەوڵەتە ناسیۆنالانە بەشکرا. جا ئایا ئەو کاتەی کە کوردستان بەسەر ئەماندا بەشکرا، پرۆلیتاریای پیشەسازی -وەک چینێک- لەم وڵاتانەدا هەبووە؟ بێگومان، نا. ئەم وڵاتانە هەموو وڵاتی کشتوکاڵی و هۆزایەتی و دەرەبەگایەتی بوون و سەرمایەداری و پیشەسازییان تێنەکەوتبوو. لە جێیەکیشدا کە سەرمایەدار و فابریقە نەبێ، دیارە پرۆلیتاریای کارکەر دروستنابێ. دوایی ئەوی مێژوو بزانێ، دیارە ئەوەش دەزانێ کە ئەم ترکیایەی ئەمڕۆ بەپێی پەیمانی لۆزان دروستبووە؛ کە ئیمزاکەرەکانی ئینگلیز و فەڕەنسا

و ئیتالیا بوون. ئەوی سووریای ئەمڕۆی دروستکرد، فەرەنسا بوو. ئەوی عێراقی ئەمڕۆی دروستکرد؛ بەریتانیا بوو. ئایە، بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا کە سێ دەوڵەتی کۆڵۆنیالیست بوون، ئەم چوار دەوڵەتەیان لە ڕۆژهەڵاتی نێزیکدا دروستکرد و کوردستانیان دابەشکرد بە سەریاندا، بۆ خزمەتی پرۆلیتاریای عەرەب و ترک و فارس و کورد ئەمەیان کرد؟ ئایە کۆڵۆنیالیستەکان ئەم دەوڵەتە دەستکردانەیان بۆ ئەوە دروستنەکرد کە لە هەموو وڵاتێکیاندا چەند گەلێک هەبن، هێندێکیان زۆرێتی و خاوەن دەزگەی دەوڵەتی و دەسەڵاتدار، و کوردیش لە نێوانیاندا وەک "کەمایەتی"یەکی بێدەوڵەت و بێدەسەڵات، تاکو شەر و ئاژاوەی نێوخۆیی هەڵبگیرسێ و ئەم نەتەوانە بەربەرەکانێی یەکدی بکەن و ببنە دوژمنی یەک، و ئەوجا ئەو دەمە پرۆلیتاریای کورد و عەرەب و کورد و ترک و کورد و فارس بە چاوی دوژمنایەتی و کینەوە تەماشای یەک بکەن، نەک بە چاوی هاو چینایەتی و هاودەردی؟ ئەوانەی کە لەو باوەڕەدان کە ئەم دۆخەی ئێستە هەیە و بووەتە هۆی تێکڕژانی گەلانی نێوچەکە، خزمەتی پرۆلیتاریای ئەو گەلانە دەکات و هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبێ سنووری ئەم دەوڵەتانە وەک خۆیان بمێننەوە، دیارە ئەوانە دەبێ دان بەوەشدا بنێن کە بەرەی کۆڵۆنیالیستەکانی ڕۆژاوا، پاش جەنگی جیهانیی یەکەم، کارێکی زۆر باشیان کردووە کە کوردستانیان وا بەشبەشکردووە و هەر بەشەیان خستووەتە سەر دەوڵەتێک، و ئەمەشیان بۆ خزمەت و بەهێزکردنی پرۆلیتاریای ئەو گەلانە کردووە، و ئەوجا کە ئەمەشیان گوت، ئەو دەمەش هیچ هەقێکیان نامێنێ کۆڵۆنیالیزم و ئیمپریالیزمی بەرەی ڕۆژاوا بە خراپ و تاوانبار بدەنە قەڵەم، بەڵکو دەبێ ئافەرینیان لێبکەن.

دوایی، ئایا ئەو هێزەی کە سالانی ساڵ و هەتا ئەمڕۆش، بە هەموو ڕێیەکی قانوونی و نا قانوونی، هەر لە ڕێی ڕاستەوخۆ بەکارهێنانی هێزی سوپاوە بیگرە تا دەگاتە ڕێی بەستنی پەیمانی سەعد ئاباد و پەیمانی بەغدا و ئەوجا سەنتۆ وە؛ سنووری دەستکردی ئەم دەوڵەتانەی پاراستووە، بەریتانیا نەبووە و نییە؟ ئایا ئەو هێزانەی کە ئەمڕۆ بە هەرەشەو گوڕەشە و زۆری چەک سنووری ترکیا و ڕژێمە دژ بە ئازادییەکەی دەپارێزن، هێزەکانی ناتۆ و لە پێش

هەمووشیانەوە ئەمریکا نییە؟ ئەوجا ئایە ئێستە بەریتانیا و ئەمریکا و هەموو لایەنەکانی پەیمانی ناتۆ، ئەم سنوورە دەستکردەی ترکیا لەبەر خاتری چاوی کاڵی پرۆلیتاریای ترک و کورد دەپارێزن؟ کە ئەمریکا و فەرەنسا لەم دواییەدا کەوتوونەتە یارمەتیی سەدام و دەیانەوێ بە دەست و بە دان و بە پێ لە کەوتن بیپارێزن، لەبەر خاتری "پرۆلیتاریای عێراقی" ئەمە دەکەن؟ ئایا ئەمریکا هەر خۆی نەبوو کە تا ساڵی ۱۹۸۰ رژێمی بەعسی عیراقی خستبووە لیستەی تیرۆریستەکانەوە؟ ئایا ئەم هەڵوێستە تازەیەی ئەمەریکا بۆ خزمەتی پرۆلیتاریای عێراقە؟ یان بۆ خزمەتی عەرەبە زۆنگاونشینەکانی دەور و بەری جبایش و تەرراپەیە؟

ئەمجا ئەوانەی پێیان وایە کە دامەزراندنی کوردستانێک، گەلی کورد لە گەلانی عەرەب و ترک و فارس جیا دەکاتەوە، و پرۆلیتاریای کوردیش بێهێز دەکات، دەبێ ئەوانە بزانن کە پێکەوە ژیان و دەوڵەت پێکەوەنان و تێکۆشانی نێوکۆیی، بە زۆرەملێ نابێ. کە شەش کەس لە خانوویەکی شەش ژووریدا ژیان و رێی ئەوەیان نەدرایە هەر یەکەیان ماڵی خۆی جیا بکاتەوە، مانای وا نییە کە تێپەربوونی کات دەیانکاتە برا و هەڤاڵی یەک، یان دوو کەس کە ماڵیان جیابوو، مانای ئەوە نییە کە حەز لە چارەی یەکدی ناکەن و نایانەوێ پێکەوە هاوکاری بکەن. دوایی وەک کوردەکە دەڵێ: "کوێر کوێر نابات بەرێوە"، هەروەها دیلێکیش ناتوانێ یارمەتیی دیلێکی دی بدات. گەلێکی کوردی ئازاد کە دەوڵەتێکی سەربەخۆی ئازادی هەبێ، واتە دەسەڵاتی هەبێ، ئەو گەلەیە کە دەتوانێ یارمەتیی گەلانی ژێر دەستە بدات، بەتایبەتی گەلانی دەرو دراوسێی کوردستان، وەک ترک و عەرەب و فارس بە تایبەتی زەحمەت کێشان و بەشخوراوانی ئەو گەلانە کە لە چارەڕەشیی خۆیان، دووچاری فەرمانڕەوایانی تۆتالیتێر و ملهوڕ بوون. ئازادیخوازانی عەرەب و ترک و فارس و هەموو ئەوانەی لە بەرەی بەرهەڵستکەرانی ئەم گەلانەن، و لەنێو ئەوانەشدا تەنانەت هی واش هەبووە و هەیە کە دژی سەربەخۆیی کوردستان و ئازادیی کوردن، ئەمانە هەموو زۆرباش دەزانن؛ کە لە ماوەی بیست ساڵی رابوردوودا، هەر کاتێک لێیان قەوما بێ و لەلایەن رژێمی دەوڵەتەکانی

خۆیانەوە راوەدوو نرابن، پەنایان بردووەتە بەر پێشمەرگەی کورد و چیاکانی کوردستان، و نەتەوەی کورد باوەشی بەزەیی کردووەتەوە بۆیان و دالدەی داون، بێ ئەوەی بنوارێتە هەلوێستی ساسیبیان، یان رووپەرەی رابوردوویان.

جا ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەمرۆ کوردستان دەولەتێکی سەربەخۆ نییە و ئەو یارمەتییەی پێشکێش کردووە بەو پەنابەرانەی کە لە رۆژانی هاویندا لەژێر سێبەری دار گوێزەکانی کوردستاندا پێرادەکێشن و هێندێکیشیان خەون بەچێنشینێتیی سەددام و خامەنەییەوە دەبینن، و لە زستاندا دەچنە نێو کۆختەی جۆتکارە رووتەکانی کوردستانەوە و نانەرەقەکەیان لەگەل دەکەن بە دوو کەرتەوە، و هێندێکیشیان کوردستان بە خاکی عەرەب و فارس و ترک دەدەنە قەلەم، ئەمە بێ ئەوەی تۆزقالێک لە مافی پەنابەرێتییان کەمبووبێتەوە. ئەمە ئەمرۆ وایە، ئەوجا ئەگەر کوردستان سبەی رۆژێک ببێتە دەولەتێکی ئازادیخوازی سەربەخۆ، دەبێ ئەو دەمە چ خزمەتێک بە گەلانی نێوچەکە و مرۆڤی بەشخوراوی ئەم جیهانە پێشکێش بکات. دوایی کێ دەلێ سەربەخۆییی کوردستان مانای جیابوونەوە و ئاشتو ماشتی گەلی کوردە لەو نەتەوانەی لە نێوچەکەدا دەژین؟ ئەوانەی ئازادیخوازیش نین، لە یەک خانووی خرداخراویشدا بژین بەر دەبنە گیانی یەک.

جا کە کۆمۆنیستەکانی دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، و بەتایبەتی کۆمۆنیستە عێراقییەکان، لەم رووەوە و بەو بەلگەیەی لە سەرەوە باسمکرد، زۆر بە کول و دلەوە لە دژی سەربەخۆبوونی کوردستان بوون و لە نێوەراستی چلەکانەوە تا نێوەراستی پەنجاکان دەیانگوت: کورد "نەتەوە" (امة) نییە -وەک دوایی باسی دەکەم- و جاری واش بووە، گەلێک خەستو خۆلتر لە راستەوە شۆڤێنیستەکانی عەرەب و ترک و فارس دژی ئەو کوردانە وەستاون کە باسی سەربەخۆییی کوردستانیان کردووە، بەو بەلگەیەی گوایە "جیابوونەوەی کوردستان" و "سەربەخۆبوونی کوردستان" پیلانی ئیمپریالیستەکانە" بۆ "بێهێزکردنی خەباتی پرۆلیتاریا"ی ئەم گەلانە، لە کاتێکدا کە -وەک خستمە بەر چاو- هەلوێستی ئیمپریالیستەکان هەموو دژی

سەربەخۆبوونی کوردستان بوو، و تا ئەمڕۆش. جا لەبەر ئەوەی کۆمۆنیستەکان، بە پێچەوانەی شۆڤێنیستە ڕاستڕەوەکانەوە، جارو بار لەباری سەرنجی خۆیانەوە، باسی "مافی بڕیاری چارەنووسی گەلان" دەکەن، ئەوا ناچار بوون لە مەسەلەی کورددا، ڕێیەک بدۆزنەوە، کە بکەوێتە نێوان ئەو شتانەوە کە بە دەم باسی دەکەن و ئەو شتانەی کە بە کردەوە دەیخەنە ڕوو. بۆ ئەمەش -وەک لەمەوبەر گوتم- باسی "یەکگرتنی بە ئارەزوو"ی کورد و ئەو گەلانە دەکەن کە کورد لە ژێر سایەی دەوڵەتەکانیاندا دەژی، بۆ وێنە: هەرچەندە کۆمۆنیستەکانی عێراق لە کۆنفرانسی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٦ یاندا باسی ئەوەیان کرد کە "کورد نەتەوەیەکە مافی بڕیاری چارەنووسی خۆی هەیە لە ڕزگاربوون و یەکێتیی ناسیۆنالدا وەک عەرەب"، هەروەها کۆنفرانس "سەربەخۆیی نێو خۆیی" (الاستقلال الذاتي)ی کوردستانی بە "چارەسەرکردنێکی کاتی" دانا کە "ناتوانێ جێی مافی بڕیاری چارەنووسی نەتەوەی کورد بگرێتەوە" (٣٣) کەچی لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، پاش کودەتای قاسم لە ١٩٥٨/٧/١٤ دا و دوای ئەوەی لە عێراقدا دەسەڵاتیان بۆ پەیدا بوو، ئەوجا نەک هەر باسی "بڕیاری چارەنووس و جیابوونەوە"یان نەکرد و بەس، بەڵکو تەنانەت دژی "ئۆتۆنۆمی"ش وەستان و کەوتنە باسی "یەکگرتنی بە ئارەزوو" و دەیانگوت کورد و عەرەب لە عێراقدا بە ئارەزووی خۆیان یەکیان گرتووە لە ژێر سەرکردەیەتیی قاسم دا. لە کاتێکدا دەیانزانی کە عێراق بەریتانیا دروستیکردووە و لەو گشتپرسی (استفتاء)یەدا کە "دەستەی نەتەوەکان" (عصبة الامم) لە ١٩٢٥ دا کردی؛ خەڵکی سلێمانی و کەرکووک بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەنگیاندا و خەڵکی هەولێر و مووسڵیش، بە مەرجێک دەنگیاندا بۆ عێراق؛ کە کورد حکوومەتێکی خۆیی هەبێ. ئەوجا لەو کاتەشەوە و تا ئەمڕۆش، هیچ گشتپرسییەک لە کوردستاندا نەکراوە تا بزانرێ ئایە کورد بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ عەرەبدا و لە سنووری عێراقدا یەکدەگرێ یان نا؟ ئەمە تا ئێرە هەڵوێستی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق بوو، حیزبی توودەی ئێرانیش لە دەورانی شادا جارو بارێک باسی مافی کوردی دەهێنایە پێشەوە، بەڵام لە پاش دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی؛ بە هەموو هێزێکەوە

بوو بە دەسکەلای دەستی رژێم و کەوتە خراپەکاری دژی نەتەوەی کورد و دەستێکی بالاشی هەبوو لە دوو کەرتکردنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێراندا. حیزبی کۆمۆنیستی ترکیاش کە لە بیستەکاندا بە خۆی و رۆژنامەکەیەوە Aydinlik کوتەکی دەستی ئەتاترک بوو دژی بزووتنەوەی سەربەخۆییخوازانەی کورد و بەتایبەتی "ئایدنلک" شۆرشی سالی ۱۹۲٥ ی دیاربەکری بە فیتی بەریتانیا دەدایە قەلەم، و بەلای هەلوێستی دیکتاتۆرانەی ئەتاترکدا دایدەتاشی. خۆ ئەوە حیزبی کۆمۆنیستی سووریا هەر بە جارێ باسی مەسەلەی کورد ناکات، وەک ئەوەی لە سووریا نە کورد هەبێ و نە کوردستان. بەرامبەر بەم قورو قەپە لە مەسەلەی کورد، سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سووریا خالید بەگداش لە سالی ۱۹٦٦دا، بە رۆژنامەی "اخبار الیوم"ی گوتبوو "یەکێتیی عەرەبی بڕبڕەی پشتی سیاسەتی کۆمۆنیزمە" (۳٤). ئەمە لە کاتێکدا کە حیزبی کۆمۆنیستی سووریا لە حکوومەتی بەعسیدا بە سەرۆکایەتیی یوسف زعین هەتا ۲۹/۱۰/۱۹٦۸ وەزیرێکی هەبوو بەنێوی سمیح العطیە، بەلام یەک وشەی لە دژی سیاسەتی "پشتێنی عەرەبی" (الحزام العربي) بە دەمدا نەهات.

شایانی باسە کە هەلوێستی کۆمۆنیستەکانی ئەو ولاتانەی کوردستان نووسێنراوە پێیانەوە، هەرچی چۆنێک بووبێ بەرامبەر بە نەتەوەی کورد، رژێمی ئەو دەولەتانە زۆر دڕندانە پەلاماری کۆمۆنیستەکانیان داوە. ئەتاترک و رەزاخان لە کۆتاییی سییەکاندا هەریەکەیان قانوونێکیان دەرکرد بۆ راوەدوونان و سەرکوتکردنی هەموو بزووتنەوەیەکی کۆمۆنیستانە. عێراق لە دەورانی شایەتی و تەنانەت دەورانی قاسم و بە تایبەتی لە دەورانی بەعسییەکاندا خوێنی سەتان کۆمۆنیستیان رژاند. ئەوەی رژێمی ئیسلامی ئێران بەسەر حیزبی تودەی هانی، وەک کوردەکە دەلێ "با بە دەواری شڕی ناکات". لەبەر ئەوە ئەم هەلوێستەی دژ بە سەربەخۆییی کوردستانی کۆمۆنیستەکان، تا ئێستە نە بە سووتی کۆمۆنیستەکان خۆیان بووە، و نە بە سووتی زەحمەتکێشانی نێوچەکە بووە، و تەنێ بە سووتی رژێمە دیکتاتۆرەکانی ئەو ولاتانە بووە کە دوژمنی کوردیش و کۆمۆنیستیشن.

## ج- هەر دەوڵەتێک شتێکی پیرۆزە، نابێ کەرتکەرت بکرێ

ئەم بەڵگەیە هی ئەوانەیە کە "دەوڵەت" بە شتێکی "پیرۆز" دادەنێن و ئەوی پارچەیەک جیا بکاتەوە لێی بە جیابوونەوە خواز (انفصالي، تجزیە طلب)ی دەدەنە قەڵەم و بە ناپاک و خایەن و نیشتمانفرۆشی دەزانن. "جیابوونەوە خوازی" یەکێکە لەو تۆمەتە قورسانەی کە لە پاش جەنگی جیهانیی یەکەمەوە، بە جێ و بێ جێ، دەنرێتە پاڵ نیشتمانپەروەرەکانی کورد، وەک "تاوانێکی یەکجار گەورە". ئەوانەی بزووتنەوەی کوردایەتی بە "جیابوونەوە خوازی" دەدەنە قەڵەم و هەر بەو نێوەشەوە بەربەرەکانێی دەکەن، چەند دەستەیەکن:

١- دەستەی یەکەم ئەو شۆڤێنییە عەرەب و ترک و فارسانەن کە کوردستانیان داگیر کردووە و خاکی کوردستان بە بەشێک لە نیشتمانی خۆیان دەزانن نەک بە بەشێک لە وڵاتی کورد. ئاشکرایە هێندێک لەمانە، خۆشیان، لە کاتی خۆیدا "جیابوونەوە خواز" بوون، بە تایبەتی ئەو عەرەبانەی لە پاش جەنگی جیهانیی یەکەم، خۆیان لە دەوڵەتی عوسمانی جیاکردەوە و بوونە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتانی عێراق و سووریا و لوبنان و ...هتد. ئەم عەرەبانە، لەلایەن ژۆن ترکەکانەوە کە لە (١٩٠٨-١٩١٨)ەوە فەرمانڕەوای دەوڵەتی عوسمانی بوون و دەوڵەتی عوسمانییان بە "پیرۆز" دادەنا؛ بە "جیابوونەوە خواز" و "ناپاک" دەدرانە قەڵەم. بەڵام ئەم عەرەبانە خۆیان، خۆیان بە نیشتمانپەروەر دەزانی، نەک بە "جیابوونەوە خواز" و "ناپاک". جا وەک لەمەوبەر گوتم: "دەوڵەت" هەر هێندە "پیرۆز"ە تا وەک خۆی ماوەتەوە، پاش ئەوەی بوو بە دەوڵەتێکی دی، یان پارچە پارچە کرا و چەند دەوڵەتێکی دی لێجیابووەوە، ئەوا "پیرۆزێتی"ی خۆی لە دەستدەدات و دەیدات بەو دەوڵەتە یان ئەو دەوڵەتانەی جێی دەگرنەوە. ئەوەتە عەرەبەکانی ئەمڕۆی عێراق و سووریا دەوڵەتی عێراق و سووریا بە "پیرۆز" دەزانن نەک دەوڵەتی عوسمانیی ئەوسا کە عێراق و سووریا دوو پارچەبوون لێی.

٢- دەستەی دووەم لەوانەی کە بزووتنەوەی سەربەخۆییخوازانەی کورد بە "جیابوونەوە خوازی" دەزانن؛ زۆربەی زۆری هێزە چەپەکانی ئەو گەلانەن کە

کوردستانیان بەشکردووە. ئەمانە زۆر بە توندی دژی "جیابوونەوە خوازی" دەوەستن، و جاری واش هەیە؛ هەموو داخوازییەک بۆ مافی ناسیۆنالی کورد، هەرچەندە سووکیش بێ، هەر بە "جیابوونەوە خوازی" دەدەنە قەڵەم و لەمەشدا خزمەتێکی زۆر گەورەی شۆڤێنیستە راستڕەوە عەرەب و ترک و فارسەکان دەکەن. راستییەکەی، چەپییەکان، و بە تایبەتی کۆمۆنیستەکان -وەک لەمەوبەر باسمکرد- "دەوڵەت وەک دەوڵەت" بە شتێکی پیرۆز نازانن؛ بەڵام "یەکێتی"ی ئەو گەلانەی کە لە سایەی دەوڵەتێکدا دەژین، بە شتێکی "پیرۆز" دەزانن، کە بەمەش دەبێژن "یەکێتیی نیشتمانی". کە ئەمەش هورد بکرێتەوە؛ هەر پاراستنی ئەو "دەوڵەت"ەیە کە کۆمۆنیستەکان و مارکسیستەکان بە کوتەکی دەستی چینی فەرمانڕەوای دادەنێن بۆ سەر پێشێلکردنی چینی چەوساوە. کەچی هەر خۆیان بەرگری لە پاراستنی ئەو کوتەکە دەکەن وەک شتێکی پیرۆز. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بزانین کە توندیی و هێمنیی ئەم هەڵوێستەی کە چەپییەکان هەیانە بەرامبەر مەسەلەی کورد، بەپێی هەل و مەرج و کات دەگۆڕێ. واتە بەپێی دوور و نیزیکییانەوە لە دەستەی فەرمانڕەوایی ئەو دەوڵەتانەوە.

٣- دەستەی سێیەمیش لەوانەی دژی "جیابوونەوە خوازی" دەوەستن؛ هوردە بۆرژوای کورد خۆیەتی کە پێبەند، و هێندێ جاریش دەسکەلای دەستی فەرمانڕەوایانی ترک و عەرەب و فارسە. ئەم پێبەندییە جارو بار گەیشتووەتە رادەیەکی وا، کە هێندێک دەستە و بەرەی هوردە بۆرژوای کورد بە چەشنی داگیرکەرانی کوردستان هەڵسوکەوت لەگەڵ مەسەلەی کورد دەکەن. بۆ وێنە: وەک لەمەوبەر گوتم، لایەنگرانی جەلال تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٦٩/ ١٩٧٠ لە رۆژنامەکانیاندا بە ئاشکرا دەیاننووسی: "ئێمە هەموو کاتێک دژی جیابوونەوە خوازین". واتە هەموو کاتێک دژی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردین. هەروەها گوتمان -پرۆگرامی پارتی لە دەورانی دەستڕۆیشتنی لایەنگرانی تاڵەبانی دا، بە ئاشکرا دژی "جیابوونەوە خوازی" دەوەستا. بەڵام وەک لەمەوبەر باسمکرد، هوردە بۆرژوای کورد پاش هەرەسەکە، نەیتوانی؛ لە لایەکەوە دژی پاشماوەی سەرکردەیەتیی کلاسیک، و لە لایەکی دیکەوە دژی

بیری نەتەوەیی کوردی بوەستن کە لە نێوان کورددا تەشەنەی کردووە، و ریزەکانی خۆشی یەک پارچە نەبوو، لەبەر ئەوە دەبینین دژایەتیکردنی "جیابوونەوە خوازی" لە نووسینەکانیاندا ون بووە، و جارو بارێکیش باسی "بڕیاری چارەنووس" دەکەن، هەرچەندە مەبەستیان لە "بڕیاری چارەنووس" ئاشکرا نییە کە چییە. بەڵام داخوازییەکەیان لە "ئۆتۆنۆمی"یەوە بووە بە "ئۆتۆنۆمیی راستەقینە". تەنانەت هێندێ دەستەش هەن لە نێو بزووتنەوەی هوردە بۆرژوای کورددا -وەک کۆمەڵەی مارکسی-لینینی، کە بوو بە "کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان"، باسی دەوڵەتی یەکگرتووی کوردستانیش دەکەن. بەڵام ئەوەبوو کە کەوتنەوە وتوویژ لەگەڵ رژێمی عێراقدا، سەر لەنوێ کەوتنەوە باسی "پاراستنی یەکێتیی نیشتمانیی عێراق" وەک لەمەوبەر باسمکرد.

بە کورتی بەرەبەرەکانێی بیری سەربەخۆیی کوردستان لە نێو هوردە بۆرژوای کورددا، بەرەبەرە بەرەو بێهێزی و پووچبوونەوە دەچێ. ئەگەرچی پێبەندیی هێندێک لە رێکخراوەکانی هوردە بۆرژوای کورد بەم دەوڵەت یان ئەو دەوڵەتی داگیرکەری کوردستانەوە، کارێکی وای کردووە کە نەوێرن بە ئاشکرا نێوی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان ببەن.

### د- کورد "نەتەوە" نییە، بۆیە مافی "دەوڵەتی سەربەخۆ"ی نییە

ئەو بەڵگەیەی کە دەبێژێ کورد "نەتەوە" نییە، لەبەر ئەوە نابێ دەوڵەتیشی هەبێ، لە سەرەتاوە لە کۆمۆنیستەکانی عێراقەوە داهات. ئەوەش دوای دامەزراندنی "پارتی دیمۆکراتی کورد" لە ١٩٤٦/٨/١٦ دا. لێرەدا دەبێ ئەوە بێژین کە پاش راپەڕینی خەڵکی بەغدا لە کانوونی دووەمی ١٩٤٨دا؛ کە خوێندکارانی خوێندنگەو کۆلێجەکانی بەغدا دەورێکی گەورەیان تێدا گێڕا، و بوو بە هۆی رووخاندنی حکوومەتی سالح جەبر، ماوەیەک سەربەستیی رۆژنامەگەری و کۆبوونەوە درا بە خەڵک، و کۆمۆنیستەکان لە کوردستاندا دەسەڵاتیان پەیدا کرد. جا لەبەر ئەوەی "پارتی دیمۆکراتی کورد" خۆی بە حیزبێکی مارکسی و پێشڕەوی کرێکار و جوتکاری کورددا دەنا، و

کۆمۆنیستەکانیش هەر وەک ئەوان، خۆیان بە پێشڕەوی کرێکار و جۆتکار دادەنا؛ بەڵام هی هەموو عێراق، نەک هەر هی بەشە عەرەبەکەی، ئەوا رکە بەرایەتی کەوتە نێوان هەردوو حیزبەوە، کۆمۆنیستەکان دەیانگوت: کورد نابێ حیزبی پێشڕەوی تایبەتی خۆی هەبێ، چۆنکە کورد نەتەوە نییە، بەڵکو کەمایەتییەکە لە عێراقدا وەکو ئێزدی و ئەرمەنی و ئەمەشیان لە کۆنفرانسی شوباتی ١٩٤٤ یاندا کردبوو بە بڕیار و کۆنگرەی یەکەمی حیزبەکەیان، کە لە شوباتی ١٩٤٥ دا گیرابوو؛ ئەو بڕیارەی وەک خۆی هێشتبووەوە. بەڵگەی کۆمۆنیستەکان بۆ ئەوەی کە کورد "نەتەوە" نییە؛ ئەوە بوو کە کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، ئابوورییەکی نێوکۆییان نییە، کە ئەمەش نەبوو، دیارە ئەو دەمە بەپێی تاریفی ستالین بۆ نەتەوە؛ کورد یەکێک لە مەرجە پێویستیەکانی نەتەوەی نابێ، چۆنکە بەپێی هیپۆتیزی ستالین مەرجەکانی بوونە نەتەوە بریتین لە: زمانی نێوکۆیی و مێژووی نێوکۆیی و هەستی نێوکۆیی و زەوی نێوکۆیی و ئابووریی نێوکۆیی، و هەر گەلێک ئەم مەرجانەی نەبێ؛ ئەوا بە قسەی ستالین "نەتەوە" نییە، ئەوجا لەبەر ئەوەی بەپێی قسەی لینین، "هەموو حیزبێک نێوەرۆکی چینێکە"، دیارە لە وڵاتێکی وەک عێراقدا کە یەک چینی کرێکار هەیە، دەبێ یەک نوێنەری هەبێ و هەر یەک حیزبی پێشڕەویشی هەبێ، نەک دوو نوێنەر و دوو حیزبی پێشڕەو. خۆ ئەگەر دوان هەبوون، ئەوا یەکێکیان هەلپەرستە. لەبەر ئەوە "پارتی دێمۆکراتی کورد" حیزبێکی پێشڕەو نییە، و نوێنەری کرێکار و جۆتکاری کورد نییە، بەڵکو نوێنەری بۆرژوازیی کوردە، بە پێچەوانەی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە، کە پێشڕەوی هەموو کرێکاران و جۆتکارانی عێراقە، بە کورد و عەرەب و کەمایەتییەکانەوە.

وەکو لەمەوبەر باسمکرد، ستراتیژی هوردە بۆرژوای کورد پاش جەنگی جیهانیی دووەم، لە "سەربەخۆیی کوردستان"ەوە بوو بوو بە "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان"، و کرۆکی ئەم دروشمە تازەیەش ئەوەبوو کە هەموو پارچەیەکی کوردستان بە بەشێک لە کوردستانی گەورە نەدەدرایە قەڵەم؛ بەڵکو بە بەشێک لەو دەوڵەتە دەدرایە قەڵەم کە پارچە کوردستانەکە نوسێنراوە پێوەی. بۆ وێنە:

خوارووی کوردستـان بە بەشێک لە عێـراق دادەنرا. دە دیارە هوردە بۆرژوای کوردی سەرکردەی ئەو کاتەی پارتی کە خۆی بە خاوەنی رێکخراوێکی کوردیی عێراقیی مارکسی دەدایە قەڵەم، شتێکی هەروا ئاسان نەبوو بۆی؛ بەڵگەی مارکسیانەی دەمکوتکەر بهێنێتەوە بۆ ئەوەی پارتی لەسەر هەقە و کورد نەتەوەیە و مافی ئەوەی هەیە رێکخراوی خۆی هەبێ، چۆنکە لایەنگیرانی پارتی بە گوێڕایەڵی لە سەرکردە مارکسییەکانی ئەو سەردەمەیان؛ هەر پەنایان دەبردە بەر وتارەکەی "مەسەلەی ناسیۆناڵ"ی ستالین کە لە ساڵی ١٩٤٦ دا لەلایەن خالید بەگداشەوە کرابوو بە عەرەبی و بە نیوەدزی لە بازاڕەکانی کوردستاندا دەفرۆشران.

راستییەکەی؛ ئەوی ئەو دەورو سەردەمەی بە چاوی خۆی نەدیبێ، هەزار جار بۆی بگێڕنەوە باوەڕ ناکات کە رۆشنبیرانی کورد بە جارێک بووبوونە دوو تاقمی دژ بەیەک، تاقمێکیان دەیگوت: کورد "ئومە"یە و ئەوی دیش دەیگوت: کورد "ئومە" نییە، ئەوی بیگوتایە کورد "ئومە"یە ئەوە پارت بوو، ئەوی بیگوتایە کورد "ئومە نییە" ئەوە "تحرر" بوو. ئەو زەمانە بە کۆمۆنیستەکانیان دەگوت "تحرر"، چۆنکە بەنێوی کۆمۆنیستییەوە کە حیزبێکی قەدەغەکراو بوو نەیاندەتوانی کار بکەن. لەبەر ئەوە بە نێوی "حزب التحرر الوطني"یەوە قسەیاندەکرد. ئەمەش حیزبێک بوو داوای ئیجازەکەی کرابوو، بەڵام هێشتا نەدرابوو، دواییش هەر نەدرا.

ئەم سەمینارە بۆ ئەوە نەنووسراوە کە مێژووی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و مەسەلەی کورد بخاتە ڕوو. ئەو کارەم بە دوور و درێژی لەو باسەدا کردووە کە پار بەبۆنەی تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر دەرچوونی گۆڤاری "یەکێتیی تێکۆشین" و تێپەڕبوونی ٥٠ ساڵ بەسەر دامەزراندنی پارتی کۆمۆنیستی عێراقدا نووسیومە، کە هیوام وایە بە هیمەتی "بنکەی چاپەمەنیی ئازاد" بیخەمە بەردەستتان. لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوێ لێرەدا دەست بۆ ئەوە رابکێشم، کە ئەو زیانەی بڕیاری کۆنفرانسی شوباتی ١٩٤٤ و کۆنگرەی شوباتی ١٩٤٥ لە مەسەلەی کوردی دا، تەنانەت ئەو وتارەی شەهید فەهد خۆشی نەیهێنایەوە

جیٚ، کە لە تیشرینی دووەمی ١٩٤٥دا لە رۆژنامەی "القاعدة"ی زمانی حاڵی حیزبەکەیدا نووسیبووی، و لەویٚدا کوردی بە "گەلیٚک" دانابوو کە "مافی جیابوونەوەی هەیە لە عیٚراق هەر کاتیٚک کە عیٚراق لە ئیمپریالیزم رزگاری بوو، یان لە هەر کاتیٚکدا کە زرووفی لەبار بۆ گەلی کورد هەڵکەوت و لە بەرژەوەندیی جەماوەرە زەحمەتکیٚشەکەی بوو". دەڵیٚم لەگەڵ ئەمەشدا ئەم مەسەلەیە هەتا ساڵی ١٩٥٢ و بگرە دوای ئەوەش هەر مایەوە. ئەگەرچی بەهائەددین نووری (باسم)، یەکیٚک لە سەرکردە کوردەکانی پارتی کۆمۆنیستی عیٚراق، کەوتە رەخنە گرتن لە هەڵویٚستی حیزب بەرامبەر بە مافی بریاری چارەنووسی کورد و کەوتە پەلاماردانی فەهد بیٚ ئەوەی پەنجە بخاتە سەر دەوری سەرکردە عەرەبە شۆڤیٚنیستەکانی پارتی کۆمۆنیستی عیٚراق، وەک ذنون ایوب کە پیٚی وابوو کوردیٚکی دیانی وەک فەهد ریٚزی ئەوەی نییە ببیٚ بە سەرکردەی حیزبیٚک. ئەمە لە کاتیٚکدا کە فەهد پیٚنج ساڵ بوو لەژیٚر خاکدا بوو و ریٚی ئەوەی نەبوو لەسەر خۆی بکاتەوە، و بیٚ ئەوەی بەهائەددین دەست رابکیٚشیٚ بۆ هیپۆتیٚزەکەی ستالین کە ئایا ئەمە راستە یان راست نییە!

راستییەکەی هەر کۆمۆنیستەکانی عیٚراق نەبوون کە پشت بە قسەکانی ستالین؛ چەند ساڵیٚک کوردیان بە "نەتەوە" دانەنابیٚ. بەڵکو هیٚندیٚک هیٚزی راستڕەوی داگیرکەرانی کوردستانیش ئەم قسەیەیان کردووە و دەیکەن. بۆ ویٚنە لە ساڵی ١٩٦٩دا کابرایەکی سەر بە دوکتۆر موسەددیق، بەنیٚوی خواستەمەنی م. ماکان ەوە کە لە ئەڵمانیای رۆژاوا دادەنیشت، نامیلکەیەکی بە زمانی فارسی بە نیٚوی "افسانهء خلقهای ایران" (ئەفسانەی گەلانی ئیٚران)ەوە بلاٚوکردەوە، کە لەویٚدا خۆی زۆر ماندوو کردبوو، تا بە بەڵگەی مارکسیانە ئیسپاتی بکات کە کورد "نەتەوە" نییە، چۆنکە کورد "ئابووریی نیٚوکۆیی" نییە. لەم رۆژانەشدا شاپووری بەختیار و دارو دەستەی شاپەرستەکان، واتە "سلطنت طلبان" و ناسیۆنالیستە فارسەکان (ملیون) لە ئەورووپا زورنای ئەوە لیٚدەدەن کە کورد "نەتەوە" نییە، چۆنکە ئابووریی نیٚوکۆیی نییە. رۆژنامەکەی بەختیار "نهضت" لە ژمارە (٥٠)ی رۆژی ٤/١٠/١٩٨٣ دا دەنووسیٚ: کورد "نەتەوە" نییە. خۆش ئەوەیە ئەو بەختیارەی کە بە خویٚنی سەری کۆمۆنیستەکان

تینووە؛ لە کورد دەپارێتەوە کە باوەڕ بە تاریفی ستالین بهێنن بۆ "نەتەوە"، چونکە ئەو دەمە کە باوەڕ بەوە بهێنن؛ کورد نابێتە "نەتەوە" و ئێرانیش ئەو دەمە لە "فرەنەتەوە"یەتی دەکەوێ.

شایانی باسە کە لێکۆلەرەوە زانستکارە بۆرژوازییەکان، مەسەلەی "نەتەوە" دەبەستن بە "دەوڵەتی ناسیۆنال"ەوە، واتە ئەو گەلەی دەوڵەتی ناسیۆنالی هەبێ؛ ئەوە "نەتەوەیە"، و ئەوی نەشی بێ، ئەوە "نەتەوە نییە". ئەمە وای لێهات کە ئەوروپاییەکان، ئەو گەلانەی لە ئەفریقا و ئاسیادا بۆ سەربەخۆیی خۆیان شۆرشیان هەڵدەگیرساند لە دژی کۆلۆنیالیستە ئەوروپاییەکان، و لە ئەنجامدا دەوڵەتی سەربەخۆیان دروستدەکرد، پێیان دەگوتن "نەتەوە" (٣٥). تەنانەت لە زمانی ئەڵمانیدا کە باسی "نەتەوە" دەکرێ "گەلێکی دەوڵەتدار" دێ بە خەیاڵدا (٣٦). بەڵام ستالین کە لەلای کۆمۆنیستەکان و مارکسیستەکان بە لێکۆلەرەوەی مەسەلەی ناسیۆنال دادەنرێ، باسی "دەوڵەت" ناکات، واتە نابێژێ: ئەو نەتەوەیەی دەوڵەتی نەبوو لە نەتەوەیەتی دەکەوێ"، بەڵکو دەبێژێ: "ئەو گەلەی ئابووریی نێوکۆیی نەبوو نابێتە نەتەوە". لە کاتێکدا هەر خۆی لەمەدا خۆی بە هەڵەدا دەبا، چونکە هەر "دەوڵەت"ە کە دەتوانێ "ئابووریی نێوکۆیی" دروستبکات. کەواتە کە دەوڵەت نەبوو؛ ئابووریی نێوکۆییش نابێ، واتە "نەتەوە" دروستنابێ. بەکورتی هیپۆتێزەکەی ستالین هەر رەئیی زانستکارە بۆرژواکانە، بەڵام بە شێوەیەکی کەمێک بە ئەدەبانەتر نووسراوە، کە لەوێدا بە ئاشکرا نێوی دەوڵەت نابا بەڵکو بە پێچوپەنا دەیبا.

کازیکنامە، کە لە نیوەڕاستی تەممووزی ١٩٦١ دا دەرچووە: بۆ یەکەمین جار هەستی بەم کەلێنە کردووە لە هیپۆتیزەکەی ستالین دا و لەم بارەیەوە دەنووسێ:

"ستالین بە فەیلەسووفی شیوعییەکان ئەژمێردرێ لە رووی شیکردنەوەی گیروگرفتەکانی نەتەوایەتییەوە بەپێی سەرنجی مارکسیتی. ستالین "ئابووریی هاوبەش" -الاقتصاد المشترک- بە گەورەترین نیشانەی نەتەوە دائەنێ و ئەیخاتە پێش ئەرز و زمان و مێژوو و هەستی هاوبەشییەوە. بێجگە لەوەش

ستالین "دەوڵەت" بە نیشانەی "نەتەوە" دانانێ، چۆنکە لای وایە -کە ئەمە راستیشە- هەر نەتەوەیەک دەوڵەتی نەبوو، وەنەبێ ئیتر نەتەوە نەبێ.

کەچی سەیر ئەوەیە هەر ستالین خۆی "ئابووریی هاوبەش" بە نیشانەی هەرە گەورەی "نەتەوە" دا ئەنێ. کەواتە دیارە ستالین لە ژێرەوە دان بەوەدا ئەنێ کە دەوڵەت دەستێکی زۆر باڵای هەیە لەم رووەوە. چۆنکە ئەوەی راستی بێ (دەوڵەت) و (ئابووری) لە یەک جیا ناکرێنەوە. ئەی ئەگەر وانیە بۆچی شیوعیەکان هەوڵ ئەدەن هەرچی دەوڵەتی دنیا هەیە بیخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە؟ ئەی ئایە ئەوە بۆ ئەوە نیە کە رژێمی ئابووریی ئەو دەوڵەتانە بگۆڕن لەرێگەی دەستبەسەرداگرتنی دەوڵەتەوە؟

خۆ ئەگەر دەوڵەتیان بە شتێکی گرنگ نەزانیایە، ئەبوو بیانتوانیایە بەبێ دەستگرتن بە سەریدا رژێمە ئابوورییەکەی بگۆڕن، ئەمجا کەوابێ ئەبێ بپرسین ئەی بۆچی ستالین بە سەرزاری ناوی "دەوڵەت" نابا؟ ئێمە بڕوامان وایە وەرامی ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ:

(١)- چۆنکە مارکسیەکان -وەک وتمان- هەموو بزووتنەوەیەک ئەبەنەوە سەر ناکۆکیی ئابووریی نێو چینەکانی کۆمەڵگا.

(٢)- چۆنکە خۆشیان ئەزانن ئەگەر ناوی "دەوڵەت" بەرن و بیکەن بە مەرج بۆ نەتەوە، دیارە ئەو نەتەوانەی دەوڵەتیان نیە بەجارێک لێیان زیز ئەبن، بەتایبەتی خۆیان لە سەت نەتەوە زیاتر وا لە ژێر دەستیاندا کە لە حەفتایان پتر تەنانەت "خودموختاری"یە درۆیینەکەشیان نیە. بەڵام کە وتیان "ئابووری"، خۆی لە ناوەرۆکدا وەکو وتمان مانای "دەوڵەت" ئەگرێتەوە. ئیتر پێویست ناکات ناوی دەوڵەت بەرن و خۆیان بخەنە گێژاوەوە.

(٣)- چۆنکە "یەکێتی سۆڤێت" بە دەیان نەتەوەی بێدەوڵەتی تێدایە، خۆ ئەگەر بێتو هەر یەکەیان دەوڵەتێکی سەربەخۆیان بدەنێ، ئەوا رووسیا دەستی لە بنی هەمانەکە دەرئەچێ. هەروەها وەکو لە پێشەوە وتمان دەسکەوتی ئابووری؛ گەلێک نەتەوە بە یەکەوە ئەبەستێ و زمانی نەتەوە گەورەکە زاڵ

ئەکا بەسەر ئەوانی تردا. هەر لەسەر ئەم داوو دەزمێرەش رووسەکان ئەیانەوێ نەتەوە بچووکەکانی یەکێتیی سۆڤێت کە دەوڵەتیان نییە لە بۆتەی نەتەوایەتیی رووسدا بیانتوێننەوە.

ئەمە وا، خۆ ئەگەر سیاسەتی دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت سەیر بکەین، دەبینین هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە شیوعییەکان خۆیان پێی ئەڵێن "دەستکردی ئیستعمار" و لە هەمان کاتدا کوردستانیان داگیرکردووە، رووسیا هەمیشە مێچکە مێچکەیان بۆ ئەکات و چەک و پارەیان ئەداتێ بە لێشاو و، چاو لە هەموو ئەو کوردانە ئەپۆشێ کە لە ژێر باری گرانی ئەو دەوڵەتانەدا دەناڵێنن. بۆ وێنە لەو کاتەدا کە حکوومەتی ئێران ناوچەی "جوانرۆ"ی بۆمباباران ئەکرد، رووسەکان بەوپەڕی شانازییەوە (شا)یان بانگکرد بۆ رووسیا و لەوێ مەدالیای زێڕینیان کرد بە سنگیدا. ئەمە بێجگە لە پشیپشیکردن و یارمەتیدان و لەسەرکردنەوەیان بۆ کاربەدەستانی ترکیا و عێراق و کۆماری یەکگرتووی عەرەب. ئایە ئەمە مانای ئەوە نییە ئەوی دەوڵەتی هەیە بەنرختر و بەرێزتر و لە پێشترە لەوانەی بێدەوڵەت و مایە پووچن وەک کورد؟

هەروەها ئەگەر دەوڵەت نرخی نەبووایە بەلای شیوعییەکانەوە، بەم هەموو جۆش و خرۆشەوە شەڕیان لەسەر پاراستنی "یەکێتیی عێراق" و "یەکێتیی سووریا" و... هتد نەدەکرد و نەدەچوون بەگژ ئەو کوردپەروەرانەدا کە خۆیان بە کلکی ئەو دەوڵەتانە نازانن. ئەوان کە ئەم هەرا و هۆریایە بەرپا ئەکەن بەناوی ئەوەوە کە گوایە ئەبێ خەباتی چینایەتی لەسەر بناغەی (قطریکی سیاسی) بێ و لەو سنوورە دەرنەچێ، نەک لەسەر بناغەی "نەتەوە"، وە کە ئەڵێن نابێ "حیزبی شیوعیی کوردستانی" دروست ببێ، هەر بیانوویان ئەوەیە کە کوردستان دەوڵەتێکی نەخشە بۆ کێشراوی دانپێدانراوی نییە. لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کاتێک ستالین ئەم مەرجانەی داناوە بۆ نەتەوە، "زمان و ئابووریی هاوبەش و مێژوو و ئەرز و هەستی هاوبەش" زۆر بە توندییەوە پەلاماری ئەو جوولەکانەی ئەدا کە ئەیان ووت "ئێمە نەتەوەین". تەنانەت ستالین لە نووسینەکانیدا ئەیوت "جوولەکە نەتەوە نین" چونکە ئەرزی هاوبەش و زمانی هاوبەش و ئابووریی

هاوبەشیان نییە". بەڵام هەر ئەو جوولەکانە بوون کە لەم دواییەدا ستالین خۆی دانیپێدانان و یارمەتیدان بۆ ئەوەی ببنە دەوڵەت، ئایە ئەمە سەرشۆڕکردنە بۆ هێزی جوولەکە و کاری کراو، یان پێچەوانە جوولانەوەیە بەرامبەر دەستووری شیوعێتی" (٣٧)

## هـ- دەوڵەت دەزگەیەکە کۆن بووە، سەردەم سەردەمی گلۆبالیزمە، دەوڵەتەکان بەرەو یەکگرتن دەچن، کاتی دروستکردنی دەوڵەتی کورد بەسەرچووە.

سەرنجڕاکێش ئەوەیە ئەم قسەیە لەلایەن ئەوانەوە دەکرێ کە دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان هەیە و بە هەموو جۆرێک دەیپارێزن، وەک ترک و عەرەب و فارس. ئێستە با بزانین ئەو بانگەشەیەی کە دەبێژێ "دەوڵەت دەزگەیەکە کۆن بووە"، واتە، "باوی نەماوە" و سەردەمی بەسەرچووە، تا چ هەندازەیەک راستە.

عەرەبەکان ٢٣ دەوڵەتیان هەیە و هەموو ئەم دەوڵەتانە سەربەخۆن و هەمووشیان باسی "برایەتیی عەرەب و عەرەب" و "هاوکاریی نێوان عەرەب و عەرەب" و "یەکێتیی گشتگری عەرەب" دەکەن، بەڵام هەتا ئێستا نەیانویستووە یەکگرن. لە مانگی شوباتی ١٩٥٨ دا میسر و سووریا بە سەرکردەیەتیی جەمال عەبدولناسر یەکیان گرت، کەچی هەمووی سێ ساڵ بەرگەی گرت و لە ١٩٦١ دا هەڵوەشایەوە. هۆی ئەم یەکنەگرتنەی عەرەب ئەوەیە کە هەر یەکەیان دەیەوێ بە هەموو جۆرێک سەربەخۆیی دەوڵەتەکەی خۆی بپارێزێ. تەنانەت یەکێتییەکی فیدەرالیش کە ساڵانی ساڵە قسە دەکرێ لێی؛ هێشتا سەری نەگرتووە، ئەمەش لە ترسی ئەوەیە کە دەسەڵاتی دەوڵەتەکان لە یەکگرتنێکی فیدەرالیدا بەرامبەر دەسەڵاتی نێوەندی کەم دەبێتەوە. تەنانەت عەرەبی بیابانی مەغریب (صحراء المغرب) کە لە چل هەزار کەس پتر نین دەیانەوێ دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆیان هەبێ و نایانەوێ ببنە بەشێک لە مەغریب. ئەمەش مانای وایە کە دەوڵەت لەلای گەلانی عەرەب، نەک هەر "کۆن نەبووە" و "باوی ماوە"، بەڵکو زۆر زۆر گرنگ و پیرۆزە، ئەگەرچی هەموویان عەرەبن و ئەگەر بێتو دەوڵەتێکی یەکگرتوو دروستبکەن، هەر دەوڵەتی عەرەب دەبێ.

پاش دامەزراندنی دەوڵەتی ترک لە ۱۹۲۳ دا بەنێوی "ترکیا"وە، سەرانی ئەم دەوڵەتە بە ئاشکرا و بە نهێنی هەوڵی دامەزراندنی تۆرانستانێک دەدەن کە گەلە ترکزمانەکانی دەوڵەتی سۆڤێت و دەوڵەتی چینیش بگرێتەوە. دوای رووخانی دەوڵەتی سۆڤیێت چەند دەوڵەتێکی ترکزمان لە ئاسیای نێوەڕاستدا پەیدابوون، وەک: ئازربایجان، ترکمانستان، کازاخستان، کرگیزستان و.. هتد کە ئەمانە هەمور بە بانگێشیی سەرانی دەوڵەتی ترک لە ئەنقەرە کۆبوونەوە و لیژنەیەکیان دروستکرد بە ئامانجی دامەزراندنی تۆرانستانێکی گەورە. ئازربایجان لە هەموو ئەمانە پتر چالاکی نواند. بێجگە لەوەی کە ئەژانسی دەنگوباسەکەی نێونا "تۆران"، کۆمیتەیەکێشی دروستکرد بەنێوی "کۆمیتەی ئینتەرناسیۆنالی ئازربایجان"ەوە کە هەوڵی جیاکردنەوەی ئازربایجانی ئێرانیش دەدا (بە ئازربایجانی رۆژاوایشەوە کە بەشێکە لە رۆژهەلاتی کوردستان)، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستە هیچ جۆرە دەوڵەتێکی یەکگرتوو لەنێو ئەم ترکزمانانەدا دروستنەبووە، چونکە دەوڵەتی ترک دەیەوێ خۆی بکاتە سەرگەورەی ئەم ترکانە و بێجگە لەوەش زمانی ئەم ترکانە هێندە لەیەک جیاوازە کە لە یەکدی ناگەن. تەنانەت سلێمان دەمیریل سەرکۆماری ئەو کاتەی دەوڵەتی ترک کە چوو بۆ سەردانی کازاخستان ناچار بوو وەرگێڕێک لەگەڵ خۆی ببا تا لە قسەی خەڵکەکەی ئەوێ بگا. بەمەدا دەردەکەوێ کە تۆرانییەکانیش کە لە هەموو ئەوانی دیکە پتر کوژراوی دامەزراندنی ئیمپراتۆرێتییەکن؛ هێشتا دڵیان برۆیی نادا واز لە سەربەخۆیی دەوڵەتەکانی خۆیان بهێنن، ئەگەرچی هەموویان ترکن.

لێرەدا پرسیارێکی دیکەش دێتە پێشەوە. ئەگەر دەوڵەت گرنگ نییە بۆ ترک، بۆچی لەشکری ترک لە ساڵی ۱۹۷۳ دا پەلاماری قوبرسی دا و ۰.٤٠٪ی خاکەکەی بەزۆری لەشکر داگیرکرد و "کۆمارێکی ترک"ی بۆ ترکەکانی ئەوێ دروستکرد و رێی نەدا کە ترکەکان وەک کەمایەتییەک لە قوبرس لەگەڵ یۆنانییەکانی ئەوێ لە سنووری دەوڵەتی قوبرسدا بمێننەوە؟ باشە! ئێستە وا یەکێتیی ئەورووپا دامەزراوە و قوبرسیش دەبێتە ئەندامێکی یەکێتیی ئەورووپا، بۆچی دەبێ لا لەوێچێک ترک لە قوبرس دەوڵەتێکی خۆی هەبێ؟؟؟ ئەگەر

"دەوڵەت دەزگەیەکە کۆن بووە" و "کاتی بەسەرچووە"؟؟؟

فارسەکانیش پاش رووخانی یەکێتیی سۆڤێت و سەربەخۆبوونی تاجیکستان کە بەشێکی خەڵکەکەی ئەویش بە شێوەیەکی فارسی قسە دەکەن، هەوڵیان دا جۆرە یەکگرتنێک لەنێو "وڵاتە فارسیزمانەکان"دا بهێننە کایە. سەرکردەکانی ئێران بیریان لە یەکگرتنێک کردەوە لە نێوانی "ئێران و ئەفغانستان و تاجیکستان"دا. دەیانویست ئەمە بەنێوی "یەکێتیی فارسیزمانانی موسڵمان"ەوە بکەن. ئەمەش سەری نەگرت لەبەر گەلێک هۆ. یەکەم زمانی فارسی زمانی هەموو گەلانی ئێران نییە، هەرچەندە زمانی فارسی زمانی رەسمی دەوڵەتی ئێرانە، ئەوەش بێپرس و راوەرگرتنی گەلانی ئێران، بەڵام فارسەکان کەمایەتییەکن لە ئێراندا. گەلانی کورد و بەلووچ و ترک و عەرەب و... هتد زۆربەی زۆری خەڵکی ئێران پێکدەهێنن. ئەفغانستانیش هەمووی فارسیزمان نییە، بەڵکو پەشتوونەکان نیوەی خەڵکی ئەفغانستانن، ئەگەر لە نیوە پتر نەبن. تاجیکستانیش هەمووی فارسیزمان نییە. ئەمە بێجگە لەوەی کە فارسی ئێران شیعە و فارس و پەشتوونی ئەفغانستان سوننین و تاجیکەکانیش هەر سوننین. دیارە کە رژێمی ئێران دەیویست خۆی بکاتە دەمڕاست و سەرکردەی ئەم یەکگرتنی "فارسیزمانی موسڵمان"ە هەر لەسەرەتاوە سەری نەگرت.

هێندەک جار نوێنەرانی دەوڵەتەکانی عەرەب و ترک و فارس کە باسی یەکگرتنی دەوڵەتان و دامەزراندنی دەوڵەتی گەورە دەکەن ، هەرچەندە خۆیان بەکردەوە دەوڵەتەکانی خۆیان دەپارێزن لە هەموو یەکگرتنێک کە دەسەڵاتیان کەمبکاتەوە، یەکێتیی ئەورووپا بە نموونە دەهێننەوە. سەیرەکە ئەوەیە ئەمانە خۆیان باسی "یەکێتیی ئەورووپا" دەکەن، بەڵام چاو لە "یەکێتیی ئەورووپا" ناکەن. یەکێتیی ئەورووپا لەم پلەیەدا یەکگرتنێکی ئابوورییە لەنێوان چەند دەوڵەتێکی ئەورووپاییدا کە جاری بە "یەکێتیی پارە" (یۆرۆ) دەستیپێکردووە. هەر دەوڵەتێک لەم دەوڵەتانە سەربەخۆیی ناسیۆنال و سنووری خۆی پاراستووە. یەکێتیی ئەورووپا نەبووە بەهۆی تواندنەوەی ئەم دەوڵەتانە لە یەک دەوڵەتدا و بەزۆر سەپاندنی زمانێک بەسەر هەموو گەلەکانی ئەورووپادا و

بندەستکردنی گەلانی ئەوروپا لەلایەن یەکێکیانەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە ترک و عەرەب و فارس لە سنووری دەوڵەتەکانی خۆیاندا خاکی کوردستانیان بەزۆر بە خۆیانەوە نووساندوە و گەلی کورد دەچەوسێننەوە و زمانی خۆیان بەزۆر دەسەپێنن بەسەر کورددا، ئەوەتە دەوڵەتی ترک کە هێشتا ئەندامی یەکێتیی ئەوروپا نییە، بەڵام بە زۆری ئەمریکا پاڵێوراوە بۆ ئەندامەتی، رازی نییە لەسەر نەریت و دەستووری ئەوروپا بڕوا بەڕێوە، کە دان بە مافی سەربەستیی بەکارهێنانی زمانی زگماکدا دەنێ.. دەوڵەتی ترک تەنانەت دان بەوەدا نانێ کە کورد مافی ئەوەیان هەیە بە زمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن و رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفیزیۆنیان هەبێ. ئەوجا ئێستە "یەکێتیی ئەوروپا" لە کوێ و ترک و عەرەب و فارس لە کوێ؟ راستییەکەی، بێجگە لە جیاوازیتیی فەرهەنگی و رامیاری، جیاوازییەکی جوگرافیایی یەکجار زۆر هەیە لەنێوان دەوڵەتانی ئەوروپا و دەوڵەتانی ترک و عەرەب و فارسدا. دەوڵەتانی ئەوروپا سنوورەکانیان لەسەرخۆ و لە ئەنجامی پرۆسەیەکی دوورو درێژەوە دروست بووە. هەرچەندە لەم دەوڵەت یان ئەو دەوڵەتدا خاکی گەلێکی جیاواز لە سنووری دەوڵەتی ناسیۆنالی گەلێکی دیکەدا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمی دیمۆکراتی و فیدرالی زۆربەی زۆری ئەم دەوڵەتانە؛ تا هەندازەیەکی زۆر مافی ئەو کەمە گەلانەی پاراستووە، وەک ئەڵمانەکانی هەرێمی سویدتیرۆل لە ئیتالیا و هەرێمی باسکەکان و کەتەلانەکان لە ئیسپانیا و ڤالۆنەکان لە بەلجیکا و فەرەنسەیی و ئیتالیایی و رۆمانەکانی سویسرە. بەکورتی کێشەی ناسیۆنال لە ئەوروپا، یان بەجارێک چارەسەر بووە، یان بەرەو چارەسەرکردن دەچێ. بەڵام دەوڵەتانی ترک و عەرەب و فارس کە داگیرکەرانی کوردستانن، هیچیان لە پرۆسەی مێژوویدا دروست نە بوون، هەموویان پاش جەنگی جیهانیی یەکەم و بەپێی بەرژەوەندیی ئابووری و ستراتیژی دەوڵەتەکانی ئەوروپا، بە شێوەی ناسیۆنالی یەک گەل لەسەر خاکی کوردستان و خاکی گەلانی دیکە دروستبوون. بۆ وێنە: تا ساڵی ١٩٢٣ دەوڵەتێک بەنێوی دەوڵەتی "ترکیا"وە نەبووە. خاکێکیش بەنێوی "ترکیا"وە نەبووە. بەڵام کوردستان سەتان ساڵ پێش ئەمە هەبووە. ترکەکان لە سنووری ئیمپراتۆریتیی عوسمانیدا دەژیان و

دەوڵەتەکە نێوی "دەوڵەتی عوسمانی" بوو. لە نێوەڕاستی سەتەی نۆزدەدا چەند کتێبێک لەلایەن چەند ڕۆژهەڵاتناس و بازرگانێکی ئەوروپاییەوە دەرچوو کە باسی "ئازایەتی و هۆشیاری و ژیهاتێتی"ی ڕەگەزی ترکیان دەکرد وەک "ڕەگەزێکی جیاواز" لەوانی دیکەی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی. نووسەری یەکێک لەوانە جوولەکەیەکی ئینگلیز بوو نێوی Arthur Lumley David بوو. ئەم کابرایە کتێبێکی نووسی بوو لەوێدا ترکەکانی بە "ڕەگەزێکی دانسقەی سەربەخۆ" دابووە قەڵەم کە لە "ڕەگەزی عەرەب و ڕۆژهەڵاتییەکانی دی زیرەکترن". لە نێوەڕاستی سەتەی نۆزدەدا کتێبەکانی ئەم داڤیدە کران بە ترکی. ڕۆژهەڵاتناس Bernard Lewis لەم بارەیەوە دەبێژێ؛ "ترکەکان بە قۆپینکردنی بەرهەمی ڕۆژاوایی، نەتەوایەتیی خۆیان دۆزییەوە". (تەماشای کتێبی: Bernard Lewis: Islam in History, (London 1973, p. 132

لە ساڵی ١٨٩٩ دا جوولەکەیەکی فەڕەنسی کە نێوی David Leon Cohun بوو پەرتوکێکی بڵاوکردەوە لەژێر نێوی Introduction Generale a L'Histoire de L'Asie لەمەدا ترکی وەک "ڕەگەزێکی یەکجار زیرەک" هەڵداوە. کە ئەم پەرتوکە کرایە ترکی؛ بوو بە خۆراکی گیانیی ژۆن ترکەکان وەک مەجید خەدوری باسی دەکا ... وشەی "ژۆن" وشەیەکی فەڕەنسییە بە مانای "گەنج، خورت" دێ. بێرنارد لیڤیس لە سەرچاوەی باسکراودا باسی ڕۆژهەڵاتناسێک دەکا بەنێوی Arminus Vambery (1832-1918) کە کوڕی جوولەکەیەکی هەنگاری بووە و بە نووسینەکانی یارمەتیی ژیاندنەوەی زمان و نەتەوایەتیی ترکی داوە. لە سەرەتای سەتەی بیستەمدا "ژۆن ترکەکان" هێندە بەهێز بوو بوون، بەتایبەتی لەنێو لەشکری عوسمانیدا، توانیان لە ساڵی ١٩٠٨ دا کودەتایەک دژی سوڵتانی عوسمانی بکەن و لە دەسەڵاتی بخەن و خۆیان حکوومەت بگرنە دەست. ئەمانە بە نیازی دروستکردنی "دەوڵەتێکی ناسیۆناڵ" بۆ ترک بیریان لەوە کردەوە کە نەتەوەکانی دیکە لەنێو ببەن. لە ١٩١٥ دا گەلکوژییان لە ئەرمەنییەکان کرد، لە ١٩١٦ دا گەلکوژییان لە

یۆنانییەکان کرد، لە ماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا هەزاران کوردیان لە بتلیس و خەرپوت و وان کوشت و ۷۰۰ هەزار کوردیان لە کوردستانەوە گواستەوە بۆ رۆژاوای ئەناتۆڵ. بەلاّم ژۆن ترکەکان بە سەرۆکایەتیی مستەفا کەمال پاش ئەمەش نەیانتوانی دەوڵەتی ناسیۆنالی ترک دروستبکەن؛ چۆنکە وەک هاوپەیمانی ئەڵمانیا شەڕیان دۆڕاند و سوێندخۆران پەیمانی سێڤریان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا سەپاند. بەلاّم دیپلۆماسیێتیی ژۆن ترکەکان و بردنەوەی شەڕ دژی یۆنانییەکان و خۆ نێزیککردنەوە لە دەوڵەتی تازە دروستبووی سۆڤیێت و بەستنی پەیمانی "هاوڕێیەتی" لەگەڵ سۆڤیێت لە ۱۹۲۱ دا؛ مەترسی خستە دڵی دەوڵەتە سوێندخۆرەکانەوە و ئەوجا پەیمانی "لۆزان"یان لەگەڵ مستەفا کەمال لە ۱۹۲۳ دا ئیمزا کرد و بەوە دەوڵەتێک بە نێوی "ترکیا"وە وەک قارچک لە زەوی هەڵتۆقی.

دەوڵەتی ئێرانیش ئیمپراتۆریێتیی قاجاری بوو. کە قاجارەکان هۆزێکی ترکمان بوون. لە ساڵی ۱۹۲۱ دا رەزا میر پێنج کە فەرماندەی لەشکری قوزاقی رووسەکان بوو لە باکووری ئێران، بە چاولێکەریی مستەفا کەمال کودەتایەکی دژی حکوومەتی قاجار کرد و دوایی بە پشتگیریی بەریتانیا خۆی کرد بە "شا" و خۆی نێونا "پەهلەوی". لە ساڵی ۱۹۳۷دا وشەی قاجاری گۆڕی و وشەی "ئێران"ی بە رەسمی بۆ دەوڵەتەکەی بەکارهێنا و کردی بە دەوڵەتی ناسیۆنالی فارس. لەکاتێکدا کە ئێران ئیمپراتۆریێتییەکی فرەگەلە، کورد، فارس، بلووچ، ترک، عەرەب... هتد لەوێ دەژین.

عێراقیش لە ۱۹۲۱دا دروستکرا وکرا بە حکوومەت لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاوە کە لەوێ داگیرکەر بوون، ئەو حەلە باشووری کوردستان (کە ویلایەتی مووسڵی عوسمانی بوو) لەسەر عێراق نەبوو. لە بەشێکی باشووری کوردستاندا حکوومەتێکی کوردستانی هەبوو بە فەرمانڕەوایەتیی شێخ مەحموود کە لە ۱۹۱۹ ەوە دامەزرابوو و بەریتانیا بەڕەسمی دانی پێدا نابوو. ئەوە یەکەمین دەوڵەتی ناسیۆنال بوو لە هەموو خۆرهەلاّتی ناڤیندا. بەلاّم کە سیاسەتی بەریتانیا گۆڕا، باشووری کوردستان بەزۆری لەشکری بەریتانیا

خرایە سەر عێراق. لە کاتێکدا کە کوردی ئەوێ دژی ئەوەبوون بنووسێنرێن بە عێراقەوە.

رۆژاوای کوردستانیش کە پاش جەنگی جیهانیی یەکەم بوو بە نێوچەی منداتی فەرەنسا، کە لە سووریا و لوبنان منداتداربوون. پاش ئەوەی فەرەنسا لە ١٩٤٦ دا سووریا و لوبنانی بەجێهێشت درا بە حکوومەتی سووریا.

کوردەکانی سۆڤێتیش کە کۆماری ئۆتۆنۆمیداری "کوردستانی سۆر"یان هەبوو لە سەردەمی لینیندا، پاش نەمانی لینین، ستالین کۆمارەکەی رووخاندن و کوردەکانی کۆچ دا بۆ سیبیریا و کازاخستان و خاکەکەیانی بە دیاری دا بە تۆرانییەکانی ئازربایجان.

بەکورتی ئەم دەوڵەتانەی کوردستانیان دابەشکردووە لە نێو خۆیاندا، هیچیان دەوڵەتی خۆرسکی نین بەڵکو لە ئەنجامی فرتو فێڵی کۆلۆنیالیستەکانی ئەوروپاوە دروستکراون و هەموو دەوڵەتی دەستکردن و لەوە دەترسن ئەگەر مافێک بە کورد رەوا ببینن، دەوڵەتەکانیان لە یەک بترازێ. لەبەر ئەوە بە هەموو جۆرێ دژی سیستەمی دیمۆکراسی دەوەستن. ئەمانە دیمۆکراسی بەو هەتاوە دەبینن کە بۆگەن لە گۆشتی گەنیو هەڵدەستێنێ و شیرازەی دەوڵەتە دەستکردەکانیان هەڵدەپچڕێنێ.

## و- ئێمە موسڵمانین و کوردیش موسڵمانن، ئیدی چ پێویست دەکا کورد دەوڵەتی خۆی هەبێ؟

جارێ با بێینە سەر ئەو بانگەشەیەی کە دەبێژێ "کورد موسڵمانن" و ئەم بابەتە شیبکەینەوە. کوردستان بێشکەی شارستانیتیی کۆن بووە. لەم وڵاتەدا گەلێک شارستانیتیی گەورە و پرشنگداری وەک هی کاردۆخەکان و خۆرییەکان و میتانییەکان و پارتەکان و هەتیتەکان و مادەکان و ئاسوورییەکان و یۆنانەکان و گۆتییەکان وئیلامییەکان هەبووە. هێندەک لەمانە لە کوردستاندا ماونەتەوە، یان پاش ماوەیەک کوردستانیان بەجێهێشتووە. هەروەها کوردستان مەڵبەندی گەلێک رامانی ئایینییە وەک میترایی (خودێتیی

خۆر)، مەزدایی (زەردەشتێتی)، بوودایی، مووسایی، دیانی، مانێتی، یارسانی (کاکەیی، ئەهلی حەق)، ئێزدێتی، ئەلەڤیتی و... هتد.

کورد هەر لە کۆنەوە و پێش ئەوەی ئیسلامەتی بێتە کوردستانەوە لە نیوەڕاستی سەتەی هەوتەمی زایینیدا، بە هۆی کێشی زەردەشتێتی و مووسایەتی و عیسایەتییەوە، خودێتیی تاک و تەنێ و نەبینراویان ناسیوە. عەرەبەکان پێش ئیسلامەتی بتپەرست بوون، لەبەر ئەوە ئاینی ئیسلامەتی، وەک ئاینێکی مۆنۆتیزم (تاکپەرستی) بەلای کوردەوە شتێکی سەیر و نامۆ نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا کورد چەند سەتەیەک بەربەرەکانێی عەرەبە پەلاماردەرەکانی کردووە و ئاینی ئیسلام زۆر لەسەرخۆ لە نێو کورددا بڵاوبووەوە. ئەو کوردانەی بوونە موسڵمان، چ لە ڕێی زانست و هونەرەوە و چ لە رووی سوپایی و بەڕێوەبەرێتی دەوڵەتەوە خزمەتی گەورەیان بە عەرەب و گەلانی دیکەی موسڵمان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا بەشێک لە کورد هەر لەسەر ئاینە کۆنەکانی خۆیان مانەوە. ئەوڕۆ لەنێو کورددا بێجگە لە ئاینی ئیسلام (کە بەسەر سوننی و شیعەدا دابەشبوون)، ئاینی یارسان، ئاینی ئێزدی، ئاینی ئەلەوی، ئاینی شەبەک، ئاینی هەقەقە، ئاینی بەهایی، ئاینی زەردەشتی، ئاینی مووسایی، ئاینی عیسایی هەیە. سەرژمێرێکی تەواو بۆ ژمارەی پێوەندارانی ئاینەکان لە کوردستاندا نییە، بەڵام دەتوانرێ بگوترێ کە سێ یەکی کورد موسڵمان نین. ئەمە بێجگە لەوەی کە بەشی زۆری موسڵمانە کوردەکان سوننی و بەشێکی کەمی شیعەیە. داگیرکەرانی کوردستان کە موسڵمانن، کوردە موسڵمانەکان وەک دوژمن تەماشا دەکەن. لە عێراق کە حکوومەتەکەی عەرەبی سوننییە، کوردە شیعەکان چەوساوەتر و بەشخوراوترن لە کوردە سوننییەکان. سەددام حسەین لە زستانی ساڵی ۱۹۷۰ دا هەزاران کوردی شیعەی لە عێراق دەرکردە ئێران. لە ٤ی نیسانی ۱۹۸۰ دا سەددام جارەکی دیکە ملیوێنێک کوردی شیعەی (بەزۆری فەیلی) ڕەهەندەی ئێران کرد و نێزیکەی حەوت هەزار کوڕی کوردە فەیلییەکانی گرت کە تەمەنیان لە ۱۵-۲۵ ساڵیدا بوو.. هتد. ئەمانەی نارد بۆ شەڕی عێراق و ئێران و هێندێک ئەزموونی چەکی کیمیایی تاقیکرایەوە لەسەر لەشیان. ئەمە لە کاتێکدا کە کوردە فەیلییەکان

دانیشتووانی بنەڕەتی شاری بەغدا و دەورو پشتی بەغدان. هەر حکوومەتی سوننی عێراق بوو کە چەکی کیمیایی دژی کوردی سوننی شاری هەڵەبجە و بادینان و سەردەشت بەکارهێنا و ئەنفالی دژی کوردی سوننی کرد کە پتر لە دوو سەت هەزار کورد لەمەدا کوژران، یان بێ سەرو شوێن مان. حکوومەتی ئێران کە حکوومەتی شیعەیە، کوردە سوننییەکانی ژێردەستی دەچەوسێنێتەوە و ڕێ نادا کوردێکی سوننی یان کوردێکی شیعە ببێتە کاربەدەستێکی گەورە.

کوردی سووریا بەزۆری موسڵمانی سوننی و ئێزدین، بەڵام حکوومەتی سووریا کە بە دەستی عەلەوییەکانەوەیە، لەبەر ئەوە کوردی سووریا وەک کوردی موسڵمان و کوردی ئێزدی، لەلایەن ڕژێمی بەعسی عەلەوییەوە دەچەوسێنرێتەوە. کوردی موسڵمان لە وڵاتی ترکدا شافعین، بەڵام ترکە موسڵمانەکان حەنەفین، لەبەر ئەوە کورد لە دەوڵەتی ترکدا دەچەوسێنرێتەوە، نەک هەر لەبەر ئەوەی کوردن، بەڵکو لەبەر ئەوەی بەشێکیان موسڵمانی شافعین و بەشێکیشیان سەر بە ئاینی عەلەوی و بەشێکیان ئێزدین.

ئێستە با بزانین ئەم بانگەشەیەی کە دەبێژێ "کورد موسڵمانن" لە کەینییەوە پەیدابووە.

ئەم قسەیە بەزۆری لەم بیست ساڵەی دواییدا کەوتووەتە سەر زمان، بەتایبەتی پاش سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی و دامەزراندنی "کۆماری ئیسلامیی ئێران" لەلایەن ڕۆحوڵلای خومەینییەوە لە ۲۲ی بەهمەنی ۱۳۵۷ دا (شوباتی ۱۹۷۹) پاش خستنی ڕژێمی شا. سیاسەتی خومەینی و ڕژێمەکەی ئەوە بوو "شۆرشی ئیسلامی" هەر لە ئێراندا گۆشەگیر نەکەن، بەڵکو بینێرنە دەرەوە. لەبەر ئەوە ڕژێمی ئیسلامی کەوتە یارمەتیدانی دامەزراندنی "حیزبی ئیسلامی" لە گەلێک وڵاتدا. لە عێراق "حیزبی دەعوەی ئیسلامی" و "ئەنجومەنی بەرزی شۆرشی ئیسلامی عێراق" (مجلس اعلای انقلاب اسلامی عراق) و لە لوبنان "حیزبی خودێ" (حزب الله) دامەزران، کە ئەمانە ڕێکخراوی شیعەن. هەروەها ڕژێمی ئیسلامیی ئێران یارمەتیی حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی دا لە وڵاتانی دیکەدا، وەک "حیزبی فەزیلەت"ی ئەربەکان لە دەوڵەتی ترکدا. لە باشووری

کوردستانیشدا چەند ڕێکخراوێکی ئیسلامی دروستکران و بە پارە و چەک ڕەختکران. جا بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئێران پتر پێشانی بدا کە ئیسلامەتی دەکا، سیاسەتی دەرەوەی خۆی بەستەوە بە کێشەی فەلەستین و دوژمنایەتیکردنی ئیسرائیل و ئەمریکا - کە بە "شەیتانی گەورە" نێوی دەبا - ڕژێمی خومەینی لە بەرەبەیانی شۆرشدا باسی "ئازادی" و "وەکیەکی" و "برایەتی" دەکرد، بەڵام هەر زوو دەرکەوت کە ئەو قسانە قسەی رووتن. هەر کە کورد داوای هێندەک مافی کولتووری و رامیاریی سادەی خۆیان کرد، لەشکری ئیسلامی پەلاماری کوردستانی دا و بە تۆپ و فڕۆکەی لەسەردەمی شادا لە ئەمریکا کڕاو، کوردستانی تۆپباران و بۆمبا باران کرد و تەنانەت خومەینی بانگی "جیهاد"ی دا دژی خەڵکی کوردستان بەبیانووی ئەوەوە کە "شەیتانی بچووک" لە کوردستانە. لەم ماوەیەدا، بەتایبەتی ترکە ئازەرییەکان وەک زەهیر نەژاد، خاڵخاڵی، و مەلا حەسەنی؛ دەستێکی درێژیان هەبوو لە رشتنی خوێنی کورددا بەنێوی ئیسلامەوە، بەڵام لە راستیدا لە هەستی شۆڤێنیزمی ترکەوە بوو.

لە سەردەمی ژیانی خومەینی و هەتا سەردەمی سەرکۆماریی خاتەمی، کورد هەر نەک بە نێوی "بەربەرەکانێی دوژمنانی ئیسلام"ەوە لەنێو ئێراندا دەچەوسانەوە، بەڵکو دەستی رژێمی ئێران کەوتە تیرۆرکردنی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە سەرکردەکانی کورد وەک قاسملو، شەرەفکەندی، عەبدولی و یەزدانپەنا و گەلێک لەو کوردە چالاکانەی کە پەنایان بردبووە بەر باشووری کوردستان و وڵاتەکانی دیکەی جیهان.

کە خاتەمی هاتە سەرکار، دەستیکرد بە بەڵێندانێکی فشو فۆڵ بە کورد. ئەنجامی بەڵێنەکەشی ئەوەیە لە سەردەمی سەرکۆمارێتی بەرێزیدا یەک کورد (سوننی بێ یان شیعە بێ) لە کابینەکەیدا نییە. هەتا ئێستە تەنانەت لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوردستاندا بە کوردی ناخوێندرێ. چەند رۆژنامەیەک بە کوردی دەردەچن کە ئەگەر پەسنی رژێمی ئێران نەدەن، دەستبەجێ دادەخرێن. ئاو بێنە و دەست بشۆ.

باشە، ئەگەر ئەمانە موسڵمانن و موسڵمانەتی -وەک خۆیان دەبێژن- مانای

"برایەتی" و "وەکیەکی" یە بۆچی دەبیٚ کورد، کە بە قسەی وان "گەلێکی موسڵمانە" هیچ جۆرە مافێکی نەبیٚ، ئەگەر ئیسلامەتی ئیسلامەتییە، بۆچی دەبیٚ دەوڵەتی ئێران دەوڵەتی شیعەی فارس و ئازەری بیٚ و دەوڵەتی کوردە سوننی و شیعەکان و موسڵمانە سوننییەکانی بلووچستان و ترکمان سەحراش نەبیٚ، و موسڵمانە سوننییەکان هیچ مافێکیان نەبیٚ؟ باشە! ئەگەر دەوڵەتی ئێران دەوڵەتێکی ئیسلامییە بۆچی دەبیٚ سەرکۆمار بە "بنەچە و ڕەچەڵەک" ئێرانی و شیعە بیٚ، کەینیٚ لە ئیسلامەتیدا "بنەچە و ڕەچەڵەک" هەیە و کەینیٚ ئیسلام "شیعەیەتی و سوننەیەتی" لەیەک جیا دەکاتەوە؟

بەمەدا دەردەکەویٚ کە موسڵمانەتیی کورد لە ژێر سایەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا هیچ کاتێک نەبووەتە هۆی پاراستنی کورد لە کوشتار و قڕکردن و کاولکردنی ولاٚتەکەی (کوردستان)دا بە دەستی موسڵمانە ترک و عەرەب و فارسەکان. کاتێک کە کۆنگرەی "دەوڵەتە موسڵمانەکان" دەبەستریٚ، باسی موسڵمانانی هەموو شوێنێکی جیهان دەکریٚ، بەلاٚم باسی کورد بە هیچ جۆرێک، بە یەک وشەش، نایەتە پێشەوە. چۆنکە داگیرکەرانی ولاٚتی کورد هەموو موسڵمانن، تەنانەت پاش بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن دەوڵەتی عەرەبی عێراقەوە لە دژی کورد (بەتایبەتی هەڵەبجە) و کوشتنی هەزاران کورد؛ کۆنفرانسی دەوڵەتە موسڵمانەکان دەیگوت ئەوە درۆیە، و عێراق چەکی کیمیایی دژی کورد بەکار نەهێناوە.

دەمێنێتەوە ئەوەی کە دەبێژن "ئێمە هەموو موسڵمانین، کوردیش موسڵمانە، لەبەر ئەوە دەوڵەتی کورد پێویست نییە". باشە، ئەگەر موسڵمانەتی هۆیەک بیٚ بۆ ئەوەی موسڵمانان تەنیٚ یەک دەوڵەتیان هەبیٚ، کەواتە بۆچی ٢٤ دەوڵەتی عەرەب و حەوت دەوڵەتی ترک و دەوڵەتێکی فارس و گەلێک دەوڵەتی موسڵمانی دیکە هەن وەک پاکستان و ئەفغانستان و ئەندەنووسیا؟ بۆچی ئەمانە کە هەموویان موسڵمانن یەکناگرن لەیەک دەوڵەتدا و خاکی یەکدی داگیر دەکەن؟ ئێران لە سەردەمی شادا سیٚ دوورگەی عەرەبی لە کەنداودا بە زۆری سوپا داگیر کرد، کەچی ئێران بوو بە کۆمارێکی ئیسلامی

وعەرەبەکان داوای سێ دوورگەکەیان کردەوە، ئێران هەڕەشەی شەڕی کرد لێیان؟ بۆچی عێراقی موسڵمان لەگەڵ ئێرانی موسڵمان یەکیاننەگرت و لەجیاتی ئەوە هەشت ساڵ جەنگیان کرد دژی یەک و ملیۆنێک خەڵک کوژران، لەو شەڕانەدا؟ لەبەر ئەوە با دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان عەرەب و ترک و فارس، جارێ ببنە یەک دەوڵەت، ئەوجا داوا لە کورد بکەن کە باسی دەوڵەت نەکا. کەسێک خۆی دەوڵەتی هەبێ و بە زۆری چەک و تیرۆر سنوورەکانی بپارێزێ، مافی ئەوەی نییە کە داوا لە گەلێکی بێدەوڵەت بکا، بێدەوڵەت بمێنێتەوە. ئەگەر دەوڵەت پێویست نییە، با جارێ ئەوانەی دەوڵەتیان هەیە و ئەو قسەیە دەکەن، بچن دەوڵەتەکانیان بکەنە یەک؛ ئەوجا بە کورد بڵێن دەوڵەتت بۆ چییە!!

## ٦- کورد و تۆمەتی "جیابوونەوە خوازی"

وەک لەمەوبەر گوتم: "جیابوونەوە خوازی" یەکێکە لەو تۆمەتە قورسانەی کە لە پاش جەنگی جیهانیی یەکەمەوە تا ئێستە، بە جێ و بێ جێ، دەنرێتە پاڵ نیشتمان پەروەرانی کورد و بزووتنەوەی نیشتمانیی کوردستان. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە: تۆمەتی "جیابوونەوە خوازی" بە سەر کورددا ناچەسپێ. واتە ئەگەر کوردێک هەوڵی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆی دا؛ ئەوا ناتوانرێ هەوڵەکەی بە "جیابوونەوە خوازی" دابنرێ، چۆنکە "جیاکردنەوە" (فصل) مانای کردنەوەی بەشێکە لە گشت، جا ئەگەر کورد بیانەوێ وڵاتەکەیان لەو وڵاتانە جیا بکەنەوە کە پێیانەوە نووسێنراون و خۆیان بکەنە "دەوڵەتێک"؛ ئەوا ئەو دەمە هیچ "بەشێک" لە هیچ "گشتێک" جیا ناکرێتەوە، چۆنکە سەربەخۆ بوونی کوردستان هیچ بەشێک لەو وڵاتانەی ترک و عەرەب و فارس جیا ناکاتەوە. کوردستان هیچ کاتێک کەرتێکی خۆرسکی هیچ وڵاتێک لەو وڵاتانە نەبووە کە ئەمڕۆ ترنجێنراوەتە سنوورەکانیانەوە. بەزۆر لکاندنی شتێک بە شتێکی دیکەوە، ئەو دوو شتە ناکات بە یەک شت. لێرەدا دەبێ ئەوەش بزانین کە تۆمەتی "جیابوونەوە خوازی"، تا ئێستە سنوورێکی دیاریکراو دانەنراوە بۆی. لەبەر ئەوە زۆر جار داواکردنی مافێکی گچکەی

وەک خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی، یان لەبەرکردنی جلکی کوردی، یان گۆرانی گوتن بە کوردی، یان گلدانەوەی چەند کتێبێکی کوردی لای خۆ؛ بە "نیشانەی جیابوونەوە خوازی" دەدرێتە قەڵەم و خاوەنەکەی بەتوندی سزا دەدرێ. بەکورتی تۆمەتی "جیابوونەوە خوازی" کوتەکێکە بە دەست دەوڵەتانی ترک و عەرەب و فارسەوە؛ هەر کاتێک بیانەوێ بەکاریدەهێنن لە دژی هەموو جۆرە هەستێکی کوردایەتی و هەموو نیشانەیەکی کوردبوون. بێجگە لەوەش تۆمەتی "جیابوونەوە خوازی" و بەربەرەکانێی لەلایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە، شان بە شانی بەهێزبوونی هەست و بزووتنەوەی کوردایەتی و داواکردنی مافی ناسیۆنالی کورد؛ تیژتر دەکرێ. بۆ وێنە: پاش کودەتای قاسم لە عێراقدا و گەڕانەوەی بارزانی و جۆش سەندنی بزووتنەوەی کوردایەتی؛ قانوونێک دەرچوو لە دژی "جیابوونەوە خوازی". قانوونەکە دەبێژێ:

"قانوونی دەستکاری کردنی قانوونی سزاکاریی بەغدادی، ژمارە (٨) ساڵی ١٩٥٩:

بەندی نۆیەم: هەر کەسێک؛ هێز یان زۆر بەکار بهێنێ بۆ کردنەوەی پارچەیەک لە عێراق و جیاکردنەوەی لێی، یان نووساندنی بە دەوڵەتێکی بێگانەوە بە کوشتن سزا دەدرێ.

بەندی دەیەم: (أ)- هەر کەسێک بە هۆی یەکێک لەو دەستاوێژە بڵاوکردنەوانەی کە لە بەندی (٧٨)ی قانوونی سزاکارییەکانی بەغدادیدا باس کراون، بکەوێتە هاندان یان فێڵ گێڕان یان کەینوبەین کردن بۆ کردنەوەی پارچەیەک لە عێراق، یان جیاکردنەوەی لێی، یان نووساندنی بە دەوڵەتێکی بێگانەوە؛ بە کوشتن یان بەکار پێکردنی سەختی هەمیشەیی، یان کاتی، سزا دەدرێ.

(ب)- ئەگەر ئەم تاوانانە لە کاتی جەنگدا، یان لە کاتێکدا کە چاوەڕوانی هەڵگیرسانی جەنگ بکرێ؛ روو بدات، ئەوا سزاکە کوشتن، یان کارپێکردنی سەختی هەمیشەیی دەبێ".

لە زەمانی رەزا شا و چەند رۆژێک پێش کوشتنی سمایل خانی سمکۆ بە فرو فێڵ لە ١٩٣٠/٦/٢١ دا، رەزا شا قانوونێکی سزادانی بۆ ئەوانە دەرکرد کە دژی "ئاسایش" و "سەربەخۆیی وڵات"ن. ئەم قانوونە لە ٢٢ خوردادی ١٣١٠، واتە لە ١٩٣١/٦/١٢ دا دەرچوو بەنێوی "قانون مجازات مقدمين برعليه امنيت و استقلال مملكت"ەوە واتە "قانوونی سزادانی ئەوانەی لە دژی ئاسایش و سەربەخۆیی وڵات کار دەکەن".

بەندی دووەمی ئەو قانوونە دەبێژێ:

"هەر کەسێک بە جۆرێک لە جۆران بۆ جیاکردنەوەی بەشێک لە ئێران، یان بۆ چەپۆکدان بە تەواوێتی، یان سەربەخۆیی ئێراندا هەنگاو هەڵبهێنێ، بە زیندانی هەمیشەیی لەگەڵ کارپێکردنی سەخت، فەرمان دەدرێ بە سەریدا.

بەندی (٣) دەبێژێ:

"هەر کەسێک، سا یان بە هاودەستیی بێگانە، یان سەربەخۆ؛ دژی وڵاتی ئێران دەست بداتە چەک، فەرمانی کوشتن دەدرێ بە سەریدا".

پاش رووخاندنی کۆماری رۆژهەڵاتی کوردستان (مەهاباد)؛ هەر کوردێک داوای مافێکی کوردی بکردایە، هەرچەندە ئەو مافە گچکەش بووایە؛ هەر بە "جیابوونەوە خواز" (تجزیه طلب) دەدرایە قەڵەم.

هەروەها، پێش کودەتای ئێڤرەن لە ترکیا، لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ دا کە یەکێک لە هۆکار و هاندەرەکانی ترسی بەهێز بوونی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کورد بوو، گەلێک بەند خرانە سەر قانوونی سزای ترکی بۆ بەربەرەکانێی ئەوانەی تۆمەتی "جیابوونەوە خوازی" دەدرێتە پاڵیان. هەر لە مانگی یەکی ١٩٨٠ دا پەرلەمانی ترک قانوونێکی دەرکرد کە رۆژنامەی "تەرجومان" لە ١٩٨٠/١/١٩ دا تێکستەکەی بلاوکردبووەوە. بەپێی ئەو قانوونە هەموو ئەو "چالاکییانە" قەدەغەکران کە "دەتوانن ببنە هۆی تێکدان، یان هەڵوەشاندنەوەی تەواوێتیی نەتەوە و خاک". دیارە پاش کودەتای ئێڤرەن

گەلێک قانوونی دیکە دەرچوون بۆ بەربەرەکانێی "جیابوونەوە خوازی".

## ٧- چیرۆکی "ئۆتۆنۆمی" لە کوردستانی بە عێراقەوە نووسێنراودا

عێراق تاکە دەوڵەتێکە لەو دەوڵەتانەی کە کوردستانیان لە خۆیان بەشکردووە و باسی "ئۆتۆنۆمی بۆ کورد" دەکات، و ئەوەتە بە کردەوەش جۆرە "ئۆتۆنۆمی"یەکی بە دڵی خۆی، دامەزراندوە، لەبەر ئەوە دەبێ چاوێک بگێڕین بە مێژووی ئەم "ئۆتۆنۆمی"یەدا. ئەوەی راستی بێ؛ بیری "ئۆتۆنۆمی" لەپاش شۆرشی ئەیلوولی ١٩٦١ ەوە و لە ئەنجامی ئەو شۆرشەوە کەوتە کەللەی هێندێک لە کاربەدەستە عەرەبەکانی عێراقەوە، ئەمەش وەک چاولێکەرییەکی کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیا کە لەپاش جەنگی جیهانیی یەکەمەوە تا کۆتاییی جەنگی جیهانیی دووەم بەپێی پێویست باسی ئۆتۆنۆمییان دەکرد. جا وەنەبێ ئەم هەنگاوەی "ئۆتۆنۆمی" هەر وا یەکسەر هاتبێتە پێشەوە. نەخێر، زۆر لەسەرخۆ و هەنگاو بە هەنگاو. لەپێش شۆرشی ئەیلوولدا؛ بەعسییەکان، وەک هەموو ناسیۆنالیستە عەرەبەکانی دی، بە هیچ جۆرە مافێکی کورد رازی نەدەبوون. تەنانەت دژی ئەوە دەوەستانەوە کە قوتابیانی کورد و مامۆستایانی کورد رێکخراوی تایبەتیی خۆیان هەبێ. بەلاّم کە لە ١٩٦٣/٢/٨ دا بە کودەتا لە دژی قاسم هاتنە سەرکار و خۆیان لە بەردەم شۆرشێکی کورددا دی کە دوو ساڵ بوو هەڵگیرسابوو، نەیانتوانی چاو لە هەموو (واقیع)ێک بپۆشن، و لەپێشەوە کەوتنە باسی (لامەرکەزییەت)؛ کە بەپێی ئەوە عێراقیان کرد بە پێنج پارێزگەوە، یەکێک لەمانە پارێزگەیەک بوو بەنێوی پارێزگەی سلێمانییەوە کە لە هەرێمەکانی سلێمانی و هەولێر و قەزای دهۆک و قەزای چەمچەماڵ پێکهاتبوو. واتە دابرینی کەرکووک و دیالی و خانەقین و گەلێک لە هەرێمەکانی بادینان لە کوردستان. بەلاّم ئەوە بوو چۆنکە بەعسییەکان ئەم هەنگاوەیان لە ناچارییەوە هاتبوو، نەک لە باوەڕهێنانەوە بە مافی کورد، سەرکردایەتیی ئەو دەمەی شۆرش -هەرچەندە لەسەرەتاوە کەوتە وتووێژ لەگەڵ بەعسییەکان- بەلاّم لە ئەنجامدا نەیتوانی بەو جۆرە "لامەرکەزییەت"ە رازی ببێ

و لە ٩ ی حوزەیرانی ئەو ساڵەدا بەعسییەکان بە شێوەیەکی دڕندانە پەلاماری کوردستانیان دا و شەڕ تازە بووەوە. بەڵام سەبارەت بەوەی سەرکردەکانی ئەو دەمەی بەعسی عێراق، جارێ لە سیاسەتدا ناشی بوون؛ لووت بەرزیی زاڕۆیانە زاڵ بوو بە سەریاندا و هەڵەیەکی یەکجار زۆریان کرد، نەک هەر تەنێ بەرامبەر کورد و کۆمۆنیستەکان و گشت ئەوانەی کە بەعسی نەبوون، بەڵکو تەنانەت بەرامبەر بە ناسریش کە ئاڵا هەڵگری ناسیۆنالیزمی عەرەب بوو لەو سەردەمەدا. سەبارەت بەمە، بەعسییەکان بێهێز مانەوە و عەبدولسەلام عارفی کۆنە هاوڕێیان کە لەسەر بیری ناسر بوو، توانی تەفرو توونایان بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی عارف شۆڤێنییەکی یەکجار تەنگە تیلکە بوو، و پشتیشی بە ناسر و سۆڤێت بەهێز بوو، ڕیزەکانی شۆڕشی کوردیش بەهۆی ئاژاوەنانەوەی لایەنگرانی جەلال تاڵەبانی و ماستاو ساردکردنەوەی هێندێک لەوانەی خۆیان کردبووە دۆستی بارزانی، تەواو شێوابوو، عارف هەڵیدەسکەوت و باسی "لامەرکەزییەت"ەکەشی نەکرد و لە دەستوورەکەشیدا بەتەواوی کوردی خستە پشتگوێ و جارێکی دی لەشکری ناردەوە کوردستان، هەتا لە ١٩٦٦/٤/٣ دا فڕۆکەکەی کەوتە خوارەوە و مرد و براکەی کە عبدالرحمن عارف بوو لە ٤/١٧ ی ئەو ساڵەدا خۆی کرد بە سەرکۆمار و لەسەر شەڕی کورد ڕۆی بەڵام کە زانی پێیناکرێ، ئەوجا کەوتە فڕتو فێڵ و بۆ ئەوەی دان بە "ئۆتۆنۆمیی کوردستان"دا نەنێ، سەرۆک وەزیرەکەی کە بەززاز بوو ڕاسپارد کە لەگەڵ سەرکردەکانی شۆڕش ڕێکبکەوێ لەسەر چەند شتێک کە ئەمە بە بەیانی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ بەنێوبانگە، و لە چەند مافێکی سادە و بێنێوەرۆک بەولاوە چی دی نییە. دیارە ئەمەش هەر بە نیازی هەڵخەڵەتاندنی کورد بوو، چۆنکە هەر پاش ئەوەی بەززاز ئەم بەیانەی دەرکرد، دەست بەجێ لەلایەن سوپاییە شۆڤێنیستەکانی عەرەبەوە رووخێنرا و لەسەر کار لابرا. ئەوجا ئەو سەرۆک وەزیرانەی دوای ئەو هاتن؛ وەک ناجي طالب و طاهر يحي، بەیانی ٢٩ ی حوزەیرانیان هەر دواخست و جێبەجێنەکرد، و لەجیاتی ئەوە لەلایەکەوە کەوتنە بەهێزکردنی ئەو لایەنانەی دژی بارزانی بوون، وەک لایەنگرانی جەلال تاڵەبانی کە لە ساڵی ١٩٦٤ ەوە کەوتبوونە بەربەرەکانێی سەرکردایەتیی

بارزانی و لە ١٩٦٦ ەوە کەوتبوونە هاوکاریکردن لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا، لەلایەکی دیشەوە؛ کەوتنە هەوڵدان بۆ رێککەوتن لەگەڵ ئێران و ترکیا و سووریا و میسر وسۆڤێت لە دژی شۆرشی کورد. لەبەر ئەوە بەیانی ٢٩ ی حوزەیران هەر لەسەر کاغەز مایەوە و تەنانەت بەززاز خۆشی دەریخست کە ئەو بەیانە بەڵێنێکی بێبنچینە بووە و پرۆگرامێکی حکوومەتەکەی وی بووە و حکوومەتێکی دی مەرج نییە ئەو بەیانە پەسەند بکات. بەززاز، کاتی خۆی، ئەمەی بە وتارێک نارد بۆ رۆژنامەی (التآخي) زمانی حاڵی سەرکردەیەتیی بارزانی کە ئەویش لە ژمارە (٦٢)ی ١٩٦٧/٧/٢ دا وەک خۆی بڵاوی کردەوە. لەبەر ئەوە مەسەلەی بەیانی حوزەیران هەروا بە هەڵپەسێرراوی مایەوە، هەتا بەعسییەکان توانیان بە پشتیوانی عەبدولرەززاق نایف لە ١٩٦٨/٧/١٧ دا عەبدولرەحمان عارف بڕووخێنن و لە عێراق دەریپەرێنن، و پاش ئەوەش بۆ بنبەستکردنی جێپێی خۆیان هاتن هەر ئەو رۆژە بەیانێکیان دەرکرد و بەڵێنیان دا مەسەلەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکەن بەجۆرێک کە "یەکێتیی عێراق" بپارێزێ. بەڵام لە ١٩٦٨/٧/٣٠ دا نایفیان لەسەر کار لابرد و حکوومەتیان گرتە دەست خۆیان بەتەنێ، و ئەوجا لەباتی ئەوەی مەسەلەی کورد چارەسەر بکەن هاتن بە پشتی ناحەزەکانی بارزانی، وەک لایەنگیرانی جەلال تاڵەبانی کەوتنە ئەوەی کورد لە کورد بەربدەن و بەوە ئاگری شەڕی کوردستانیان لە جاران خۆشتر کرد. هەر لەپاڵ ئەوەشدا و بۆ شکاندنی دەسەڵاتی شۆرش؛ هاتن لە ٢٥ ی ئەیلوول و ٢٤ ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٩ دا دانیان بە هێندێک مافی کورددا نا: وەک کردنی نەورۆز بە جێژنێکی رەسمی لە عێراقدا، و کردنی خوێندن بە کوردی لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا، و دەرکردنی چەند گۆڤارێک بە کوردی لەلایەن حکوومەتی خۆیەوە، و دامەزراندنی زانستگەیەک لە سلەیمانی. ئامانجیان لەمە ئەوەبوو کە جەماوەری کورد بەلای خۆیاندا رابکێشن، و لەژێریشەوە کەوتنە جرتوفرت لەگەڵ ئێران و سۆڤێت. بەڵام لە سەرەتای بەهاری ١٩٧٠ دا دەرکەوت بۆیان کە جەماوەری کورد بەو مافانە نەخەڵەتان، و دوای ناحەزەکانی شۆرش نەکەوتن. هەروەها بۆیان دەرکەوت کە شای ئێران ئامادە نییە بچێتە شەڕێکەوە لە دژی کوردی عێراق بێ ئەوەی

ئەوان داخوازییەکانی بۆ جێبەجێبکەن. ئەمجا سۆڤیێتیش ئامادە نەبوو لەگەڵ ڕژێمێکی بەعسی تەقولەق ڕێک بکەوێت، ئەگەرچی دەیویست شەڕەکە ببڕێتەوە و بۆ ئەمەش گوشاری بۆ کوردیش و بەعسییەکانیش دەهێنا. بێجگە لەمانەش بەعسییەکان ئەو دەمە زۆر بێهێز بوون؛ چۆنکە بێجگە لە کورد، کۆمۆنیستەکان و ناسریستەکان و شیعەکان لە دژیان بوون. بەعسییەکان لە نێو خۆشیاندا تیرو شیریان لەیەک دەسوو. تاقمی عەبدولخالق سامەررایی و تاقمی نازم گزار دژی تاقمی بەکر و سەددام بوون. بەکورتی زرووفێک هاتە پێشەوە کە بەعسییەکان ناچاربوون دان بە جۆرە "ئۆتۆنۆمی"یەکدا بنێن، بۆ ئەوەی بتوانن جارێ شەڕ بوەستێنن، تا لەسەر خۆ هوردە هوردە خۆیان پنبەستدەکەن. خۆ ئەگەر بهاتایە و شەڕ نەوەستایە؛ بە ڕەئی من، زۆر نێزیک بوو ڕژێمی بەعسییەکان برووخێ. بەعسییەکان لەم هەنگاوەیاندا بە هەڵە نەچووبوون، چۆنکە سەرکردەیەتیی شۆڕشیش ئەو دەمە لە بارو وێستگەیەکی زۆر خراپدا بوو لە هێندێک ڕووەوە. لەلایەکەوە، لایەنگرانی تاڵەبانی لە دژی بوون، لەلایەکی دیکەوە هەر لەنێو بارەگەی بارزانی خۆیدا هی وا هەبوون کە حەزیان بە وەستاندنی شەڕ دەکرد و دەیانگوت "پێشمەرگە ماندوو بووە و تاقەتی چووە لە شەڕ"، لەلایەکی دیکەوە؛ هی وەک دوکتۆر موراد عەزیزیش هەبوو کە بەنێوی بەرەی ڕۆژهەلاتەوە کەوتبووە نێوەوە و بە بیانووی ئەوەی کە گوایە هەر ئیمپریالیزم، واتە بەلای ویەوە تەنێ ئەمەریکا و بەرەی ڕۆژاوا، سووت لەم شەڕە وەردەگرێ. بە کورتی بارزانی زۆری بۆ هات و ڕاوێژکەری لێهاتوو و پرۆگرامی ڕێکو پێکی نەبوو، و بڕیاری ئاشتی دا؛ و بەوە تای تەرازووی هوردە بۆرژوای نێو شۆڕش قورستر بوو، بەلاّم ئەم "سەرکەوتنە" کاتییە سەرزارییە؛ دەنگی ناحەزەکانی بارزانی تا ماوەیەک کپ کرد.

دەتوانین بێژین کە ئیمزاکردنی پەیمانی "ئۆتۆنۆمی" کە بە ڕێککەوتنی ١١ی ئازار نێوی ڕۆیوە، لەلایەن کاربەدەستانی شۆڕشەوە و بەو شێوەیەی کە کرا، گەورەترین هەڵەیەک بوو کە شۆڕشی کورد تا ئێستە کردوویەتی، و گەورەترین سەرکەوتنێک بوو بۆ حیزبی بەعس و هەموو دوژمنانی نەتەوەی کورد. سەیر ئەوەیە ئەم ڕاستییەی کە چەند ساڵێک پاش پەیمانی ١١ی ئازار بۆ جەماوەر و

زۆربەی هەرە زۆری ساسییەکانی کورد دەرکەوت، هەر لە یەکەمین رۆژی ئیمزاکردنییەوە لای هاوبیرانی ڕێبازی نەتەوەیی ئاشکرا بوو. رۆژنامەی "کوردستان ئینفۆرماسیۆن" زمانی حاڵی ئەوسای "یەکێتیی نەتەوەییی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا" (نوکسە NUKSE) کە ئازادیخوازی تێکۆشەر بروسکە ئیبراهیم دەریدەکرد؛ تاقە دەنگێک بوو لە نێو هەموو نەتەوەی کورددا کە گومانی خۆی بەرامبەر بەم ڕێککەوتنە دەربڕی. "کوردستان ئینفۆرماسیۆن" لە ژمارە (١٤)ی رۆژی ٢١ مارتی ١٩٧٠ دا، و پاش ئەوەی لیستەیەکی دوور و درێژی کردبوو بۆ ئەو ڕێککەوتنامانەی کە لەوەپێش روویان دابوو لە نێوان حکوومەتی عێراق و سەرکردەیەتیی شۆرشدا، نووسیبووی "سەرنجێک لەمەی سەرەوە وامان لێناکات کە خۆشبین بین بەرامبەر بەم ڕێککەوتنەی دوایی، بەتایبەتی چۆنکە حیزبی بەعس لەژێر گوشارێکی نێو خۆییی حیزبی و گوشاری یەکێتیی سۆڤێتدا ئەمەی ئیمزاکردووە... هتد".

ڕاستییەکەی ئەم سەمینارە بۆ ئەوە پێکنەهاتووە کە شۆرشی ئەیلوول، بە هۆکارەکانی هەڵگیرسان و هەرەسهێنانییەوە، شیبکاتەوە. لەبەر ئەوە هەر هێندە باسی شۆرش دەکەین کە پێوەندیی بە سەمینارەکەمانەوە هەیە. بەر لە هەموو شتێک دەبێ ئەوە بخەینە بەرچاو کە ئیمزاکردنی ئەو ڕێککەوتنامەیە نە بە ڕەزامەندیی دڵی بارزانی و نە بە ڕەزامەندیی دڵی بەعس بوو، و بەسەر هەردوو لادا سەپێندرابوو. لەبەر ئەوە؛ هەر لایە بەتەمای پەلاماری ناکاوی لاکەی دی بوو و متمانە لە نێواندا نەبوو. بۆیە هەر لایەک دەیویست لە شەڕی چارەنووس برینەوەدا سەرکەوێ. بەڵام ئەوە هەبوو بەعسییەکان بۆ ئەم مەبەستە هەنگاوی لەوەپێش تاووتۆکراوی ژیرانەیان دەنا، بەڵام سەرکردایەتیی شۆرش هەنگاوی سەر لێتێکچووانە و ڕێ هەڵەکردووانەی دەنا و لەمەشدا هوردە بۆرژوای هەلپەرستی نێو سەرکردایەتیی شۆرش دەستێکی باڵای هەبوو. دەقی "ئۆتۆنۆمی" ساڵی ١٩٧٠ ی بەعسییەکان وێنەیەکی کەمێک جوانکراوی ئەو دەقی "لامەرکەزییەت"ە بوو کە لە ساڵی ١٩٦٣ دا هاتە پێشەوە، و قۆپییەکی ئەو پێشنیازە بوو کە میستەر ئەدمونس نوێنەری سوپای کۆلۆنیالیستی بەریتانیا لە کوردستاندا لە لەندەن لە شەستەکاندا خستیەڕوو، کە بەپێی ئەوە

کەرکووک و گەلێک ناوچەی وەک خانەقین و هێندێک هەرێمی بادینان لەو نەخشەیەدا نەبوو، ئەگەرچی بە پێچەوانەی ئەدمونسەوە کە گوتبووی کوردستان دەبێ نێو بنرێ "سەلاحەددین"، بەعسییەکان لە ساڵی ۱۹۷۰ دا قیرسیایان لەوەش کردبوو و نێوی "کوردستان"یان بە سەر دەمدا هاتبوو.

جارێ، یەکەمین دەسکەوتی بەعسییەکان ئەوە بوو کە بەجێهێنانی رێککەوتنەکەی خستبووە چوار ساڵی دی، مەسەلەی سنووری کوردستان بە دیارینەکراوی مابوو. مەسەلەی کوردی بەغدا و خوارووی عێراق (بەتایبەتی فەیلییەکان) نەخرابووە سەر کاغەز، و گەلێک بۆشایی دی لە رێککەوتنەکەدا هەبوون، کە لە بەرژەوەندیی بەعس بوون. بەعسییەکانیش هیچ کاتی خۆیان بە فیرۆ نەدا و لەپێشەوە هاتن دەسەڵاتی خۆیان لەنێو سوپادا چەسپاند و هوردە هوردە ناکۆکیی نێوخۆییی خۆیان، کە بەزۆری لە هێڵی نازم گزار (ناظم کزار) و عەبدولخالیق سامەڕرایی دا خۆی دەنواند، لەنێو برد، هەروەها توانییان دەمی کۆمۆنیستەکان چێشتکە بکەن، بەوەی تا هەندازەیەک کوشتاریان لابرد لەسەریان و بە گەلێک بەڵێن و گفتی شیرین کە دوایی هەمووی درۆ دەرچوو، کۆمۆنیستەکانیان لە شۆرشی کورد کردەوە، و کردنیانن بە نەیاری شۆرش. هەروها توانیان لەنێو ریزەکانی شۆرشی کورددا ناکۆکی بچێنن و گەلێک کوردی وا لە شۆرش بکەنەوە و بیانکەنە دژی شۆرش کە هێندێکیان ساڵانی ساڵ خزمەتکاری بەوەفای شۆرش بوون. شان بەشانی ئەوەش توانییان نەوت "تەئمیم" بکەن و خۆیان لەنێو بەرەی دەوڵەتاندا بە دەوڵەتێکی "دژ بە ئیمپریالیزم و کۆمپانییە مۆنۆپۆلیستەکان" بدەنە قەڵەم. بێجگە لەوەش توانییان خۆیان زێتر لە سۆڤێت نێزیک بکەنەوە و پەیمانێکی دۆستایەتی و هاوکاری و پشتگیریی لەگەڵ یەک ئیمزا بکەن و سۆڤێتیش بکەنە نەیاری شۆرشی کورد، و بە پارەی زۆر وزەوەندەی نەوت چەکێکی زۆر لە سۆڤێت بکڕن و سوپای عێراقی پێ بەهێز بکەن. ئەوجا لە سنوورێکی نێو دەوڵەتاندا کەوتنە پرۆپاگەندەی ئەوەی کە گوایە شۆرشی کورد بە سەرۆکایەتیی بارزانی؛ بزووتنەوەیەکی شۆڤێنیستانەی کۆنەپەرستانەیە کە بە پەنجەی ئەمریکا و ئیسرائیل و ئێران و بەرەی ئیمپریالیزمی رۆژاوا هەڵگیرساوە بۆ رووخاندنی

حکوومەتی گوایە سۆسیالیستی پێشکەوتنخوازی بەعسی کە هەموو هەقێکی داوە بە کورد. ئێمە بۆ خزمەتی راستی و مێژوو دەبێ ئەوەش بڵێین کە کۆمۆنیستەکانی عێراق و توودەییەکانی ئێران و هێندێک لەو فەلەستینییانەی کە سەر بە دارودەستەی جۆرج حەبەش و ئەو دەمە پارە و یارمەتییان لە بەعسییەکان وەردەگرت، لەم هەنگاوەدا پشتگیریی بەعسییەکانیان زۆر کرد. ئەم لایەنانەی نێومبردن کەوتنە ئەوەی بەعسییەکان بە "پێشکەوتنخواز" و شۆرشگێڕە کوردەکان بە "کۆنەپەرست" و "نۆکەری شا" بدەنە قەڵەم.

ئەمجا هەنگاوەکانی سەرکردایەتیی شۆرش -بە پێچەوانەی هەنگاوەکانی بەعسییەکان و هاوکارەکانییانەوە- هەمووی نەزانانە و ناشییانە و بێبەرنامە بوو. لەبەر ئەوە هیچی بۆ سووتی شۆرشی کورد نەبوو.

سەرکردایەتیی شۆرش زۆر چاک دەیزانی کە بەعسییەکان خەریکی خۆ کۆکردنەوەن و نایانەوێ ئەو "ئۆتۆنۆمی"یەی کە کورد دەیەوێ، بدەن بە کوردستان. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتیی شۆرش چوار ساڵی رەبەق وەستا و چاوەڕوانی دەکرد و دەستی نەکردەوە لێیان. تەنانەت پاش ئەوەی بەعسییەکان لە ١٩٧١/٩/٢٩ دا چەند هاوکارێکی خۆیان لە جلک و بەرگی مەلای موسڵماندا نارد بۆ کوردستان بۆ کوشتنی بارزانی؛ سەرکردایەتیی شۆرش هێشتا هەر وەستا و چاوەڕوانی دەکرد، لە کاتێکدا کە زۆر چاک دەیزانی کە بەعسییەکان لەو رۆژەدا هێشتا هێندە بەهێز نەبووبوون، و تەنانەت لەنێو خۆیاندا کەرتکەرتبوون، کە بەهێزترین کەرتیان کەرتی نازم گزار بوو و لە ساڵی ١٩٧٣ دا هەوڵی دا کودەتا بکات بەڵام سەری نەگرت بۆی. بێجگە لەوەش ئەو رۆژە پارەی نەوت وەک ئەمرۆ نەرژابوو، لەشکری عێراق وەک ئەمرۆ پڕچەک نەبوو، رژێمی بەعس لەنێو دەوڵەتە گەورەکاندا هاوپەیمانی نەبوو. سۆڤێت هێشتا پەیمانی بەرگری لەگەڵ عێراقدا ئیمزا نەکردبوو، فەرەنسای ئەوسا بەپێچەوانەی ئێستاوە؛ پشتگیریی بەعسی نەدەکرد. بەم حاڵەشەوە هێشتا بەعسییەکان لە سەرکردایەتیی شورشی کورد زیرەکانەتر و زۆرزانانەتر هاتنە دەست. سەرکردایەتیی شۆرش زۆر باش دەیزانی کە

سەرکردایەتیی بەعس لەژێرەوە و بەئاشکرا خەریکی رێککەوتنە لەگەڵ شای ئێران و چەند جارێک بۆ ئەم مەسەلەیە کاربەدەستانی میسر و ترکیا و ئەردەنی کردووە بە نێوبژیکەر. تەنانەت رۆژنامەنووسی میسری محەممەد حەسەنەین هەیکەل ئەمەی بە دزیوە بە نوێنەری بارزانی لە قاهیرە گوتبوو. کەچی کاربەدەستانی شۆرش لەمە نەدەسڵەمینەوە و پێیان وابوو رێککەوتن لەنێوان بەعس و شادا نایەتە گۆڕ.

بەمانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ کە پاش ئیمزا کردنی رێککەوتننامەی ئازار؛ سەرکردایەتیی شۆرش دوو رێی لەبەردەمدا هەبوو؛ کە دەبوو یەکێکیان هەڵبژێرێ. یان ئەوەی لەگەڵ بەعس بۆ ماوەیەک رێکبکەوێ دژی شا؛ و ئەوسا لەوانەبوو، ئەو شەرەی ئەمرۆ عێراق دژی حکوومەتی خومەینی دەیکات لە دژی شا بیکردایە، یان ئەوەتا لە دەمەدەمی بەیەکادانی بەعسییەکان لەنێو خۆیاندا دەستپێشکەری خۆی بکردایە. خۆ کە یەکێکی لەم دوو رێیە هەڵنەبژارد؛ دەبوو بە هیچ جۆرێک رێی تازەبوونەوەی شەڕی نەدایە. چۆنکە هەموو ئەو نیشانانەی پێش تازەبوونەوەی شۆرش لە کایەدا بوون؛ ئەوەیان دەگەیاند کە هێزی بەرامبەر و دەسەڵاتی بەرامبەر چەندین بار لە هی کورد پتر و لێدەرترە.

پاش تێکشکانی شۆرش لە مارتی ١٩٧٥ دا، جارێکی دی بەعسییەکان لە سەرەتاوە، و کە هێشتا ئاسۆی مەسەلەکە تەواو رۆشن نەبووبووەوە، هەنگاوێکی زۆر زانایانەیان نا. نەهاتن بە ئاشکرا بکەونە دژایەتیی کورد، بەڵکو بەپێی نەخشەیەکی لەپێشەوە ئامادەکراو جووڵانەوە. جاری گوتیان "ئەمە سەرکەوتنێکی گەلی عێراقە، بە عەرەب و کوردییەوە".

لەکاتێکدا کە هەزاران خێزانی کوردیان دەگواستەوە بۆ خوارووی عێراق و هەزاران گوندیان کاولدەکرد، و سەتان کانییان بە کۆنکرێت دەگرت، و هەزاران درەختیان لە بنەوە هەڵدەکەند، و هەزاران عەرەبیان دەهێنایە کوردستانەوە؛ دەهاتن دەستیان دەدا بە پشتی کوردە هاوکارەکانیاندا و دەیانگوت "ئەوانە کۆنەپەرست بوون، ئێوە کوردی پێشکەوتنخوازن و کوردستان دەدەینە دەست ئێوە". ئەمجا سەتان رۆژنامەنووسی بێگانەیان بانگدەکرد بۆ سەردان لەو

نێوچەیەی کە بە "نێوچەی ئۆتۆنۆمی" ناسراوە. بەکورتی بەعسییەکان کە دەرزیان لە رابوردوو وەرگرتبوو، هاتن چەند مانگێک فشە کوردایەتییەکیان دروستکرد، تا مرۆڤی هەلپەرست و چڵکاوخۆر و خۆبژێن و تەنگبیر، بتوانن لە سایەیدا خۆیان مەلاس بدەن.

بەداخەوە کۆمۆنیستەکانیش هەبوون کەبۆ ئاخر شەڕییان ئەم هەنگاوەی بەعسییەکان لە یەک دوو مانگی سەرەتادا بە هەنگاوی "پێشکەوتنخوازانە" بدەنە قەڵەم. قسەکانیشیان دەچووە دڵی مرۆڤی ساویلکەوە؛ چۆنکە بەڕاستی یەکێک لە هۆکارەکانی هەرەسهێنانی شۆرش پشتبەستن بوو بە دوژمنانی نەتەوەی کورد. جا مرۆڤی ساویلکە ئەوەی بە خەیاڵدا نەدەهات بپرسێ، بۆچی دەبێ بۆ سەرکردایەتیی شۆرش خیانەت بێ ئەگەر لەگەڵ شا و بەرەی رۆژاوا یەکبگرێ، بەهیوای ئەوەی گەلێکی ژێردەستەی لە قوڕدا چەقیو دەربکێشێ، ئەگەرچی ئەمەش هەر هیوایەک بێ و هیچی دی، بەڵام بۆ سەرکردە "سۆسیالیستەکان" ی جەزائیر و کۆمۆنیستەکان نیشتمانپەروەری و سەربەرزی بێ کە چەپڵە بۆ رێککەوتنی رژێمی بەعس و رژێمی شای ئێران لێبدەن لەسەر لاشەی کوردی قوربەسەر. بێگومان ئەم هەڵوێستە لەسەر کۆمۆنیستەکان زۆر گرانکەوت. جا کە ئەمە لێرەدا دەبێژم؛ مەبەستم تەنێ ئەوەیە کە لەگەڵ مێژوو و راستیدا ناپاکی نەکەم. درۆزن و ترسنۆک ناتوانن ببنە مێژوو نووس. بێجگە لەوەش کۆمۆنیستەکان خۆشیان دانیان بە هێندێک لە هەڵەکانیاندا ناوە، بەڵام هونەر ئەوەیە هەڵە دووپات نەبێتەوە و لە هەڵە سووت وەربگیرێ.

دیارە مەبەستی بەعسییەکان لەم سیاسەتەی باسمکرد، واتە دانانی "ئۆتۆنۆمی" و سلاوکردن لە کۆمۆنیستەکان، تەنێ تاکتیکێکی کاتی بوو، لەبەر ئەوە کە شۆرش تێکشکا -وەک گوتم- دوو سێ مانگێک وەستان، ئەوجا ئەو "مافانە"ی دابوویان؛ بەرەبەرە سەندیانەوە.

خوێندنی کوردی لە نێوچەی کەرکووک و خانەقین و بادیناندا بەجارێک لابرا، و لە بەغدا کە پتر لە نیو ملوێن کورد دەژی؛ هەروەها لە هەرێمە کوردییەکانی خواروو و نێوەڕاستی عێراق وەک کووت، بەدرە، مەندەلی، زەرباتییە،

جەسسان، عەلی غەربی و ... هتددا، تاکە قوتابخانەیەکی کوردی نەکرایەوە. هەزاران خێزانی فەیلی دەرکران بۆ ئێران، و هەزاران کورد بێسەروشوێن لەنێوچوون، و سەتان کەس لە سێدارە دران، ٤٠٪ ی خوێندنی کوردی لەو دوو پارێزگەیەدا (سلەیمانی و هەولێر) کە گوایە سەر بە نێوچەی ئۆتۆنۆمین، کرا بە عەرەبی وەک هەنگاوێک بۆ لابردنی خوێندنی کوردی. ئەوەی کە پێیاندەگوت "کۆڕی زانیاری کورد"؛ هەرچەندە لە تێکدانی زمانی کوردی و بلاوکردنەوەی بیروڕای کۆنەپەرستیدا دەورێکی دیاری هەبوو، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هەر لابرا. یەکێتیی ژنانی کوردستان هەلّوەشایەوە و کرا بە بەشێک لە "یەکێتی ژنانی عێراق". ئەمجا دەستکرا بە هەلّوەشاندنەوەی هەموو نەقابەکان وەک نەقابەی مامۆستایانی کوردستان و نەقابەی کرێکارانی کوردستان. لەبەر هێندێ هۆی تایبەتی کە سووتی خۆیانی تێدابوو، تا ماوەیەک رێیان دا بە "یەکێتیی نووسەرانی کورد"، و ئەمجا ئەویشیان لەم دواییەدا هەلّوەشاندەوە و خستیانە سەر یەکێتیی نووسەرانی عێراق. ئەمە بێجگە لەوەی کە شارەکانی کوردستان پڕکران لە عەرەبی میسری و ئەردەنی و سۆدانی و فەلەستینی. جا چۆنکە بەعسییەکان هەر دوو سێ مانگێک دوای هەرەسەکە دەستیان بەوە کرد رووی راستەقینەی خۆیان بە خەلّکی پێشان بدەن، لەبەر ئەوە ئەو پروپالاّنتەیەی پاش ئەوە دەیانکرد لە دژی بارزانی و شۆرش، لەنێو کۆمەلاّنی خەلّکدا تاوێکی وای نەبوو، چۆنکە خەلّکەکە خۆی سیاسەتی بەعسییەکانی بەکردەوە بینی، و ئەم سیاسەتەی بەعسییەکان هۆکارێک بوو لەو هۆکارانەی کە جەماوەری کورد، تەنانەت ئەوانەی زۆر رەخنەیان دەگرت لە سیاسەتی سەرکردایەتیی شۆرشی ئەیلوول، باوەڕیان بە تەواوی بە رژێمی بەعس نەمێنێ. ئەمجا کە جەنگی عێراق دژی ئێران لە سالّی ١٩٨٠ دا دەستپێکرد، و پاش ماوەیەک بۆ کاربەدەستانی بەعس دەرکەوت کە پەلاماردانی دەولّەتێکی خاوەن سوپا و دەستاوێژی جەنگ و دەسەلاّتی ماددی و دانیشتوانی چل ملوێنیِ وەک ئێران، وەک ئەوە نییە کە گەلێکی بێدەسەلاّتی بێسوپای دەست و پێ رووتی وەک کورد، بێقرە و برە بتاسێنن، ئەمجا پەنایان بردەوە بەر تاکتیکە کۆنەکەیان و دەستیانکردەوە بە باسی کورد

و کوردستان. بەلاّم هەر لەپاڵ ئەوەدا و لە کۆتاییی ساڵی ۱۹۸۳ دا لەپڕ پەلاماری کەمپی بەرزانییەکانیان دا لە قوش تەپەی هەولێر و (. . . ۸) کەسێکیان لێگرتن، کە ئەوانە تا ئەمڕۆ بێسەروشوێنن. بێجگە لەوەش سەدام خۆی لە کوردستان و لە ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ۱۹۷۹ دا ئەوەی نەشاردەوە کە کورد بە بەشێک لە عێراق دەزانێ و عێراقیش بە بەشێک لە عەرەب، واتە کورد بە عەرەب دەزانێ (۳۸).

## ۸- ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لە تای تەرازوودا

"ئۆتۆنۆمی" هەرچی چۆنێک بێ و لە هەر شێوە و بەرگێکدا بێ و بەهەر لایەکدا لێکیبدەینەوە؛ هەر مانای کەمکردنەوەی ئازادیی ئەو گەلە دەگەیەنێ کە "ئۆتۆنۆمی" هەیە لەچاو ئەو گەلەدا کە دەزگەی سەنترالی دەوڵەتەکەی بە دەستەوەیە. چۆنکە ئەو گەلەی کە ئۆتۆنۆمی هەیە، مانای وایە کە هەر لە کاروباری نێوخۆییدا ئازادە، و لەو کاروبارانەدا کە پێوەندییان بە مەسەلەی نێوخۆییەوە نییە ئازاد نییە. بەکورتی؛ ئەو گەلە ئۆتۆنۆمیدارە؛ لە بەکارهێنانی هێندێک دەسەلاّتیدا بەشدارە و لە هێندێکیدا بەشدار نییە. بەلاّم لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ: داخوا چ کارێک هەیە کە پێوەندیی بە کاروباری نێوخۆیی گەلێکەوە نەبێ؟

بەر لە هەموو شتێک، جارێ دەبێ ئەوە بخەینە بەرچاو کە ئەوانەی لایەنگیری ئۆتۆنۆمین بۆ کوردستان، هەموویان لەسەر چارچێوەی دەسەلاّت و سنووری نێوچەی ئۆتۆنۆمیداری کوردستان یەک نین. هێندێک دەڵێن دەبێ گەلی کورد تەنێ لە "کاروباری خوێندەواری"دا ئازادبێ، و مەبەستیشیان لە کاروباری خوێندەواری ئەوەیە؛ کە خوێندن لە قوتابخانەکاندا بە زمانی کوردی بێ، واتە ئەو کتێبەی قوتابییەکی عەرەب یان ترک یان فارس لە دەوڵەتێکی عەرەب یان ترک یان فارسدا بە زمانی خۆی دەیخوێنێ، کوردیش هەر ئەو کتێبە بە زمانی کوردی بخوێنێ. کە دیارە -وەک دەزانین- ئەو کتێبانە گشتیان لەلایەن

ناسیۆنالیستە عەرەب و ترک و فارسەکانەوە نووسراونەتەوە، و تایبەتکارەکانی کۆمەڵگەی کورد لەو کتێبانەدا نەخراونەتە بەرچاو. وێنەی ئەم کتێبانە لە عێراقی ئەمڕۆدا زۆرە؛ لەوانە کتێبێکە بە نێوی "جوگرافیای وڵاتی عێراق" بۆ پۆلی شەشەمی سەرەتایی، نووسینی: بسام عبدالرحمن و هاوڕێکانی، وەرگێڕانی: جمال رشید عارف و هاوکارەکانی ١٩٨٣/١٩٨٤، لە ل ١٠ ی ئەم کتێبەدا نووسراوە: "ساڵی رابوردوو نیشتمانی عەرەبمان خوێند و زانیمان وڵاتی عێراقمان بەشێکە لە خاک و گەلی عەرەب و... هتد". جا وەنەبێ هەر ئەو کتێبانە وا بن کە بۆ هەموو عێراق دەردەچن، بەڵکو ئەو کتێبانەی کە گوایە لەبارەی زمان و ئەدەبیاتی کوردیشەوە دەردەچن، ناچارن لەسەر رێ و شوێنی ناسیۆنالیزمی ئەو گەلە بڕۆن بەڕێوە کە خاوەن دەوڵەتە. هەر بۆ وێنە: کتێبێک بەنێوی "زمان و ئەدەبی کوردی"یەوە بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی لە ساڵی ١٩٨٢ دا لەلایەن چەند نووسەرێکی کوردی وەک خودێلێخۆش بوو عەلائەددین سەجادی و دکتۆر عێزەددین مستەفا رەسووڵ و کێ و کێ وە دانراوە؛ کە لاپەرە ١٥٩ و ١٦٠ و ١٦١ ی تەرخانکراوە بۆ وتارێکی "سەرۆکی فەرماندەی تێکۆشەر" (سەددام حسەین) بەنێوی "دیموکراتیەت و دادپەروەری" و لە ١٦٩-١٧٢ ی تەرخانکراوە بۆ وتارێک بەنێوی "بیری عەرەبی بیرێکی مرۆڤایەتی"یە کە نووسەری بەعسی دوکتۆر عەبدوڵڵا عەبدول دائیم نووسیویێتی و لێرەدا کراوە بە کوردی. و بەنێوی "زمان و ئەدەبی کوردی"یەوە دەکرێ بە گەرووی زارۆی بێتاوانی کورددا. شایانی باسە کە هێندێک هەن کە خوێندن بە زمانی کوردی بۆ کورد تەنێ لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بە کورد رەوا دەبینن، بەڵام دەبێژن پاش قوتابخانەی سەرەتایی؛ لە نێوەندی و ئامادەییدا، دەبێ بە زمانی دەوڵەت بێ. ئەگەرچی زمانی کوردیش -وەک زمان- دەبێ بخوێنرێ. تەماشای پێشنیازەکانی حیزبی تودەی ئێران بکە بۆ ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی ئێراندا کە بەنێوی "طرح پیشنهادی حزب توده ایران درباره واگذاری خودمختاری (خودگردانی) به کردستان ایران" برگەی (١٠)، تەنانەت لە برگەی (١٢) ی هەر ئەو پێشنیازانەی حیزبی تودەدا دەبێژێ:

"دەبێ لە کوردستانی ئێراندا زانستگەیەک دابمەزرێ کە خوێندن لەو زانستگەیەشدا هەر بە زمانی فارسی بێ (ل ٩٠-٩١)". کە دێتە سەر باسی فەرمانەکانی ئۆرگانی "خودمختاری کوردستان" دەبێژێ: یەکێک لە فەرمانەکانی سەر شانی دەزگەی "خودمختار"ی کوردستان ئەوەیە "بەرگری بکات لە سەربەخۆیی و تەواوێتیی خاک و فەرمانڕەوایی ئێران بە هەموو هێزێکەوە" (ل ٩١). هێندێکی دی هەن لە لایەنگیرانی ئۆتۆنۆمی، کەمێک بەولاوە دەچن و دەڵێن: دەبێ کاروباری کۆمەڵایەتیش هەر لەلایەن کوردەکان خۆیانەوە ببرێ بەڕێوە. واتە مەسەلەی کشتوکاڵ و تەندروستیش هەر لەلایەن کوردەکان خۆیانەوە بێ. هێندێکی دی هەن کە پلەیەکیش لەمە زێتر دەچنە سەرەوە و دەبێژن: دەبێ زمانی کاروباری دادگە و بەڕێوەبەرێتیی میری لە کوردستاندا کوردی بێ، و بۆ ئەمەش دەبێ کاربەدەست و فەرمانبەرانی میری کە لە کوردستاندا کار دەکەن یان کورد بن، یان زمانی کوردی بزانن. هێندێکی دی پلەیەکی دیش لەمە ژوورتر دەڕۆن، دەڵێن کاربەدەستان لە کوردستاندا دەبێ لەلایەن کوردەکان خۆیانەوە هەڵ بژێررێن و ئەوجا ئەنجومەنێکی بەجێگەیاندن (مجلس تنفيذي) دروست ببێ، کە ئەو ئەنجومەنە بڕیارەکانی پەرلەمانێکی کوردیی نێوچەیی، بە دەنگی دانیشتوانی کوردستان هەڵبژێرراو، بخاتەکار. ئێمە نامانەوێ لێرەدا باسی ئەوە بکەین کە ئایا هەڵبژاردنێک لە بەشێکی وڵاتێکدا، ئەگەر ئەو وڵاتە تەواو دێمۆکراتی نەبوو، تا چ هەندازەیەک ئازاد دەبێ، بەڵکو ئێمە دەمانەوێ بەکورتی باسێکی ئەو مافە بنچینەییانە بکەین، کە هەموو ئەوانەی باسی "ئۆتۆنۆمی" بۆ کورد دەکەن، وەک گەڵێک؛ دەیخەنە پشتگوێ:

١- سەربەخۆیی ئابووری: واتە کورد دەبێ لەباری ئابوورییەوە پێبەندی دەسەڵاتی کرۆکی (مرکزي)ی ئەو دەوڵەتانە بێ کە لە ژێر سایەیاندا دەژی.

٢- سەربەخۆیی سوپایی: واتە کورد نابێ هیچ هێزێکی چەکداری هەبێ.

٣- سەربەخۆیی لە پێوەندیی دەرەکیدا: واتە کورد نابێ لەگەڵ هیچ

دەوڵەتێکدا پەیمان ببەستێ و لە "کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان" و گشت داوو دەزگە جیهانییەکاندا نابێ نوێنەری هەبێ.

ئامانج لە رێنەدان بە سەربەخۆیی ئابووری ئەوەیە کە ئەو سامانەی لە کوردستاندا هەیە بە دەست کورد خۆیەوە نەبێ، چۆنکە کوردستان وڵاتێکی فرە دەوڵەمەندە؛ بەتایبەتی لە نەوت و کانی ژێر زەویدا، وەک: کرۆم و کۆباڵت و گۆگرد. هەروەها وڵاتێکی بەپیت و بەرەکەتە بۆ کشتوکاڵ، زەریاچە و رووبار و دارستانی زۆرن. دیارە داگیرکەرانی کوردستان نایانەوێ ئەو پارووە چەورە بۆ کوردەکان خۆیان بەجێبهێڵن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەنەبێ سۆربوونی داگیرکەران لەسەر ئەوەی کە کورد لەباری ئابوورییەوە سەربەخۆ نەبێ، هەر لەبەر تەماعکردنە سامانی کوردستان بێ. نەخێر، داگیرکەرانی کوردستان پێیان وایە؛ ئەگەر هاتو کورد لەباری ئابوورییەوە سەربەخۆ و دەستڕۆیشتوو بوو، دەتوانێ هەنگاوێک بۆ پێشەوە بەرەو ئازادی بنێ. بەکورتی داگیرکەرانی کوردستان پێیان وایە: سەربەخۆیی ئابووری هەنگاوێکە بەرەو سەربەخۆیی سیاسی. هەر لەبەر ئەوەشە وەک هاروهاج خەریکن دەوڵەتەکانیان پیشەساز دەکەن. خۆ ئەگەر پیشەسازییەکی زۆر سووکەڵە لە کوردستاندا دابمەزرێنن؛ نایەڵن بە دەست کوردەوە بێ.

ئامانجیش لە رێنەدان بە سەربەخۆیی سوپایی؛ دیارە ئەوەیە کە داگیرکەران نایانەوێ کورد هێزێکی دەستوەشێنی ببێ تا بەرگری لە مافەکانی بکات. هەر لەبەر ئەوەشە کە داگیرکەران دژی بوونی سوپایەکی کوردن. چۆنکە دەیانەوێ، هەر کاتێک ویستیان، بە بەیاننامەیەک هەموو ئەو "مافانە"ی کورد هەیەتی؛ بیبڕن. ئامانجیش لە رێنەدان بە پێوەندییکردنی کورد بە دەوڵەتێکی بێگانە، یان دەزگەیەکی نێو نەتەوەیی و جیهانییەوە، ئەوەیە مەسەلەی کورد بە مەسەلەیەکی نێوخۆیی بدەنە قەڵەم و هەر بەو جۆرەش بیهێڵنەوە، نەک بە مەسەلەیەکی نێونەتەوەیی.

راستییەکەی، وەک لەمەوبەر گوتم، "ئۆتۆنۆمی" هەر جۆرێک بێ، چ "راستەقینە" و چ "درۆزنە"؛ ئەوا ماناکەی هەر سەربەخۆییەکی ناتەواوە. ئەو

نێوچەیەی ئۆتۆنۆمی پێدەدرێ، ناتوانێ بەجارێ لە خۆ پێوەبەستن و گوێڕایەڵیکردنی دەزگەی حکوومەتی کرۆکی (مرکزي) رزگاری ببێ. دیارە پلەی ئازادیی ئەو نێوچەیەی ئۆتۆنۆمی هەیە، بەستراوە بە جۆری رژێمی ئەو ولاتەوە کە ئۆتۆنۆمییەکەی داوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا و هەرچەندێک ئەو ولاتە رژێمەکەی دیمۆکراسی و ئازادیخوازانە بێ، هێشتا ئەو هەرێمە هەر وەک پارچەیەک لەو ولاتە تەماشا دەکرێ. بۆ وێنە: خەڵکی ئەو نێوچە ئۆتۆنۆمیدارە ناتوانن دەرگە لەسەر خۆیان دابخەن بەرامبەر رەوکردنی خەڵکی نێوچەکانی دیی ولاتەکە بۆ نێوچە ئۆتۆنۆمییەکە. ئەم دۆخە بۆ گەلێکی ئۆتۆنۆمیدار، کە بە ژمارە کەمایەتی بێ لەچاو گەلە دەوڵەتدارەکەدا، و مەترسیی ئاوەکی بوون و تواندنەوەی لێبکرێ، ناتوانێ باری دیمۆگرافیای هەرێمەکەی خۆی رابگرێ. ئەم دۆخەش بەسەر کورددا دەچەسپێ، بەتایبەتی بەسەر کوردی "کوردستانی عێراق"دا. ئێمە دەزانین ئەگەر کوردستانی عێراق بە پارچەیەک لە عێراق دابنرێ، و عێراقیش -بەرەسمی و بەپێی دەستووری بنچینەیی عێراق- بەشێکە لە ولاتی عەرەب، و هەر بەو پێیە هەموو عەرەبێک، چ عێراقی بێ و چ عێراقی نەبێ؛ مافی ئەوەی هەیە لە عێراقدا بژی. لەبەر ئەمە هیچ دوور نییە کە نێوچەی کوردستانی عێراق، کە سێ ملوێنێک کوردی تێدایە، لەماوەی ۲۰-۳۰ ساڵێکدا و هوردە هوردە هێندە عەرەبی تێنەچێ، کە ئەوسا کوردەکە خۆی ببێتە کەمایەتییەکی کەم. جا لەبەر ئەوە، ئەگەر بێتو کوردەکە خۆشی لە کوردستان دەرنەکرێ و کۆچنەدرێ و لەجێی خۆشی بمێنێتەوە، هێشتا هەر دەبێتە کەمایەتی. ئەمە تەنانەت ئەگەر دەوڵەتی عێراق دەوڵەتێکی شۆڤێنیست و دیکتاتۆریش نەبێ؛ بەڵام خۆی بە بەشێک لە "نەتەوە و نیشتمانی عەرەب" بزانێ، پاشەڕۆژی کوردستانی عێراق هەر وای لێدێ. خۆ بۆ رژێمێکی وەک بەعس شۆڤێنی دژ بە دیمۆکراسی، ئەوەتە خۆی بە هەموو جۆرێک هەوڵدەدات تامی تامی عەرەبەکانی دەرەوەی عێراق بدات کە بچن لە عێراق نیشتەجێ بن و بنە هاونیشتمانی عێراق و پارەیان دەداتێ و کاریاندەداتێ و چەکیاندەداتێ و خانوویان بۆ دروستدەکات لە هەرێمەکانی کوردستاندا، و تەنانەت سەرۆکی بەعسییەکان ئەحمەد حەسەن بەکر لە ساڵی

۱۹٦٨ دا گوتی: "هەمـوو عـەرەبێک مافی ئەوەی هەیە لەسـەر خاکی عـێراق بژی" (۳۹) و لە کانوونی دووەمی ۱۹۷٥ دا فـەرمانڕەوایانی بەعسی عێراق قـانوونێکیـان دەرکـرد کـە بەپێی ئەوە "جنسیـەی عـێـراقی بدرێ بە هەمـوو عەرەبێـک کە حەز بکات هەیبێت و بیەوێ لە بنیاتنانی عێراقدا بەشدار بێ".
دیارە عـەرەبی ئەو وڵاتانەی هەژار و رووت و برسێن وەک میـسـر و سوودان و ئەردەن، یان ئاوارەن وەک فـەلەستـینییـەکان و لوبنانییـەکان؛ ئامـادەن بچنە کـوردسـتـان و لەوێ بژین و داگیـری بکەن. ئەم سیاسـەتە ئەوەتە دەمـێکە لە خانەقین و کـەرکـووک و شەنگار و گـەلێک شوێنی دیدا خراوەتە کـار. ئەوەی ئەم سیاسەتە و هەروەها نەخشەی وێرانکردنی سلێمانی راگرت، لە پلەی یەکەم و بنچـینەدا، هەڵگیـرسـانی جـەنگی عـێـراق و ئێـران بوو، هەروەها لـە پلەی دووەمدا پەیدا بوونەوەی پێشمەرگە بە چیاکانەوە. ئەوجا کە ئەو عەرەبانە هاتنە کـوردستـانەوە، کـورد ئەو دەمـە مـافی ئەوەی نییـە و نابێ رێ لەو عـەرەبانە بگرێ، چۆنکە ئەوانیش "هاونیشتمانن" وەک کـورد. ئەگـەر کوردێک قسـەیکرد و بەرهەڵستی ئەوەی کـرد ئەو حـەلە پێیـدەگوترێ: تـۆش دەتوانیت بچـیت لە بەسرە و بەغدا و ناسریە و دلێم بژیت و دانیشیت و کار بکەیت و بخوێنیت و کـەسیش رێتلێناگرێ. ئەمـە راسـتـە، بەڵام ئەو کوردەی دەچێـتـە ئەو جێیـانەی نێوبـراو؛ لەسـەرخۆ دەبێـتـە عـەرەب. خـۆشی نەبێـتـە عـەرەب منالەکـانی دەبنە عـەرەب و لە کـولتـووری کـورد بێبـەری دەبن. چۆنـکە زمـانی رەسـمی و زمـانی خوێندن لەو جێیـانە تەنێ عـەرەبییـە، بەڵام ئەو عەرەبەی دێتە کـوردسـتـانەوە، پێویستی تەنانەت بە فـێـربوونی کـوردیش نییـە، ئەگـەر خۆی نەیەوێ، چۆنکە زمانی عەرەبی لە کـوردسـتـاندا لەپاڵ زمانی کـوردییەوە؛ زمـانێکی رەسـمییە و منالەکـانی دەتوانن بە عــەرەبی بخـوێنن چۆنـکە قـوتابخـانەی عـەرەبی لە کــوردســتــاندا هەن، و دەوڵەتیش دەوڵەتی عـەرەبە و عـێـراقـیش بە پارچە کوردستانەکەیەوە بەشێکە لە "نیشتمـانی عەرەب" بەپێی قانوون. ئەوەش دەبێ بزانین کـە بە عـەرەبکردنی خواروی کـورستـانیش هەنگاو بە هەنگاو نەخشـە کێشراوە بۆی. سەددام حسـەین لە مانگی ئابی ۱۹۸۳ دا لە چاوپێکەوتنێکی کۆمەڵێک هەولێریدا گوتی: "هەولێر - ئێستا مەڵبەندی ئۆتۆنۆمییە، پشت بە

خوا لە پاشەڕۆژدا پایتەختی هاوینەی هەموو عێراق دەبێ. بەر لە شەڕ نەخشەمان دانابوو پایتەختێکی هاوینە بۆ هەموو عێراق دروستبکەین لە شوێنێکی هەولێر، بەجۆرێ حکوومەت لە هاویندا بگوێزرێتەوە بۆ هەولێر -.و پشت بە خوا ئەم بیرە دوای شەڕ جێبەجێ دەبێ... هتد" (٤٠)

ئەمجا ئێستە ئەگەر مەبەستی ئەوانەی باسی "ئۆتۆنۆمیی راستەقینە" دەکەن، جۆرە "ئۆتۆنۆمییەک" بێ کە بەپێی قانوون: زمانی رەسمی لە کوردستاندا هەر کوردی بێ، و عەرەب و هەر کەسێکی دی، جگە لەو کەمایەتییانەی کە لە بنەڕەتەوە خەڵکی کوردستانن و مافی ناسیۆنالی خۆیان دەبێ، ناچار بن کاروباری رەسمییان بە زمانی کوردی ببەن بە ڕێوە، و ژمارەی ئەوانەی کوردستانی نین و دێنە کوردستانەوە بۆ نیشتەجێبوون، لەلایەن حکوومەتی "ئۆتۆنۆمی"ی کوردستانەوە سنووردیار (تحديد) بکرێ، بێجگە لەوەش هێزێکی سوپایی وەها ببێ کە هەموو دەستدرێژییەکی دەرەوە بداتە دواوە؛ دیارە ئەو کاتەش -داوای لێبووردن دەکەم لە گوێگران و لەوانەی باسی ئەو جۆرە ئۆتۆنۆمییە دەکەن- ئەوە نێو نانرێ ئۆتۆنۆمی و ئەوسا نێوێکی دی دەبێ، فیدەراسیۆن، یان کۆنفیدەراسیۆن، و بگرە هێندێک وڵات هەن کە رژێمەکەیان فیدەراڵییە، و هەر وڵاتێکیان سوپایەکی تایبەتیشی نییە. ئۆتۆنۆمی بریتی نییە لە یەکگرتنی چەند دەوڵەتێک بە شێوەیەکی فیدراڵی؛ تا سنووری جیاواز و سوپای جیاواز هەبێ. ئۆتۆنۆمی بریتییە لە دانی هێندێک دەسەڵاتی نێوەندیی دەوڵەتی بە بەشێک لەو وڵاتە یان بە بەشێک لەو گەلە؛ بە سەرپەرشتیی حکوومەتی نێوەندی (مركزي)، و هیچی دی.

جا کە "ئۆتۆنۆمی" بەشێک بێ لەو دەسەڵاتەی کە حکوومەتێکی نێوەندی (مرکزي) دەیدا بە حکوومەتێکی هەرێمی، ئەوا دەبێ بزانرێ کە ئەم دەسەڵاتپێدانە تەنێ لە سای سێبەری رژێمێکی دیمۆکراسیدا شێوای هێنانەدی و شێوای رێز لێگرتن و بەردەوامییە. بە پێچەوانەی ئەمەوە، ئۆتۆنۆمی لە سای سێبەری رژێمی نادیمۆکراسی و دیکتاتۆریدا شێوای هێنانەدی نییە، و خۆ ئەگەر لەژێر تاوی هێندێک زرووفی تایبەتیشدا هاتەدی، ئەوا تاسەر بەرگە

ناگرێ، چۆنکە یەکێک لە سروشتەکانی رژێمی دیکتاتۆری ئەوەیە هەموو دەسەلاتێک دەخاتە ژێر دەست خۆیەوە و لە هیچ بەشێکی نایەتە خوارێ. خۆ ئەگەر لەبەر هۆیەکی تایبەتی و.لە کاتێکی تایبەتیدا لە بەشێکی هاتە خوارێ، ئەوا هەر هەلێک هەلکەوت بۆی، وەریدەگرێتەوە، و تاقیکردنەوەی تالو تفتی چارەکە چەرخێکی کورد لە عێراقدا؛ نموونەیەکی خۆیایە بۆ ئەمە.

بەکورتی؛ ئۆتۆنۆمی بۆ ئەو پارچە کوردستانەی کە نووسێنراوە بە دەولەتێک لەم دەولەتانەوە؛ بەجۆری رژێمی ئەو دەولەتەوە بەستراوە. جا لەبەر ئەوە ئۆتۆنۆمیویستەکانی کورد لەوەدا بە هەلە نەچوون؛ کە لەپال "ئۆتۆنۆمی"دا، داوای "دیمۆکراسی" بۆ ئەو ولاتە دەکەن کە کوردستان خراوەتە سنوورەکەیەوە. بەلام لەگەل ئەوەشدا دەبینین کە ئۆتۆنۆمیویستەکانی کورد زۆرجار هەر خۆیان خۆیان بە درۆ دەخەنەوە، کاتێک دەکەونە وتووێژ لەگەل ئەو رژێمە نێوەندییە دژ بە دیمۆکراسییانەوە، کە دەسەلاتی نێوەندییان کەوتووەتە دەست و بە ملهوری فەرمانرەوایی کوردستان دەکەن. جا لەبەر ئەوەی ئۆتۆنۆمی و دیمۆکراسی لە یەک جیا ناکرێنەوە؛ ئەوا هیچ کاتێک دەولەتێکی نادیمۆکراسی ئامادە نییە و نابێ؛ مافی "ئۆتۆنۆمی" بدات بە کورد و لەم رووەوە هەموو وتووێژێک لەگەل ئەو رژێمانەدا بێ ئەنجام و کات بەفیرۆدان و خۆ هەلخەلەتاندن و فریودانی رەشە خەلکە و هیچ دیکتاتۆرێکیش بە دەمەتەقێ و ماستاو بۆ ساردکردنەوە نابێتە دیمۆکرات.

کەواتە، ئەوانەی ئۆتۆنۆمیویستن؛ دەبێ لە پێشدا رژێمەکە بگۆرن، ئەوجا داوای ئۆتۆنۆمی بکەن. نەک وەک ئێستە؛ لە رژێمی دیکتاتۆر داوا بکەن ئۆتۆنۆمی بدات بە کورد و خۆی بکاتە رژێمێکی دیمۆکراتی. هەلگرتنی دروشمی "ئۆتۆنۆمی" بۆ کوردستان و "دیمۆکراسی" بۆ عێراق، یان ئێران... هتد قسەیەکی زیندەیە وەک ئەوەی تۆ بێژیت سوێد و ستۆکهۆلم، چۆنکە ئۆتۆنۆمی خۆی بەشێکە جیا ناکرێتەوە لە دیمۆکراسی. لەبەر ئەوە کە رۆژێک لە رۆژان رژێمێکی دیمۆکراسی لەم دەولەتانەدا هاتە کایە، مەبەستیشم لە دیمۆکراسی دیمۆکراسییە بە هەموو مانای وشە، نەک هەر بە قسە و لەسەر

کاغەز و فرتو فێڵ، یان کلکو گوێ دروستکردن بۆ دیمۆکراسی بەنێوی "دیمۆکراسی شۆڕشگێڕانە" یان "دیمۆکراسی پرۆلیتارانە" یان "دیمۆکراسی ئۆتۆریتێرانە" و"ئیسلامییانە"... ویان هتد، ئەو دەمە بە هەموو دڵنیاییەکەوە دەبێژم؛ کە یەکێک لەو مافە سەرەکییانە کە ئەو ڕژێمە دەیدا "ئۆتۆنۆمیی کورد" دەبێ، بەڵام بەنێوی مافی "بەشێک لە هاونیشتمانان"ی ئەو دەوڵەتە، نەک مافی نەتەوەیەکی کوردی خاوەن خاکی کوردستانی خۆی. ئەمجا ئەگەر ئەو ئۆتۆنۆمیستانە بەمە دادەکەون و بۆ ئەمە هەوڵدەدەن، ئەوا جارێ دەبێ پێش باسی ئۆتۆنۆمی؛ بکەونە گۆڕینی ڕژێم و دامەزراندنی ڕژێمێکی دیمۆکراتی، و ئەو دەمە بەنێوی "هاونیشتمان"ەوە بکەونە داواکردنی مافی ئۆتۆنۆمی لەڕێی ئێمزا کۆکردنەوە و گشتپرسی و پەرلەمان و مێتۆدە دیمۆکراتییەکانی دیکەوە. خۆ کە مەسەلەش هاتە سەر گۆڕینی ڕژێم، ئەوا دیارە پێویست ناکات کە هەر ئۆتۆنۆمیویستەکانی کورد دەست بدەنە چەک و ساڵانی ساڵ بدەنە کەژ و کێو و لەشکری بێگانە ماوەی چارەکە چەرخێک بە هەموو چەکێکی قڕکەر بکەوێتە درووێنەی گیانی ژن و پیاو و زاڕۆی کورد و کاولکردنی گوند و شار و بڕینەوەی دار و درەخت و دەربەدەرکردنی سەت هەزاران کورد و ئاوارە کردنیان بۆ هەندەران کە ئێوەی ئاوارەی دانیشتووی سوێد، بەشێکن لەو ماڵوێرانانە. ئەمجا سەرەڕای ئەم قوربانییە قورسەش، ئەنجامەکەی ئەوەبێ کە هەمووان دەیزانین و ئەگەر درۆ لەگەڵ خۆمان نەکەین، دەبێ بێژین لە خوار سفرەوەیە. بەڵێ ئەمە وایە، چۆنکە مەسەلەی "ئۆتۆنۆمی" مەسەلەیەکی نێوخۆیی و گۆڕینی باری سیاسیی نێو خۆیی دەوڵەتێک، پێویستی بە هاودەنگی و هاوکاری هەموو دانیشتووانی ژێر سایەی ئەو دەوڵەتە هەیە و بە بەشێکی دانیشتووانی ئەو دەوڵەتە؛ بەتایبەتی کە زۆریان نەڕوا، نایەتە گۆڕین. هەر لەبەر ئەمەشە کە پێشمەرگەی کورد -سەرەڕای هەموو ئازایەتی و لەخۆبوردنێکی- تا ئێستە نەیتوانیوە ڕژێمی عێراق بگۆڕێ، بەڵکو ئەو دەورەی پێشمەرگە دیویەتی؛ بریتی بووە لە شپرزەکردن و بێهێزکردنی سەرکردەکانی ڕژێمی دیکتاتۆری عێراق، نەک خستن و هاتنە جێی. بەڵکو ڕێخۆشکردن بۆ ڕکەبەرانی ئەو سەرکردانە لەنێو ڕژێمەکە خۆیدا، کە ئەوانیش هەلیان بۆ هەڵکەوتووە و بە کودەتایەک

جێنی سەرکردە ناحەزەکانی خۆیان گرتووەتەوە و رژێمیش هەر وەک خۆی ماوەتەوە، کەر هەر ئەو کەرە و کورتانەکەی گۆڕاوە. بۆ وێنە": شۆرشی کورد لە ئەیلوولی ۱۹٦۱ ەوە تا شوباتی ۱۹٦۳ قاسمی وا بێ هێز کرد؛ کە بەعسییەکان توانیان زۆر بە ئاسانی بە کلاوێک بیگرن و خۆیان بێنە جێی. تازەبوونەوەی شۆرش لە حوزەیرانی ساڵی ۱۹٦۳ دا دژی بەعسییەکان، کارێکی وایکرد کە بەعسییەکان هێندە بێهێز بن، کۆنە هاورێکەی خۆیان عەبدولسەلام عارف توانی بە رۆژێک تەفرو توونایان بکات و خۆی ببێتە سەرگەورەی تەواو. ئەوجا شەڕی ساردی نێوان پێشمەرگەی کورد و سوپای عارف هەر لە ٦٦ ەوە تا ٦٨؛ رێی بۆ بەعسییەکان کردەوە کە عارف لە ۱۹٦۸دا بڕووخێنن و جارێکی دی بێنە سەرکار و هەروەها... ئەوەتە لە کوردستانی ئێرانیشدا پێشمەرگەی کورد ئەمە پێنج ساڵ پترە خۆی بە کوشت دەدات، کەچی بەختیار و بەنی سەدر و رەجەوی و "رەزای دووەم"، دانی خۆیان تیژکردەوە بێنە سەرکار و هیچ کامێکیشیان دان بەوەدا نانێ کە کورد "گەل"ە. تەنانەت یەکێکی وەک مەسعوودی رەجەوی، سەرکردەی "مجاهدین خلق" کە لایەنگرە راکردووەکانی لەترسی ژیانی خۆیان، لە کوردستاندا پەنابەرن، نەتەوەی کورد بە "دانیشتوان" (مردم کرد) دەداتە قەڵەم نەک بە "گەل" یان "نەتەوەی کورد" و سەری زمان و بنی زمانی رەجەوی باسی "تمامیت ارضی" (تەواوێتیی خاک)ی ئێرانە!!!.

مەسعوودی رەجوی لە پرۆگرامی "خودمختاری"دا بۆ کوردستان، کە "شورای ملی مقاومت"یش - کە ئەو دەمە حیزبی دیمۆکراتی کوردستانیش ئەندامی بوو، لە مانگیی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۸۳ دا ئیمزای کردووە باسی "خودمختاری کوردستان لە سنووری تەواوێتیی خاکیی ئێران و یەکێتیی نیشتمانی"دا دەکات، بەڵام بە ئاشکرا و هەر لە ئێستەوە دان بەوەدا دەنێ کە ئەم بڕیارەی "شورای ملی مقاومت"، وەک هەموو بڕیارەکانی "شورای ملی مقاومت" نابنە "بەشێک لە دەستووری بنچینەیی پاشەڕۆژی کۆماری ئێران؛ تا ئەو دەستوورە لەلایەن" مجلس مؤسسان"ەوە سەر ڕاست (تصدیق) نەکرێ. ئەوجا "مجلس مؤسسان" ێک کە یەک یان دوو کوردی تێدا بێ؛ دەبێ کورد هەر لە

ئێستەوە فاتیحا بۆ "خودمختاری" ی دیاریی رەجەوی بخوێنێ.

خۆ لە باری بڕینەوەی سنووری کوردستانی ئێرانەوە، رەجەوی هەر لەو بەیانەدا دەبێژێ کە ئەوە دەبێ بە "گشتپرسی" بێ. ئەم قسەیە، واتە بڕینەوەی سنووری کوردستان بە "گشتپرسی" لە پرۆگرامی "جوقد"یشدا هەر وایە.

جارێکی دی دووپاتی دەکەمەوە، مەسەلەی ئۆتۆنۆمی مەسەلەی دێمۆکراتیزە کردنی ئەو دەوڵەتانەن کە کوردستانیان دابەشکردووە. بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئایە هێزی هوردە بۆرژوای کورد هەروەها هێزە بەرهەڵستکەرە عەرەب و فارس و ترکەکان کە ئەمڕۆ باسی "دێمۆکراسی" و "ئۆتۆنۆمی" دەکەن؛ ئەوەیان لەباردایە کە بەشداربکەن لە دێمۆکراتیزە کردنی ئەو دەوڵەتانەدا ؟

بۆ وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ تەماشای قسەی زلی پفهەڵدراو و بانگاشەی رووت نەکەین؛ بەڵکو جارێ تەماشایەکی کارو کردەوەی ئەم هێزانە بکەین کە وان لەسەر شانۆی سیاسەتی کوردایەتی. ئەو هێزانەی کەوا ئەمڕۆ لەسەر کار نین و دەزگەی دەوڵەتییان بە دەستەوە نییە و هەر یەکە تەنێ ژمارەیەک پێشمەرگەیان لەگەڵە، کەچی ئەوەتە بەربوونەتە گیانی یەکدی و پێشمەرگە و لایەنگرانیان هاندەدەن پەلاماری پێشمەرگە و لایەنگرانی ئەوانی دی بدەن و دەست بوەشێنن لێیان، هەر لەبەر ئەوەی ئەوانی دی لە رێکخراوی دیکەدان، یان بیرو باوەڕێکی دیکەیان هەیە جیا لە خۆیان. بەڕاستی هێندەی ئەم حیزبە کوردییانە لە پێشمەرگە و لایەنگیرانی یەکدییان کوشتووە، داگیرکەرانی کوردستان بە هەموو دڕندەیەتییەکیانەوە نەیانتوانیوە هێندە پێشمەرگەی کورد بکوژن. ئێستە ئەمانە ئەمە هێزەکەیانە و ئەمەش دەسەڵاتەکەیانە و وا دەکەن، ئەوجا ئایە بە زەحمەت ناچێتە مێشکەوە کە ئەگەر گریمان ئەمانە سبەی رۆژێک دەسەڵاتی دەوڵەتییان گرتە دەست، کە ئەوەش شتێکی یەکجار دوورە – هەروا لەخۆیانەوە ببنە مرۆڤی دێمۆکراسی و کۆتری ئاشتی؟

دەزانم ئەم قسانە زۆر ڕەقن، بەلاّم بەداخەوە هەقن، و وەکو عەرەبەکە دەبێژێ: "ئەوی لە هەق بێدەنگ بێ، شەیتانێکی لالە". جا وەنەبێ ئەمە هەر حالّی هوردە بۆرژوای کوردی نێوچەکە بێ، بەلّکو ئەو عەرەب و ترک و فارسانەش کە لە بەرەی بەرهەلّستکەراندان و گوایە هێندێکیان لەگەلّ بەرهەلّستکەرانی کورددا بۆ "دێمۆکراسی" و "ئۆتۆنۆمیی کوردستان" هەولّدەدەن، وە نەبێ زۆربەیان لە زۆربەی بەرهەلّستکەرانی کورد جیاواز بن، لەبەر ئەوە مرۆڤ دەبێ بە چاوێکی ڕەشەوە تەماشای مەسەلەی دێمۆکراتیزە کردن، و ئۆتۆنۆمیشی لەگەلّ، بکات.

## ٩- "بێ دەولّەتی" بۆ گەلی کورد مانای چی

نەبوونی "دەولّەت" بۆ هەر گەلێک؛ مانای وایە ئەو گەلە دەزگەیەکی دەسەلاّتداری نییە کە هێندێک گەلی دی هەیانە. جا لەبەر ئەوەی خاوەنێتی (هەبوون) مانای هی خۆیی (ملّکایەتی)یە و هی خۆییش، مانای دەسەلاّتە، دیارە ئەو گەلەی خاوەنی دەولّەت نییە؛ بێبەشکراوە لەو دەسەلاّتانەی دەزگەیەکی دەسەلاّتدار هەیەتی، و بەهۆی ئەوەشەوە بێبەشکراوە لەو دەسەلاّتانەی کە ئەو ملّکایەتییە بە خاوەنەکەی دەدا. جا لەبەر ئەوەی بوونی دەسەلاّت: مانای بوونی ئازادییە، دیارە ئەو گەلەی "دەولّەت"ی نییە، ئەو ئازادییانەی نییە کە گەلە دەولّەتدارەکان هەیانە. بە کورتی: گەلی بێدەولّەت کەمترە لەو گەلەی دەولّەتی هەیە. ئەمە لەباری نرخی مرۆڤایەتییەوە، لەباری واقعیشەوە؛ ئەو گەلەی دەولّەتی نییە، ناتوانێ کەلّک لەو هەل و دەسەلاّتانە وەربگرێ کە گەلێکی خاوەن دەولّەت وەریدەگرێ، وەک پاراستنی ئەو ئەرزەی لەسەری دەژی، و پاراستنی زمان و کولتوور و جۆری ژیانی کۆمەلاّیەتیی خۆی. هەروەها لەکاتی تەنگانەدا ناتوانێ دەنگی خۆی بە شێوەیەکی کارا بگەیەنێتە دەزگە جیهانییەکان. بۆ وێنە: گەلی کورد لەو چەند دەولّەتەدا کە ئەمرۆ لە سنوورەکانیدا دەژی، چونکە خاوەنی دەولّەتی خۆی نییە؛ نرخی کەمترە لە عەرەب و ترک و فارس کە خاوەنی دەولّەتەکانی عێراق و ترکیا و

سووریا و ئێرانن. لە ترکیا، دان بە بوونی کورددا نانرێ و بە "ترکی کێوی" دەدرێتە قەڵەم، لە عێراق و سووریادا بە بەشێک لە "نەتەوەی عەرەب"، لە ئێرانیشدا بە "تیرەیەکی کۆنی فارس" یان "برایەکی موسڵمان". هۆی ئەوەی کە کورد لە هیچ لایەک بە "گەلێکی سەربەخۆ" نادرێتە قەڵەم، ئەوەیە کە کورد دەوڵەتی نییە، و ئەو چەند دەوڵەتەی باسکران هیچیان دەوڵەتی کورد نین. ئەگەنا ئەگەر وا نەبێ بۆچی ترک و عەرەب و فارس بە "نەتەوە" دەژمێررێن بەڵام کورد بە "گەلێکی سەربەخۆ" نادرێتە قەڵەم، ئەگەرچی کورد لەگەڵ ترک و عەرەب و فارسدا دەژی و هەر لە سنووری ئەو دەوڵەتانەدا دەژی، کە ئەوان تێیدا دەژین. جا لەبەر ئەوە هەموو باسێکی "برایەتی"ی کورد و عەرەب و کورد و ترک و کورد و فارس، کە هێندێک لە داگیرکەرەکانی کوردستان و هێزە چەپییەکان دەیکەن؛ هەمووی درۆیەکی رووتە و بۆ تەفرەدانە و ئەو عەرەب و ترک و فارسانەی ئازادیخوازن؛ نابێ بێژن "بژی برایەتیی کورد و عەرەب یان کورد و ترک یان کورد و فارس" چونکە ئەو برایەتییە نییە تا بژی، برایەتی مانای وەکیەکییە، وەکیەکیش ئەمڕۆ لە ئارادا نییە، لەبەر ئەوە دەبێ جارێ هەوڵبدەن ئەو برایەتییە لەرێی وەکیەکییەوە دروستبکەن، ئەوجا باسی بکەن و بێژن "بژی"!.

نەبوونی دەوڵەتی کورد مانای وایە کە بوونی کورد خۆی لەبەر مەترسی نەماندایە، چونکە هەر دەزگەی دەوڵەتییە کە لە زرووفی ئەمڕۆدا دەتوانێ خاکی نەتەوەیەک بپارێزێ لە دەستدرێژکەران، و هەر ئەویشە کە لە جیهانی ئەمڕۆدا دەتوانێ رەوایەتییەکی قانوونی بۆ ئەوە دروستبکات کە خاکی ولاتێکماڵی نەتەوەیەکە. نەبوونی دەوڵەتی کورد؛ مانای وایە ئەو خاکەی کوردستان کە چەند هەزار ساڵێکە نیشتمانی نەتەوەی کوردە؛ بە ماڵی کورد نەدرێتە قەڵەم؛ بەڵکو بە ماڵی ئەو دەوڵەتانەی کە خاکی کوردستانیان بەشکردووە و هیچیشیان دەوڵەتی کورد نین. جا لەبەر ئەوەی خاکی کوردستان بە ماڵی کورد نازانرێ؛ دیارە هیچ جۆرە زامنێکیش نییە بۆ ئەوەی کە کورد دەتوانێ لەسەر خاکەکەی خۆی بژی و بمێنێتەوە. گەلێک لەو پرۆژانەی کە بۆ کۆچپێکردنی کورد سازکراون وەک پشتێنی عەرەب (الحزام العربي) لە سووریا کە لە ساڵی

۱۹٦۲ ەوە دەستیپێکرا، بەوەی کورد لەسەر سنووری کوردستانی عێراق و ترکیا کۆچپێبدرێ و ئەرزەکەیان بدرێ بە عەرەب، و ئەو پرۆژانەی کە لە عێراق لەپاش هەرەسهێنانی شۆرشی ئەیلوول سازکرا کە بە قوولی ۲۰ کیلۆمەتر کورد لەسەر سنوورەکانی کوردستانی ئێران و ترکیا گوێزرانەوە و بەزۆر خرانە خانووی وەک کولانە مریشکەوە. یان رەوانە کران بۆ خوارووی عێراق.

هەروەها ئەو پرۆژەیەی کە حکوومەتی Turgut Özal لە ترکیا لە ساڵی ۱۹۸٤ دا خستیە کار و گەلێک گوندی لەسەر سنووری کوردستانی عێراق، کە کەوتوونەتە مەڵبەندی هەکارییەوە بەزۆر بە خەڵکەکەی چۆڵکرد، بێجگە لەوەش ئەو پرۆژانەی کە لە کۆندا هەبوون بۆ کۆچپێکردنی کوردی هەمەوەند لە زەمانی عوسمانیدا بۆ نێو ترک، و کۆچپێکردنی کوردی ژووروی کوردستان لە دەورانی ئەتاترکدا بۆ رۆژاوای ترکیا، و کۆچپێکردنی گەڵباخی لە زەمانی سەفەوییەکاندا، و کۆچپێکردنی گەلێک هۆزی کورد لە زەمانی رەزا شادا و... هتد. شان بەشانی ئەمانە نیشتەجێکردنی ترک لە ژووروی کوردستاندا لە زەمانی ئەتاترکدا و تا ئێستەش، و نیشتەجێکردنی عەرەب لە حەویجە و شارەزوور لە زەمانی مەلیک فەیسەڵی یەکەمدا لە عێراق، و نیشتەجێکردنی عەرەب لە کەرکووک و خانەقین و شەنگار و .. هتد لە ساڵی ۱۹٦۳ ەوە تا ئێستە لە عێراقدا، و نیشتەجێکردنی فارس لە زەمانی حەمە رەزا شادا لە سنە و کرماشان و ... هتد.

ئەمانە هەموو زەنگی خەتەر لێدەدەن بۆ کورد، و نیشانەیەکی ئاشکران بۆ هەوڵدانی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان دابەشکردووە بە نیازی لەنێوبردنی کورد.

بێجگە لەوەش هەر بزووتنەوەیەکی کوردی روو بدات، یان هەر کاتێک کورد شۆرشێک هەڵبگیرسێنێ لە دژی ژێردەستەیی و چەوسانەوە، و هەر هاوارێک بکات لە دژی زوڵم و زۆری ئەم دەوڵەتانە؛ ئەوا چۆنکە خۆی دەوڵەتی نییە، مەسەلەکەی بە مەسەلەیەکی "نێوخۆیی" دەدرێتە قەڵەم و دەکرێ بە ژێر لێوەوە. خۆ ئەگەر دەوڵەتی ببوایە، و لەلایەن هێزێکی بێگانەوە دەستدرێژی بکرایە

سەری، ئەوا دەستبەجێ دەیتوانی لە سنوورێکی جیهانی و نێو جیهانیدا مەسەلەکەی بهێنێتە پێشەوە، و هەر ڕۆژێک لە ڕۆژان لەشکری بێگانەی لە وڵاتەکەی دەکردە دەرەوە. بۆ گەیشتنە ئەوەش دەیتوانی بە سەربەستی لە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا مەسەلەی خۆی باسبکات و لەگەڵ هەر دەوڵەتێکدا کە ئارەزووی بێ، پەیمان ببەستێ بۆ دەسکەوتی خۆی. سەبارەت بەمەیە کە داگیرکەرانی کوردستان هەمیشە هەوڵدەدەن مەسەلەی کورد بە مەسەلەیەکی نێوخۆیی بهێڵنەوە. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە کاژێک لە ١٣ی مایسی ١٩٦٤ دا، واتە ٢١ ساڵ لەمەوبەر لە بیرخەرەوەیەکدا کە بۆ سەرۆک بارزانی نووسی بوو، داوای کردبوو لێی کە "لە کاتێکدا شەڕ دەستپێکردەوە، دەبێ مەسەلەکەمان لە مەسەلەیەکی نێوخۆییەوە بگەیەنینە مەسەلەیەکی نێو دەوڵەتان" (٤١).

## ١٠- بڕیاری چارەنووس لە ئازادیدا و بۆ ئازادی

درۆشمی "بڕیاری چارەنووس لە ئازادیدا و بۆ ئازادی" -وەک لەمەوبەر گوتم- درۆشمی هاوبیران و لایەنگیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزمە. ماوەیەک لەمەوبەر "بنکەی چاپەمەنیی ئازاد" لە سوێد، نامیلکەیەکی منی بڵاوکردەوە بەنێوی "هێندێک لە کێشە بنەڕەتییەکانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم"ەوە، کە لەوێدا هێندێک لە سەرەتا بیرییەکانی ئەم قوتابخانەیەم ڕۆنکردەوە. وەک: ئازادی، یەکسانی، دەسەڵات، ستراتیژ، تاکتیک، هێخۆیی، سەختگیری کوێرانە و بینایانە، لایەنگیری و بێلایەنی، زانست و هەڵوێست و ... هتد. پێدەچێ هێندێک لەوانەی لەم کۆڕەی ئەمڕۆدا بەشدارن ئەو نامیلکەیەیان خوێندبێتەوە. ئەوەی بۆ ئەم سەمینارەی ئەمڕۆ مەبەست بێ، تەنێ ئەو لایەنەی ئەم قوتابخانەیە کە پێوەندیی بە مەسەلەی نەتەوەوە هەیە کە بەو ڕێیەش دەگوترێ "بیری نەتەوەیی". شایانی باسە، کە پار لەسەر "بیری نەتەوەییی کوردی" و جیاکردنەوەی لە بیری ناسیۆنالیزمی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژاوایی؛ سەمینارێکم لێرە، لە ستۆکهۆڵم، پێشکێشکرد، کە ئەمساڵ چاپکرا و لەم

رۆژانەدا بلاْوکرایەوە، و گوێگری بەڕێزیش دەتوانێ بگەڕێتەوە سەری. بێجگە لەوەش لەو باسەدا، کە وەک لێکۆڵینەوەیەک بۆ گۆڤاری "نیشتمان"م نووسیوە لەساڵی ١٩٨٣ دا و بە بۆنەی تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر گۆڤاری "نیشتمان"دا، هەر لەوێدا بەندێکم تەرخانکردووە بۆ "بیری نەتەوەیی کوردی" و ناسیۆنالیزم. هیوام وایە ئەو بەرهەمەش هەر ئەمساڵ بکەوێتە دەست خوێنەرە بەڕێزەکان.

بەپێی "قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم"، هەموو مرۆڤێکی ژیر بیر دەکاتەوە و هەموو ژیندارێکی بیرکەرەوەش مرۆڤە. واتە: بیرکردنەوە خۆماڵێکی مرۆڤە. بیری مرۆڤی ژیر؛ خۆی لە ئازادیدا دەردەبڕێ، کە ئازادی سروشتێکی خۆڕسکی و بنەڕەتیی هەموو مرۆڤێکی ژیرە؛ بە درێژاییی ژیانی. جا لەبەر ئەوەی ئازادی تایبەتکارێکی مرۆڤە، واتە بەشێکە لە مرۆڤ خۆی، لەبەر ئەوە شێوای کڕین و فرۆشتن و بەدیاریدان و بە میراتبردن نییە، جا لەبەر ئەوەی "مرۆڤایەتی" خۆی "یەکەیەکە" شێوای کەرتکەرتکردن نییە. دیارە ئازادی، وەک تایبەتکارێکی مرۆڤ، واتە بەشێک لە مرۆڤ خۆی، ئەویش شێوای کەرتکەرتکردن نییە. بەکورتی ئازادیی مرۆڤ زۆری و کەمی و پلە بۆ دانان هەڵناگرێ.

واتە؛ تۆ ناتوانیت بێژیت مرۆڤی (A) مافی ئازادیی پترە لە مرۆڤی (B)، چۆنکە کاتێک ئازادی تایبەتکارێکی خۆزا و خۆڕسکی مرۆڤ بێ؛ ئەوسا لەنێوان "بوونی ئازادی" و "نەبوونی ئازادی"دا سنوورێک نابێ ببێ. وەک چۆن لە نێوان "ژیان" و "مردن"دا، کە هەردووکیان دوو تایبەتکاری خۆڕسکی و خۆییی مرۆڤن، سنوورێک نییە، واتە: ناتوانیت بێژیت: "رۆستەم کەمێک مرد، یان نەختێک دەژی"، بەڵکو دەبێ بێژیت: رۆستەم مرد، یان نەمرد". هەروەها پێویستە بێژیت: "رۆستەم دەبێ ئازاد بێ وەک هەموو مرۆڤێکی دی، یان ئازاد نەبێ". ئەوجا کە گوتت "دەبێ ئازاد نەبێ"، دەبێ تەڤی ئەوەش بێژیت "وەک هەموو نامرۆڤێک"، چۆنکە "نەبوونیی ئازادی" مانای سەندنەوەی تایبەتکارێکی خۆڕسکییە لە مرۆڤ، کە بەبێ ئەو تایبەتکارە لە مرۆڤێتیی

ڕاستەقینە دەکەوێ.

ئەوجا "ئازادی" کە خۆی تایبەتکارێکی مرۆڤی ژیرە -مرۆڤی ژیریش هەر بەم پێیە ئەو مرۆڤەیە کە دژی ئازادی نەبێ- هەر کاتێک "ئازادی" کەوتە مەیدانی کردەوە لە کۆمەڵگەیەکدا، ئەوا خۆی لە شێوەی یەکسانیدا دەنوێنێ. واتە: یەکسانی بریتییە لە خستنەکاری تایبەتکاری ئازادیی مرۆڤ، یەکسانیش لەنێوان مرۆڤ و مرۆڤێکی دیدا تەنێ دەتوانێ لە یەکسانیی دەسەڵاتدا خۆی بنوێنێ. چونکە "یەکسانیی لە دەسەڵات"دا هەموو جۆرە مافەکانی دی لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە.

ئەوجا مرۆڤ ئەگەر بێتو بە تاکە تاکە بژین، یان بە کۆمەڵ کۆمەڵ بژین، ئەوا ئازادی، چونکە خۆی لە خۆیدا تایبەتکارێکی خۆڕسکی و خوزاییی مرۆڤە، لە هەردوو بارەکەدا نایەتە گۆڕان. لەبەر ئەوە یەکسانیی مرۆڤێک و مرۆڤێک هەر لە دۆخی تاکە تاکەییدا نییە، بەڵکو لە دۆخی کۆمەڵ کۆمەڵیشدایە. جا چونکە نەتەوەکانی سەر زەوی، هەر یەکەیان بریتییە لە کۆمەڵە خەڵکێک، دیارە ئەم کۆمەڵانە هەموویان مافی یەکسانییان هەیە. کە مافی یەکسانیشیان هەبوو، دیارە دەبێ لە ڕاددەی دەسەڵاتیشدا یەکسان بن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هیچ نەتەوەیەک مافی ئەوەی نییە و نابێ؛ پلە و سنوور بۆ ئازادیی نەتەوەیەکی دی دابنێ. بۆ وێنە: عەرەب و ترک و فارس مافی ئەوەیان نییە و نابێ بە کورد بێژن: تۆ دەبێ بە "ئۆتۆنۆمی" ڕازی ببیت؛ بەڵام ئێمە خۆمان دەوڵەتی ناسیۆنالی سەربەخۆی خۆمان هەبێ. بەڵکو دەبێ ئەو نەتەوانەی، خۆیان بە ئارەزووی خۆیان، دەیانەوێ پێکەوە بژین؛ خۆیان یەکسان بکەن. واتە دەسەڵاتی خۆیان وەکیەک لێبکەن. بە وشەیەکی دی: یان ئەوەتە نەتەوەی کوردیش وەک ئەوان دەوڵەتێکی ناسیۆنالی سەربەخۆی هەبێ، یان ئەوەتە ئەوانیش وەک کورد بە "ئۆتۆنۆمی"، یان هەر جۆرە بەڕێوەبەرێتییەکی دی کە هەموو پێیرازیبن، هەموویان وەکیەک پیڕەوییبکەن. خۆ ئەگەر وا نەکەن، مانای وایە مرۆڤێکی عەرەب، یان ترک، یان فارس لە مرۆڤێکی کورد دەسەڵاتی زۆرترە، واتە ئازادترە، لەکاتێکدا وەک گوتم، ئازادی تایبەتکارێکی هەموو

مرۆڤێکی ژیرە و شێوای پلە بۆ دانانی نییە.

ئەمجا مەسەلەی دژ نەوەستان بەرامبەر بە ئازادی، وەنەبێ هەر مەسەلەیەکی دەرەکی بێ، واتە؛ تاکە تاکەی مرۆڤ بۆ یەکدی بسەلمێنن، یان نەتەوە جۆر جۆرەکان بە یەکدی رەوابپبینن. بەڵکو دەبێ تاکە تاکەی مرۆڤ و کۆمەڵانی مرۆڤیش دژی ئازادیی خۆیان نەوەستن. بەکورتی: ئەگەر رۆژێک نەتەوەی کورد بڕیاری چارەنووسی دەسکەوت، ئەوا بەپێی بۆچوونی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم؛ خستنە کاری ئەو بڕیارە کاتێک رەوایەتی دەبێ کە "لە ئازادیدا" بدرێ، واتە لەژێر سایەی هیچ جۆرە ترس و لەرز و فرو فێڵێکدا نەبێ. دووەم: نەتەوەی کورد هەر دەتوانێ "بۆ ئازادی" بڕیار بدا. ئەمەش مانای وایە؛ ئەگەر هاتو نەتەوەی کورد بە جۆرە سیستەمێکی حکومەتی خواردەستانە رازی بوو کە لەبارەی دەسەڵاتەوە کەمتر بێ لە هی نەتەوەکانی دی، ئەوا دیارە لە ئازادیی خۆی کەمکردووەتەوە لەچاو ئازادیی نەتەوەکانی دیدا. خۆ ئەگەر هاتو دەنگی بۆ جۆرە رژێمێک دا کە ئەو رژێمە دژی ئازادی بوو، وەک رژێمێکی دیکتاتۆریانە، یان فاشیستانە یان تۆتالیتێرانە یان ئۆتۆریتێرانە و... هتد، ئەوا ئەو بڕیارە دژی ئازادی دراوە و "بۆ ئازادی" نەدراوە. ئەو حەلە هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم رێزی ئەو بڕیارە ناگرن و بەربەرەکانێشی دەکەن، تەنانەت ئەگەر هاتوو زۆربەی هەرە زۆری کوردیش لە پشت ئەو بڕیارەوە بوەستێ. هیچ تاکێک و هیچ کۆمەڵێک (لێرەدا هیچ نەتەوەیەک) ئازاد نییە لەوەدا کە دژی ئازادی بوەستێ. سا ئەو ئازادییە، ئازادی خۆبێ، یان خۆنەبێ. هەر بڕیارێک لەدژی ئازادی بدرێ، ئەو بڕیارە لە ژیربیەوە نەهاتووە، و هەر بڕیارێکیش لە ژیربیەوە نەهاتبێ، بە زۆری ژمارەی لایەنگیرانی بڕیارەکە "رەوایەتی" بۆ پەیدا ناکرێ.

کەواتە هەر دەوڵەتێکی کوردی، یان هەر بنکەیەکی ناسیۆنالی دی کە بۆ رێکخستنی ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری دروست ببێ؛ دەبێ "لە ئازادی"دا هاتبێتە کایە و "بۆ ئازادی" هاتبێتە کایە. چۆنکە "دەوڵەتی کورد" بەلای هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزمەوە؛ ئامانج نییە؛ بەڵکو هۆیەکە بۆ

دەربڕین و بەکارهێنانی مافی ئازادیی مرۆڤی کورد لە بڕیاردانی چارەنووس و دەستنیشانکردنی جۆری ژیانی خۆیدا لە سنووری کۆمەڵگەیەکدا. ئەمەش مانای وایە ئەگەر دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ دروست ببێ، و گەلی کورد ئازادیی بڕیاردان و جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی نەبێ، ئەوا ئەو دەوڵەتە بە دەوڵەتی هەمـوو کـۆمـەڵگەی کـورد نادرێتــە قـەڵەم. چۆنکە ئازادی، لەباری سەرنجی ئەم قوتابخانەیەوە -وەک گوتم- تایبەتکارێکی هەمـوو مرۆڤـێکی ژیرە. کەواتە نابێ کوردێک بە نەختێک ئازادی رازی ببێ و کوردێکی دیش بە زۆرێک ئازادی دانەکەوێ.

کەواتە مەسەلە بەلای ئەم قوتابخانەیەوە مەسەلەی ئازادییە لە بڕیاردان و لە جێبەجێکردنیدا لەلایەن کۆمەڵگەی کوردەوە، نەک تەنێ مەسەلەی بوونی ئالایەک و سەرکۆمارێک و پەرلەمانێک. چۆنکە زۆر وڵات هەن؛ ئالاش و سەرکۆماریش و سوپاشیان هەیە و گەلەکانیشیان لە بڕیاردان و جێبەجێکردنی بڕیاردا ئازاد نین. بوونی دەوڵەت بەتەنێ مانای ئەوە نییە ئەو گەلەی دەوڵەتەکە بەنێوییەوە دانراوە "ئازادە". بەڵام گەلێکی ئازاد ئەمڕۆ پێویستی بە بوونی دەزگەیەکی سیاسییە بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی و ئارەزووەکانی لە بەندیوارێتیی کۆمەڵگەیدا. و هەروەها بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی و خاکەکەی. جا ئەو دەزگەیە دەتوانێ لە شێوەی "دەوڵەتێکی سەربەخۆ"دا بێ، یان لەشێوەی یەکگرتنی چەند دەوڵەتێکدا بێ، یان لەشێوەی یەکگرتنی چەند گەلێکدا بێ لە سنووری بەڕێوەبەرێتییەکی نێو کۆییدا؛ هونەر ئەوەیە لەسەر بنچینەی دەسەڵاتی یەکسانیی ئەو دەوڵەتانە، یان ئەو گەلانەی بە ئارەزووی خۆیان یەکدەگرن، دامەزرابێ.

هەر لەبەر ئەمەیە کە هاوبیرانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم، ئەمە چارەکە چەرخێک پترە باسی "سەربەخۆییی کوردستان" ناکەن، بەڵکو باسی ئازادیی کورد و کوردستان دەکەن لە بەڕێوەبردنی خۆیدا.

چۆنکە ئازادی بەلایانەوە لە سەربەخۆیی بەرزترە. سەربەخۆیی بەشێکە لە ئازادی، نەک هەموو ئازادی. چۆنکە دوور نییە گەلێک دەوڵەتێکی سەربەخۆ،

یان چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆشی هەبێ؛ جیاواز لە دەوڵەتەکانی دیکەی جیهان، بەڵام ئازادیی بڕیاردان و بەجێگەیاندنی ئەو بڕیارانەی نەبێ. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە یەکێک لە دوو دروشمە سەرەکییەکانی کاژیک "کوردستان بۆ کورد" بوو؛ نەک "کوردستانێکی سەربەخۆ". مەبەست لەمەش ئەوەبوو کە کورد خۆیانْ بە ئازادی کوردستان ببەن بەڕێوە، دوور لە دەسەڵاتی ناکورد. هەروەها شتێکی رێککەوت نییە کە یەکێک لە دوو دروشمە سەرەکییەکەی "پاسۆک": "کوردستانێکی ئازاد"ە، نەک "کوردستانێکی سەربەخۆ" یان "دەوڵەتێکی کوردی".

ئەمجا پاش ئەوەی کە واتەی "بڕیاری چارەنووس لە ئازادیدا و بۆ ئازادی"مان رۆنکردەوە، دەبێ پیچێک لەسەر ئەوە بدووین؛ تا بزانین واتەی "نەتەوە" بەلای ئەم قوتابخانەیەوە چی دەگرێتەوە:

وەک لەمەوبەر گوتم، زانستکارە بۆرژواکان و زانستکارە مارکسیستەکان، هەردوو لایان، زۆر و کەم مەسەلەی بوونی "نەتەوە" بە بوونی "دەوڵەت"ەوە گرێدەدەن، و لێرەدا مەسەلەی ئابووری نێوکۆیی و زمانی نێوکۆیی و بەسەرهاتی نێوکۆیی و سەرزەوی نێوکۆیی بە مەرج دەزانن بۆ بوونە نەتەوە. قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم پێی وایە؛ هەستی چارەنووسی وەکیەک گەورەترین هۆکارێکە بۆ دروستکردنی نەتەوە.

دیارە هەستکردن بە چارەنووسی وەکیەک لە خۆ بە یەکزانیندا، هەروا لەخۆیەوە دروستنابێ و لە ئەنجامی پرۆسەیەکی زۆر سەختدا دروستدەبێ. بەڵام کە کۆمەڵێک مرۆڤ هەستیان بە چارەنووسی وەکیەککرد، ئەوسا مەرجەکانی دیکەش وەک زمانی وەکیەک و پەیداکردنی سەرزەویی نێوکۆیی و دەوڵەتی هاوبەشیش دروستدەبێ. جوولەکەکان نموونەیەکی باشی ئەمەن. ئەمانە هەزاران ساڵ بوو لە وڵاتی بنەڕەتی خۆیان پچڕا بوون، و بە هیچ جۆرێک مێژوویەکی هاوبەشیان نەبوو، مەگەر مێژووی هەرە کۆنیان. بەڵام هەستکردن بە چارەنووسی وەکیەک لە خۆ بە یەکزانیندا، وایلێکردن خۆیان بناسن ورووبکەنەوە سەر زەوییە کۆنەکەی خۆیان کە چەند هەزار ساڵێک بوو بەجێیان

هێشتبوو، و لەوێ پێکەوە دەوڵەتێک بۆ خۆیان بنیات بنێن.

موسڵمانەکانی هیندستان نموونەیەکی دین بۆ ئەمە، ئەمانە بە درێژایی مێژوو هیندستانی بوون، و بەشێک بوون لە هیندستان، بەڵام لەبەر ئەوەی ئاینەکەیان جیاواز بوو، و هەستیان بە چارەنووسی وەکیەک دەکرد لە خۆ بە یەکزانیندا، هاتن زمانی ئۆردوویان بە تیپی عەرەبی ژیاندەوە و کردیان بە زمانی ناسیۆنالی خۆیان، و لە ئەنجامدا دەوڵەتێکی سەربەخۆیان بۆ خۆیان پێکەوە نا بەنێوی "پاکستان"ەوە.

# ژێدەرەکان

(١)- وتاری سەمیناری "بیری نەتەوەییی کوردی؛ نە بیری قەومیەت ی رۆژهەلاتی و نە بیری ناسیۆنالیزم ی رۆژاواییە" لە رۆژی ١٩٨٤/٨/١٨ دا لە ستۆکهۆلم درا بە بۆنەی بەستنی کۆنگرەی سێیەمی سۆکسە SOKSEەوە کە لە ١٨ - ١٩ ی ئابی ١٩٨٤ هەر لە ستۆکهۆلم بەسترا. ئەم وتارە سەمیناریە بۆ یەکەمجار لەلایەن "بنکەی چاپەمەنیی ئازاد"ەوە لە سوید چاپکراوە و، چاپی دووەمیش لە سالی ٢٠٠٢دا لە لایەن "بنکەی کوردنامەوە چاپ و بلاوکراوەتەوە.

(٢)- تەماشای "شەرەفنامە" بکە:

Scheref Prince de Bidlis: Scheref-Nameh ou Histoire des Kourdes, Publiee par v. Velliaminof-Zernof, Tome 1, Texte Persian, Premiere Partie, St. Petersbourg 1868, p. 16-17.

(٣)- هەر ئەوێ.

(٤)- خاوەن سەمینار ئەو نەخشەیەی پیشانی بەشدارانی سەمینارەکە دا کە لە لاپەرە (١٤٩)ی کتێبەکەی نجفقلی پسیان دایە: مرگ بود بازگشت هم بود / تأریخچە فرقە دمکرات اذربایجان وحزب کوملە، کردستان. اذرماە ١٣٢٧ (نوفەمبر / دیسمبر ١٩٤٨) شرکت سهامی چاپ / تهران. (ل ٣ . ١ ئەم سەمینارە).

(٥)- خاوەن سەمینار ئەو تابلۆیەی ل ٣ . ١ پیشانی بەشدارانی سەمینارەکە دا کە بە دەوری ئالای کوردستاندا نووسراوە: "دەولەتی جمهوری کوردستان". لە تەنیشت ئەمەشەوە وێنەیەکی ئالای کوردستان لە دەورانی "کۆماری کوردستان"دا دەبینرێ (ل ٣ . ١ ئەم سەمینارە).

(٦)- "نیشتمان"، ژمارە (١) سالی (١)، پووشپەری ١٣٢٢ (=١٩٤٣)، ل ١-٢.

(٧)- تەماشای یەکەمین بەیاننامەی "مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی کوردستانی عێراق" بکە کە لە زستانی سالی ١٩٤٥ دا دەرچووە بە بۆنەی دروستبونی "بەرەی رزگاری کورد"ەوە. لەوێدا "رزگارکردنی کوردستانی گەورە" بە ئامانجی حیزبەکە دادەنێ. ئەم بەیاننامەیە لە کتێبێکدا کە پارێزەر زەید ئەحمەد عوسمان بەنێوی خواستەمەنیی "محمد شیرزاد" و لەژێر نێوی "نضال الاكراد"دا لە قاهیرە لە ١٩٤٦ دا بلاوی کردووەتەوە؛ چاپکراوە.

(٨)- سجل مذاكرات جمعية "ام القرى" ذي القعدة ١٣١٦، اي ضبط مفاوضات وقرارات مؤتمر النهضة الاسلامية المنعقدة في مكة المكرمة سنة ١٣١٦، ناشره السيد الفراتي، مركز النشر في بورت سعيد ١٣١٦، ١٤٤.

(٩)- بۆ وێنە سێر ئەرنۆلد ویلسن Sir Arnold Wilson کە "فەرمانداری گشتیی عێراق" بوو لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاوە، کتێبە کۆنەکەی لەسەر عێراق بە نێوی مێزۆپۆتامیاوە نووسیوە:

Wilson, Lt. Col., Sir Arnold T.: Mesopotamia 1914-1917., London 1930.

Wilson, Lt. Col., Sir Arnold T.: Mesopotamia 1917-1920, London 1931.

هەروەها Haldane کتێبەکەی لەسەر عێراق بەنێوی مێزۆپۆتامیاوە نووسیوە،

Haldane, A. L.: "The Insurrection of Mesopotamia, Edinburgh 1922

مێجەر سۆنیش کتێبەکەی لەسەر عێراق و کوردستان، بەنێوی مێزۆپۆتامیا و کوردستانەوە نووسیوە: Soane, E.B.: To Mesopotamia and Kurdistan in Diguise, London 1912.

بەمانە و گەلێک نووسینی دی ئینگلیزەکان و ئەورووپاییەکاندا تێدەگەین کە نێوی عێراق لەلایەن ئەمانە خۆیانەوە بەکار نەدەهێنرا. بەڵام نێوی کوردستان بەکار دەهێنرا.

(١٠)- عبد الرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي الحديث - الطبعة الثانية - الجزء الثالث، صيدا / لبنان ١٩٥٧ ص ٢٦٧، هەروەها :

Rambout Lucien: Les Kurdes et le droit, Paris 1947, p51.

(١١)- عبدالرزاق الحسني: سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٧٠، هەروەها: محمود الدرة: القضية الكردية، بيروت ١٩٦٦، ص ١٥٥-١٥٦.

(١٢)- رەفیق حیلمي: یادداشت. بەرگی یەکەم - بەشی دووەم، بەغدا ١٩٥٦، ل ١٩٣.

(١٣)- William Eagleton JR. The Kurdish Republic of 1946, Oxford University Press, London 1963, p.44

(١٤)- سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤ - ٤٥.

(١٥)- "ایران و جهان"، پاریس، شمارە ٩-١٦ / کانوونی دووەم ١٩٨٤.

(١٦)- Hannelore Küchler: Öffentliche Meinung: Eine methodologische Betrachtung und eine examplarische Untersuchung zum Selbstverständnis der Kurden, Berlin 1978, s. 198.

(١٧)- جلال الطالباني: كردستان والحركة القومية الكردية، بغداد ١٩٦٩ / ١٩٧٠، ص ٢٠٧-٢٠٨

(١٨)- تەماشای: الحزب الديمقراطي الكردستاني / القيادة الموقتة: البرنامج الجديد للحزب الديمقراطي الكردستاني. عن التقرير السياسي لكونفرانس الحزب المنعقد في شهر آب ١٩٧٦، ص ٥٦.

(١٩)- تەماشای: الحزب الديمقراطي الكردستاني / اللجنة التحضيرية: تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، اوائل كانون الثاني ١٩٧٧، ص٩٩.

(٢٠)- تەماشای المنهاج والنظام الداخلي للحزب الاشتراكي الكردستاني - العراق، اقر في المؤتمر الاول للحزب المنعقد ما بين ١٢-١٥ آيار ١٩٨١، من وثائق المؤتمر (١).

(٢١)- "کوردستان" ئۆرگان "کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران" لە ژمارە (٥٤)ی رەشەمەی ١٣٥٧=مارسی ١٩٧٩ دا نووسیبووی: "ئێمە نە بڕوامان بە حیزبی تاقانە لە ئێراندا هەیە و نە لە کوردستاندا، نە بڕواشمان بە پێشگیری لە تێکۆشانی دەستە و رێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان هەیە...هتد".

(٢٢)- "ی.ن.ک." هەرچەندە پاش هەرەسەکە باسی ئەوەی دەکرد کە دەبێ لە کوردستاندا "سەربەستیی رێکخستن" ببێ، بەڵام وەک لە کردەوەکانی و لە نووسینەکانیدا دەردەکەوێ، ئەم "ی.ن.ک"ە هەوڵی "سەرکردەیی" و "خۆبەزلگرتن" و "پێشڕەوێتییەکی ئاڤانگاردیستانە" دەدا کە لە رێی بەکارهێنانی زۆر و لێدانی رێکخراوەکانی دیکەوە بیگاتێ. ئەوی ناسیلکەی "حول الحركة التحررية للشعب الكردي في كردستان العراق" بخوێنێتەوە کە لە ساڵی ١٩٧٧دا دەرچووە، ئەم رێڕەوە نوێفاشیستانەیەی "ی.ن.ک" دەردەکەوێ بۆی.

(٢٣)- بەبۆنەی تێپەڕبوونی چارەکە چەرخێک بەسەر دامەزراندنی کاژێکدا لە ١٩٨٤/٤/١٤ دا باسێکم لەژێر ناوی "رەنگدانەوەی بیری کاژێک لە ئەدەبیاتی هوردە بۆرژوازیی کورددا" بۆ چاپ ئامادە کردوە، ئەم باسە لە کۆبوونەوەیەکدا لە بەرلین لە رۆژی ١٩٨٤/٤/١٤ دا خوێندراوەتەوە و دەمەتەقێکراوە لەسەری.

(٢٤)- قانونی "ئۆتۆنۆمی کوردستانی عێراق" گوایە "بیرازکراو" کە لەلایەن "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان"ەوە دراوە بە کاربەدەستانی بەعس، پارێزگەکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک و ئەم قەزایانە: ئاکرێ، شەنگار، شێخان، زمار، کفری، تووز، داقوق، خانەقین، مەندلی، پردێ، قادرکەرەم، قەرەهەنجیر و لەیلان بە هەرێمی

"ئۆتۆنۆمی" دا دەنێ و چاو لە کەرکووک دەپۆشی. لە ماددەی یەکەمی برگەی (هـ) دا دەبێژێ: "المنطقة جزء لا يتجزأ من ارض العراق. وشعبها جزء لا يتجزأ من شعب العراق". لە برگەی (و) هەر ئەو ماددەیە دەبێژێ: "هيئآت الحكم الذاتي جزء من هيئآت الجمهورية العراقية". لە ماددەی دووەم و برگەی (د) دا دەبێژێ: "يخضع التعليم في جميع مراحله في المنطقة للسياسة العامة للدولة مع مراعات الخصوصية القومية للمنطقة". بە مانایەکی دی: خوێندن بە زمانی کوردی، بەلاَم بیروباوەڕ بەعسی.

(٢٥)- کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان: عێراقچێتیی داگیرکەر و بۆرجوازیی کوردستانی، کوردستانی بوونی کرێکاران و رەنجدەران، نیسانی ١٩٨٣.

(٢٦)- بۆ وێنە، تەماشای : الحزب الديمقراطي الكردستاني (اللجنة التحضيرية): تقييم مسيرة الثورة الكردية وانهيارها والدروس والعبر المستخلصة منها، اوائل كانون الثاني ١٩٧٧، ص ١٠٢.

(٢٧)- لە کاژێکنامەدا هاتووە : "کورد خۆی خۆی رزگار دەکا لەرێی بیروباوەڕی پاکی کوردایەتییەوە. لەبەر ئەوە کاژێک هەر پشت بە کورد دەبەستێ و بڕوا بە هیچ بێگانەیەک ناکا و هەر کەسێک بڵێ "بێگانە کورد رزگار ئەکا" یان بە ساویلکە یان بە دوژمنی دا ئەنێ. چۆنکە ئاشکرایە کە بێگانەیەک دەوڵەت بۆ کورد دروست بکات لە هیچە؛ زۆر بە ئاسانی لێشی ئەسێنێتەوە". کاژێکنامە، ل ١٨.

(٢٨)- لە کاژێکنامەدا هاتووە: "کاژێک داگیرکەرانی کوردستان هەموو بە یەک چاو تەماشا ئەکا و کوردستان تەنیا بە موڵکی کورد ئەزانێ و ئەبێ کورد هەر خۆی فەرمانڕەوا بێ لە کوردستاندا. لەبەر ئەوە بڕوای بەو برایەتییە درۆزنەیە نییە کە لە رێگەیەوە سەرووت و سامانی بە تالاَن ئەبرێ و لە کەمترین مافی مرۆڤانە بێبەش ئەکرێ. لەبەر ئەوە فەرمانڕەوایی هەموو نا کوردێک بەسەر کوردستاندا بە کارێکی ناشەرعی ئەزانێ". کاژێکنامە، ل ١٨.

(٢٩)- حیزبی سوسیالیستی کوردستانی عێراق: حیزبی شۆرشگێڕ ل ٥-٦.

(٣٠)- تەماشای وتاری: "ئامانجەکانی کاژێک و شێوەی هێنانەدی ئەو ئامانجانە" بکە کە لە تشرینی دووەمی ١٩٦١ دا لەلایەن بەرێوەبەرێتیی کاژێکەوە بلاَو کراوەتەوە، و لە ژمارەی ٥ ی رۆژنامەی "بانگی کاژێک"دا جارێکی دی چاپکراوەتەوە کە لە ١٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٨ دا دەرچووە. هەروەها تەماشای وتاری "چۆن هاوبیرێک بۆ کاژێک وەدەست ئەهێنێت" نووسینی رەسول بکە، کانوونی دووەمی ١٩٦٢، چاپی دووەمین- چاپی ئەورووپا ٢٥٨٠ ی کوردی و ١٩٦٨ی فەرەنگی.

(٣١)- جمال نبز: حول المشكلة الكردية، من منشورات "الاتحاد الوطني للطلبة الكرد في

اوروبا (نوکسه)" ۲۵۸۰ ك / ۱۹٦۹ م، ص ۱۲.

(۳۲)- Jemal Nebez, Der Kurdische-Fürst Mir Muhammad-i Rawandizi genannt Mir-i Kora im spiegel der Morgenländischen und Abendländischen Zeugnisse, ein Beitrag Zur Kurdischen Geschichte, Hamburg 1970, s. 110.

(۳۳)- جمال نبز: حول المشكلة الكردية، سەرچاوەی پێشو ل ٤٢.

(۳٤)- تەماشای رۆژنامەی "المنار"ی بەغدادی بکە، ژمارەی رۆژی ۱۹٦٦/۱۱/۱۳.

(۳٥)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Lesikon Zur Soziologie, herausgegeben Von u.a.w. Fuchs, 2. Verbsserte und erweiterte Auflage, Westdeutscher Verlag 1978, s. 520

(۳٦)- تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Mackesen von Hollander: Universal Wörter & Fremdwört-erbuch Xenos Verlagsgesellschaft, Hamburg 1983, s.747.

(۳۷)- کاژێکنامە، فەلسەفەی کاژیک لە چەند دێڕێکدا. لە ناوەڕاستی تەموزی ۱۹٦۱ دا بۆ یەکەمین جار بلاْوکراوەتەوە. ل. ۹-۱۰.

(۳۸)- تەماشای "من خطاب صدام حسين في التجمع الجماهيري في منطقة قشقولي في محافظة السليمانية بتاريخ ۱۹۷۹/۳/۲۱" بکە لە "مجلة الحكم الذاتي"دا، العدد ٤، السنة الرابعة، ۱۹۷۹، ص . وەرگێڕانی کوردی ئەو برگەیەی قسەکەی سەدام لە لاپەرە . ٤ی ئەم گۆڤارەدایە.

(۳۹)- تەماشای رۆژنامەی "النور" ژمارەی ۸، ۱۹٦۸/۱۰/۲۰ بکە.

(٤۰)- تەماشای رۆژنامەی "هاوکاری"، بلاْوکراوەی "دەزگەی رۆشنبیری و بلاْوکردنەوەی کوردی"، ژمارەی ۷۰۰، پێنج شەمە ۱۹۸۳/۸/۱۸، ل ۱ بکە.

(٤۱)- تەماشای: بين كاژيک والبارزاني - سلسلة الوثائق الكاژيكية باللغة العربية - طبع من قبل فرع كاژيک في اوروبا، ۲۵۸۱ كردي - ۱۹٦۹م، ص ۱۷، بکە.

# بۆچی دژی جیابونەوەین؟

جوولانەوە کەشمان بێ
بەری بە لە جیا بوونەوە
خوازەکان وە لە شوێنی ئەوە
لایەنەکەی تری مافی چارە
نووس بە دەست خۆمان بێ
ئەو مافە پاڵەبێ بماندرێتی یا
بەماندرێنی ئیمە جۆری
مانەوەی بە ئارەزوو لە گەل
گەلی عەرەب دا هەڵبژاردووە و هەڵی ئەبژێرین
وە هەر لەبەر ئەو راستی یەشە
کەم بەزۆریش ئەو جیا
بوونەوەیە بەپێی بە
سەرماندا بەرامبەری
ئەوەستین چونکە شۆرشگێرانی
کورد زۆر چاک لەو راستی یانە
گەیشتوون و رێگەی خەباتی
پێشکەوتوانەی خۆشیان چاک
دیاری کردووە کە خەباتی
بەگژنووی هەردوو گەلی
کوردو عەرەبە بۆ گەیشتن بە
دوا رۆژێکی بەختیار بۆ
نەهێشتنی چەوسانەوەی
چینایەتی چەوسانەوەی
نەتەوایەتیش نامێنێ بە زۆر
سەپاندنی بیرو هەڵوێست
و پەیوەندی‌یەکی زۆرەملێ لە
ئاکامدا نامێنی وە بۆ وەستان
بەرامبەر بە هەموو ئەو
جوولانەوەیەکی جیابوونەوە
خوازانە پێویستە لە سەر

هەردوو گەل و جەماهیریان
ئەرێش بە دامەزراندنی
رژێمی سوشیالیزم عیلمیانە
چونکە لە ژێر سایەی ئەو
رژێمە جگە لەوەی کە
چەوسانەوەی چینایەتی
ناهێڵێ گەلی کوردیش بەو
مافە رەوایەی کە لە پێناوی
دا خەبات ئەکات کە وە دەست
هێنانی مافی چارە نووسی
خۆیەتی بە دەست خۆی بێ
ئەلەو کاتەشدا بێ گومان بە
شێوەی یەکێتی بە ئارەزووی
خۆی هەڵئەبژێرێ کە لە
نوونوسی بۆ کوردستان لە
چوار چێوەی کۆماری
شۆرشگێری عیراق و ئەو
رژێمە سوشیالیزمەدا
ئەحەوێنەوە و کە بە هەموو
مافە نەتەوایەتی بە گەیشتنی
شاد ئەبێ چونکە لە گەل
هەموو ئەو کەسانەی کە
ئەیانەوێ یەکێتی عیراقی
راستەقینە بچەسپێ ئەلێین
[illegible] بە هەموو مافەکانی گە[illegible]
[illegible]ورد بەڵێنی و یەکێتی یەکی
بە ئارەزوو کە یەکسانی لە
هەموو رووبەکەوە تیدا بێ
[illegible]ک بهێنری .

جەمال نەبەز

# سەمیناری کوردستان
# راپۆرتێک لەسەر بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کورد
# و
# وتووێژ لەسەر باری باشووری کوردستان

وتارێکی سەمینارییە لە ئێوارێی رۆژییەکشەممەی ١٩ی مارتی ١٩٩٥دا لە شاری ستۆکهۆلم (سوێد) لەبەردەم ٢٨٧ کوردی سوێد و شوێنانی دیکەی ئەوروپادا پێشکێش کرا

## بەڕێزان بەشدارانی سەمیناری کوردستان

سلاوێکی گەرمتان لێ بێ و سوپاس بۆ بەشداریتان بەم شێوە فراوانە لە سەمیناری ئەوڕۆدا کە هیوام وایە بتوانێ هێندێک ڕۆشنایی ئاڕاستەی باری ئێستەی نەتەوەی کورد بەگشتی بکا و سووتێکیش بگەیەنێ بە هەوڵدان بۆ ڕەواندنەوەی باری ئاڵۆزکاوی ئەوڕۆی باشووری کوردستان. سوپاسێکی گەرمی کاک بورهان مام توفیق و هەموو ئەو برادەرانەیش دەکەم کە ڕەنجیان بە دەست پێکهێنانی ئەم سەمینارەوە کێشاوە و هەموو لایەکتان بەخێرهاتن و سەرچاو.

### بەڕێزان:

ئەو ڕووداوە گرنگانەی کە لەم چەند ساڵەی دواییدا لە ئاستی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و جیهاندا سەریان هەڵدا؛ وەک ڕووخانی ڕژێمی شای ئێران و دامەزراندنی "کۆماری ئیسلامیی ئێران" (١٩٧٩) و پێ بەپێی ئەوەش بەهێزبوونی بزووتنەوەی "بنچینەگرانە"ی ئیسلامی دژ بە ئەمریکا و ئەورووپا، و هەڵپڕژانی جەماوەرانەی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە ڕووی زۆرداری و ملهوڕیی ڕژێمی مەلا شیعەکاندا، و کودەتای سوپایی لە ئەنقەرە (ئەیلوولی ١٩٨٠) و هاتنە کایەی ڕژێمی میلیتاریستی دوژمن بە کورد و دیمۆکراسیی ئێڤرەن. هەروەها جەنگی هەشت ساڵەی کەنداو (لە نێوان عێراق و ئێراندا) (١٩٨٠-١٩٨٨) و بەهێزبوونی لە ئەندازە بەدەری ڕژێمی بەعسیی عێراق و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و بیۆلۆژی، بە یارمەتیی ئەورووپا و ئەمریکا دروستکراو، بۆ تووناکردنی کورد، بە تایبەتی لە هەڵەبجە و سەردەشت و بادینان (١٩٨٨)، و نائارامی پەیدابوون لە ئەورووپا و ئەمریکا بەرامبەر بە مەترسیی چەکی کیمیایی و بیۆلۆژی، بێ نێو بردنی کوردی قڕکراو، پاش ئەوەش پەلاماری عێراق بۆ سەر کوێت و هەڵگیرسانی شەڕی چەکدارانە لە نێوان عێراق و کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە سەرۆکایەتیی ئەمریکا و شکانی سوپای سەددام، بەڵام مانەوەی خۆی و ڕژێمی لەسەر کار. ئەوجا

راپەڕینی خەڵکی باشووری کوردستان لە بەهاری ١٩٩١ دا و پەلامار بردنەوەی سەددام بۆ سەر کوردستان و کۆچڕەوی دوو ملیۆنی کورد بۆ دەوڵەتی ترک و ئێران. دوای ئەوەش دروستبوونی نیوچەیەکی دیفاکتۆ de facto سەربەخۆ بۆ کورد لە بەشێکی باشووری کوردستاندا بە نێوی "هەرێمی ئاسایش"ەوە بە رازی بوون و پارێزگاریی ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و خودێلێخۆش بوو تورگوت ئوزال، و هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان (لە هەرێمی ئاسایش دا) بە کوالیسیۆنی پارتی دیمۆکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و دامەزراندنی دەزگەی بەڕێوەبەرێتیی "هەرێمی ئاسایش" لە لایەن کورد خۆیەوە، و لەپاڵ ئەوەشدا خەستبوونی سەرهەڵدان لە باکووری کوردستاندا (کە لە نێوەڕاستی هەشتاکانەوە بە رێبەریی پی کی کی دەستیپێکردووە)، و هەوڵدانی دڕندانەی رژێمی ترک بۆ بندەست هێشتنەوەی کورد، و هەر لەو کاتەدا زیندووبوونەوەی بیری سەربەخۆیی کوردستان، کە لە سەرەتاوە (واتە چەند سەتەیەک لەمەوبەرەوە) بیری سەرکردە رێسایییەکان (تقلیدی)ی کورد بوو، بەلام لە پاش جەنگی جیهانیی دووەمەوە لە لایەن سەرکردە هوردە بۆرژوا مارکسیستە شارنشینەکانی کوردەوە کرا بە "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان" لە چوارچێوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا. هەروەها بەهێزبوونی هەستی نیشتمانپەروەری و گوڕسەندنی بزووتنەوەی بیری نەتەوەیی لەنێو کوردا بە گشتی، و تەنانەت لەنێو ئەوانەشدا کە رێبازی ئاینی، یان چینایەتییان گرتووەتە بەر و لە ئەنجامی ئەوەشەوە هاتنە کایەی رێکخراوی ئیسلامیی کوردستانی و رێکخراوی ئەلەوی کوردستانی و رێکخراوی کۆمۆنیستی کوردستانی ورێکخراوی ئێزیدیی کوردستانی. ئەوجا زڕانی نێوی ئەو رژێمانەی کە کوردستانیان داگیر کردووە و بە پەند بوونیان لە سنوورێکی جیهانیدا و ناسرانیان بە تیرۆریست و پێشێلکەری مافی مرۆڤ، بەتایبەتی رژێمی ئێران و عێراق، و پەیدابوونی کەسانێکی بەنێوبانگ و دەسەڵاتدار لە ئەوروپا و ئەمریکا و هەموو جیهاندا کە پشتگیری لە مافی رەوای گەلی کورد دەکەن. لەمانەش بترازێ نێزیک بوونەوەی عەرەب و ئیسرائیل لە یەک؛ پاش دوژمنایەتییکی خوێنینی نیوسەتەیی و دانانی رەسمی بە بوونی ئیسرائیلدا لە

لایەن چەند دەوڵەتێکی عەرەبەوە، و دەستخستنە دەستیەکی سەرکردەکانی فەلەستین و ئیسرائیل بە نیازی چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین. لەمانەش هەموو گرانتر و گرنگتر، رووخانی لەشکرگەی سۆسیالیزمی ساختە بە سەرۆکایەتیی یەکێتیی سۆڤیێت و رزگاربوونی ئەورووپای خۆرهەلات و یەکگرتنەوە و بەهێزتربوونی دەسەلاتی ئابووری و سوپاییی ئەلمانیا و نێزیکبوونەوەی پتری لە رژێمی ترک و هاتنە خوارەوەی نرخی پەیمانی ناتۆ، و شان بەشانی ئەوەش کەمبوونەوەی بایەخی دەوڵەتی ترک بۆ ئەورووپای خۆراوا و ئەمریکا وەک "سەنگەرێک" بەرامبەر سۆڤێتی دوابڕاو، بەلام بایەخ وەرگرتنەوەی ترک جارێکی دی وەک "پردێک" لە نێوان ئەورووپا و ئەو چەند دەوڵەتە سەربەخۆیەدا کە لەسەر داروپەردوی سۆڤێتی جاران بۆ ترکمانی ئاسیای نێوەڕاست دامەزران، و لە هەمان کاتدا تیژبوونی بیری رەگەزپەرستانەی فاشیستانەی تۆرانیتی و خەیاللێدان بە دروستکردنی "ئیمپراتۆریتی تۆرانی"یەوە لە ئاسیاوە تا چین. لەگەلْ ئەمانەشدا هاتنە پێشەوە و خۆنواندنی ئەمریکا پاش هەرەسهێنانی سۆڤێت وەک تاکە زلهێزێک لە جیهاندا و بایەخ پەیدابوون بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان و بیرکردنەوە لە هێنانە بوونی "سیستەمێکی نوێ" بۆ جیهان و لەنێوچوونی رێز و پیرۆزیی "پتی" دەوڵەوت وەک "بووەیەکی نەتەکێن" (مصون) لە جیهاندا و خستنە ژێر پرسین و گومانکردن لە سەربەستیی دەوڵەت لە هەلسو کەوتیدا بەرامبەر گەلەکەی ژێردەستی خۆی و لەمەشەوە دانانی مافی مرۆڤ بە "دۆزێکی گشتیی کۆمەلگەی جیهانی"، نەک وەک پێشوو بە "دۆزێکی نێوخۆییی دەوڵەتێک". هەروەها دانانی "دەستتێوەردان" لە کاروباری نێوخۆییی دەوڵەتێکدا بە کارێکی "رەوا" و "بەجێ"؛ هەر کاتێک ئەو دەوڵەتە بەرامبەر گەلەکەی خۆی خراپ جوولایەوە. هەر لەم کاتەشدا تلیسانەوە و هەرەسهێنانی چەند دەوڵەتێکی فرەنەتەوەی دەستکرد؛ وەک یۆگۆسلاڤیا و چیکۆسلۆڤاکیا، و لەمانەشەوە ترس لێنیشتن و زارەترەک بوونی داگیرکەرانی کوردستان لە دوارۆژی خۆیان و دەوڵەتە دەستکردەکانیان. کە ئەوەبوو ئەمجارە و پاش دامەزراندنی "هەرێمی ئاسایش" و پەرەسەندنی چالاکییەکانی پی کی کی و پێشمەرگەکانی حیزبی

دیمۆکراتی کوردستـان لە رۆژهەلاتی ولاتدا، بە ئاشکرا کەوتنە دژایەتیی کورد (کۆبوونەوەی دەمـدەمی وەزیرانی دەرەوەی ترک و سووریا و ئیران بۆ باسی ئەوەی پێیدەڵێن "مەترسیی کورد") و بەرزبوونەوەی نرخی ستراتیژی و ئابووریی کوردستان وەک ولاتێک کە لە دوارۆژدا گاز و نەوتی ئازەربایجان و ترکمانستانی پێدا دەچێ بۆ خۆراوا...هتد.

ئەمـانەی لە سەرەوە باسمکردن و هێندێک شتی دیکە هەموو رووداوی تازە بابەتن کە لەم دە پانزە بیست ساڵەی دوایـیدا روویان داوە و بوونەتە هۆی گۆرینی ژیۆپۆلیتیکی نێوچەی خۆرهەلاتی نێوەراست و هۆی شلەقاندنی کێشەی کورد لە زۆنگاوی بێدەنگی شەوەزەنگی کۆمەلگەی نێو نەتەوەییدا، و ئێستەش داوا لە بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی خەڵکی کوردستان و هەموو نەتەوەی کورد دەکەن کە لەم سەردەمەدا زۆر بە هۆشیاری و ژیرانە بکەونە هەڵسو کەوت؛ تاکو بتوانن سووت لەم هەلو مەرجەنوێیە وەربگرن. یەکەمین هەنگاویش بۆ کەلک وەرگرتن لەم بارو دۆخە بە بیرورای من رێککەوتنی ناسیۆناڵ و ئاشتیی نیشتمانی و هاوئاهەنگییە لە نێوان ئەو هێزانەدا کە لە کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا بۆ ئەم ئامانجە کار دەکەن.

بەرێزینە:

یەکێک لە هۆ سەرەکییەکانی سەرکەوتن لە ململانێی ژیاندا خۆناسین و ناخۆناسینە. جا بۆ ئەوەی خۆ و ناخۆ بە تەواوی بناسین، جارێ دەبێ لە خۆوە دەستپێبکەین. لە خۆوە دەستپێکردنیش دەمانخاتە بەر ئەم پرسیارانە: ئایە ئێمە کێین؟ ئێمە چۆنین، و چۆن لە خۆمان دەگەین؟ ئێمە چیمان دەوێ؟؟؟

وەرامدانەوەی ئەم پرسیارانە بە راستی و بێ خۆ و خەڵک خاپاندن، یارمەتیمان دەدا لە خۆ ئامادە کردندا بۆ هەنگاوی دووەم کە ئەوەش ناخۆ ناسینە. بۆ ناخۆ ناسینیش دەبێ بە تەواوی بزانین ناخۆکان کێن و چۆنن و چۆن لە خۆیان و لە ئێمەش دەگەن و چیان دەوێ و پێوەندییان بە ئێمەوە چۆنە. جا ئەگەر پاش ئەم پرسیار و بەرسڤانە خۆناسین بخەینە ئالییەک و ناخۆ

ناسینیش بخەینە ئالییەکی دی، و بە خەیاڵ لە نێوان خۆناسین و ناخۆ ناسیندا هێڵێک بکێشین، ئەوا دەزانین لە شوێنێکی سەر ئەو هێڵەدا چارەسەرێک بۆ کێشەکەی خۆمان دەستنیشان بکەین.

## ئێستە با جارێ زۆر بە کورتی باسێکی خۆ بکەین:

ئێمە کۆمەڵگەیەکی چل ملوێنین، بە خۆمان دەبێژین "کورد"، و خۆمان؛ چ لە رووی زمان و چ لە رووی مێژوو و چ لە رووی فرەهەنگ (کولتوور) و چ لە رووی هەستی پێوەندارێتیی نێو کۆیی یەوە؛ لە گەلانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی وڵاتەکەمان، بە جیا دەزانین. جا ئەگەر ئێمە هەرە کۆنترین گەلی خۆرهەڵاتیش نەبین، ئەوا بێگومان یەکێکین لە هەرە کۆنترین گەلەکانی خۆرهەڵات و ئەم جیهانە. ئەم وڵاتەی ئێمەش کە چەند هەزار ساڵێک دەبێ واری (١) ئێمەیە و تێیدا دەژین، بەلایەنی کەمەوە هەزار ساڵێک دەبێ بە کوردستان نێوی رۆیوە. ئەمەش لە نووسینەکانی بازرگان و گەشتەوەری ئیتالیایی مارکۆ پۆلۆ Marco Poloدا بە جوانی دیارە. کتێبی "شەرەفنامە"ش کە چوار سەت ساڵێک لەمەو بەر لە لایەن میر شەرەفخانی بەتلیسییەوە نووسراوە؛ باسی سنوورەکانی کوردستان دەکا کە ئەو دەمە لە تەنگەی هورمزەوە دەستیپێکردووە(٢). هەروەها چیرۆکی "مەم و زین" یش کە ٣٠٠ ساڵ پێش ئێستە لە لایەن بیرکەرەوە و هۆنەری کورد ئەحمەدی خانییەوە (١٦٥١ - ١٧٠٦) نووسراوە، باسی پێویستی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆناڵی بۆ کورد کردووە، کە لەو رۆژەدا بیری دەوڵەتی ناسیۆناڵ لای گەلانی عەرەب و ترک و فارس و هەموو گەلانی دیکەی رۆژهەڵات نەبووە، و هەموو دەوڵەتەکانی ئەو سەردەمە، واتا "ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی ، شانشینیی قاجاری ، قەیسەرێتیی رووسیا و... هتد دەوڵەتی تێریتۆریال territorial بوون، نەک ناسیۆنال. تەنانەت دەوڵەتەکانی ئەورووپاش پێش شۆرشی فەرەنسا دەوڵەتی ناسیۆنال نەبوون. ئاشکرایە کە شۆرشی فەرەنسا ٩٤ ساڵ پاش نووسینەوەی "مەم و زین" روویداوە. بەڵام مافی ئێمەی کورد بۆ ژیانێکی سەربەخۆ، هەر لەوەوە نایەت کە ئێمە کۆنە خاوەنی ئەو وڵاتەین کە تێیدا

دەژین، و ئەم گەلانەی کە خۆیان کردووە بە ئاغامان ؛ وەک ترک و عەرەب و فارس لە چاو کورددا تازەن لەو شوێنانەدا کە تیێدا نیشتەجیێ بوون (بۆ وێنە: عەرەبە کۆچەرەکان لەگەڵ فتووحاتی ئیسلامی لە دورگەی عەرەبییەوە هاتنە کوردستان و عیراق و سووریا، و هۆزە ترکەکانیش لە سەتەی دوانزەدا لە ئاسیای گچکەدا نیشتەجیێ بوون، پاش ئەوەی شەرکەرەکانیان ماوەیەک بوونە جاشی خەلیفەی عەبباسییە عەرەبەکان، و فارسەکانیش پاش میدیکان (مادەکان، کە باوو باپیرەی کورد بوون) کەوتنە فەرمانرەوایی، تەنانەت دەوڵەتی ساسان دەوڵەتی فارس و کورد بوو، پیتەختەکەشی (مەداین)(٣) لە نزیک جلەولاوە بوو کە ئیستەش کوردستانە) ئەریێ.... مافی ئیمە تەنیێ لەمانەوە نایەت، بەڵکو مافی ئیمە لەو سەرەتا ئینتەرناسیۆنالەشەوە دیێ کە دەبیژیێ "هەموو گەلیک مافی بریاردان بۆ برینەوەی چارەنووسی خۆی بەدەستی خۆیەتی". جا ئەگەر ئیستە ئیمە لەوە گەرێین کە کوردی وا هەن، یان لەبەر ترس، یان لەبەر هەلپەرستی، یان لەبەر بیهیوایی، یان لەبەر بیدەسەلاتی، یان بۆ "راگرتنی رەوشی دیپلۆماسی"- وەک ئەوان خۆیان دەبیژن - راستەوخۆ باسی کوردستانیکی ئازاد و سەربەخۆ ناکەن و دەم لە "ئۆتۆنۆمی" یەوە دەدەن، ئەوا هەمووممان دەزانین کە زۆریەی هەرە زۆری کورد لە دڵدا ئازادی و یەکسانی و سەروەریتیی نەتەوەی کوردیان دەویێ، و تەنانەت ئەو کوردانەی کە لەبەر هەر هۆیەک دەبیێ، با ببیێ، ناچار بوون خۆیان لە بەرەی داگیرکەراندا ببیننەوە وەک "فرسان" و "قۆروجو" و "پاسدار" (٤) ئەوا دیسانەوە هەر خۆیان بە "جاش" (٥)ی داگیرکەرانی کوردستان نازانن. راپەرینی بەهاری ١٩٩١ لە باشووری کوردستاندا دەریخست کە ئەمانەی پییاندەگوتن "جاش" و "مستشار" و چی و چی، بە چ جۆریک کەوتنە ویزەی رژیمی بەعس و هەڵکردنی ئالای پیرۆزی کوردستان.

ئەمەیان وا، و ئیستە دەبیێ بزانین کە ئیمەی کورد هەر خۆمان نین کە خۆمان بە "کورد" دەزانین، بەڵکو ناخۆکانیش ئیمە هەر بە کورد دەناسن. شانامەی فیردەوسی (٩٣٢ز-١٠٢٠ز) و بەرهەمەکانی دیرۆکناسانی عەرەب و موسڵمان وەک "مروج الذهب" ی مەسعوودی بەر لە هەزار ساڵ باسی کوردیان کردووە.

جا هەرچەندە داگیرکەرانی عەرەب و فارس و ترک هەوڵی ئەوەیان داوە و دەدەن کە بنەچەو ڕەچەڵەکی کورد ببەنەوە سەر ڕەگەزی خۆیان، بەڵام ئەم هەوڵ و تەقەلایانە لەم سەتەیەدا کە سەتەی زانست و لێکۆڵینەوەی بابەتانەیە؛ بوونەتە قسەی قۆڕ و هۆی گاڵتە و ماکی پێکەنین و تیزەجاڕ.

بەڕێزینە:

داگیرکەرانی کوردستان کە لە بەرەی "ناخۆن"، هەموو هۆڤ و ملهوڕ و کۆلۆنیالیستن. ئەمانە کوردستان بە وڵاتی ئێمەی کورد نازانن، بەڵکو بە بەشێک لە وڵاتەکانی خۆیان دەزانن. لەبەر ئەوە هەموو بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازانەی کورد بە هەڵە بە "جیابوونەوە خوازی" دەدەنە قەڵەم. لە کاتێکدا کە بزووتنەوەی کوردایەتی "جیابوونەوە خوازی" نییە، بەڵکو ڕزگاریخوازییە لە دەسەڵاتی ناخۆی کۆلۆنیالیستانەی ناڕەوایانەی ترک و عەرەب و فارس. جا لەبەر ئەوەی ئەم دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان هەر پێنجیان (٦) دەستکردن و پاش جەنگی جیهانیی یەکەم لەلایەن ئەورووپاوە بنیات نراون، وەک دەوڵەتی ناسیۆنال بۆ ترک و عەرەب و فارس و کوردستانیش بەزۆر نووسێنراوە پێیانەوە، دیارە هەموو جۆرە ڕژێمێکی دیمۆکراسی کە ببێتە سەرەتایەک بۆ ئازادیی کورد، ڕەگ و ڕیشەی ئەو دەوڵەتانە لە بن دەردەهێنێ. ئەمەش تەنێ چارەنووسی ڕەشی دەوڵەتانی ترک و ئێران و عێراق و سووریا و ئازربایجان نییە، بەڵکو چارەنووسی هەموو دەوڵەتێکی دەستکردە لەم جیهانەدا، سا زوو بێ یان درەنگ. یەکێتیی سۆڤێت، یۆگۆسلاڤیا، چیکۆسلۆڤاکیا و...هتد. نموونەن بۆ ئەمە. هەر لەبەر ئەمەشە کە ڕژێمەکانی ئەم دەوڵەتانە بە هەموو هێزێکیانەوە لە دژی دیمۆکراسی و پلووڕالیزم دەوەستن و هەموو جۆرە وتووێژێکی دیمۆکراسی یانە بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد بە ئاشتی؛ دەدەنە دواوە. چونکە لەم کارەدا ڕووخانی بێ چەند و چۆنی دەوڵەتە ناسیۆناڵە دەستکردەکانیان و مردنی فەرمانڕەواییی زۆردارانەی خۆیان دەبینن، و تاکە ڕێیەک کە پێیدا بچن بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد، دەستوەشاندن و تیرۆر و بەکارهێنانی زۆرە. جا

لەبەر ئەوە دۆزی کورد هەرچەندە کاکڵەکەی سیاسییە و دەشیا لە ڕێی سیاسەتەوە چارەسەر بکرایە، بەڵام بووەتە کێشەیەکی سوپایی و جەنگ و لەشکرکێشکردن و خوێنڕشتن و گوند و باژێڕ کاولکردن و بەکارهێنانی چەکی کۆمکوژ بۆ نەهێشتنی نەتەوەی کورد و خۆ ڕزگار کردن لە کێشەکەی. ئەوجا وەک ئەنجامێک بۆ ئەوە؛ دەبێ ئێمە بگەینە ئەو ڕاستییەی کە داخوازیی زۆربەی هەرە زۆری حیزبە کوردییەکان لە پاش جەنگی جیهانیی دووەمەوە تا ئەوڕۆ کە "دێموکراتی"یە بۆ دەوڵەتی داگیرکەر و "ئۆتۆنۆمی" یە بۆ کوردستان، هەر لە بنچینەوە هەڵە و خەیاڵپڵاوییە. چۆنکە هەموو جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی ڕاستەقینە، جۆرە سەربەستییەکە بۆ کورد و هەنگاوێکە بۆ خۆ کۆ کردنەوە بۆ چوونەوە باوەشی نیشتمانی دایک، واتە کوردستانی مەزن، زوو یان درەنگ. ئەوانیش خۆیان باش ئەمە دەزانن. لەبەر ئەوە هەموو جۆرە وتووێژێکی بێدەسەڵاتانە لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستاندا، ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان مسۆگەر ناکات، مەگەر ئەوەی کە هێز و زۆری کورد بگاتە ڕادەیەک مافی خۆی بەسەر داگیرکەراندا بسەپێنێ و بشتوانێ بیپارێزێ و ڕاگیری بکات، و ئەمەش لەدەست کوردی بێسوپا و بێدەوڵەت نایەت. ئەگەنا مار ناتوانێ بێژەهر و کەڵبە دەوری مارێتی بنوێنێ. هەموو دیکتاتۆرێک وەک مار وایە و بە ژەهرەکەی کە تینرۆر و ماکی زۆردارییە دەژی، و بێدەستووەشاندن لە دیکتاتۆرێتی دەکەوێ و دەبێتە جانەوەرێکی دەستەمۆ. لەبەر ئەوە تا ئەو ڕژێمە دیکتاتۆر و تۆتالیتێر و میلیتاریستانە کە کوردستانیان داگیر کردووە بمێنن، کورد هیچ جۆرە ئازادییەکی دەستناکەوێ. تا کە ڕێیەک بۆ ئەوەی کورد بگاتە ئامانجی خۆی؛ لابردنی ئەو دەسەڵاتە دژ بە ئازادی و دێموکراسییانەیە لەو دەوڵەتانەدا کە ئاخی (خاک)ی کوردستانیان بەزۆر نووساندوە بە دەوڵەتەکانیانەوە. پاش نەمانی ئەو ڕژێمانە، ئەوجا بەکارهێنانی مافی چارەنووسە لە لایەن خەڵکی کوردستانەوە، ئەوەش لە ئازادیدا و بۆ ئازادی (٧). بە بیر و باوەڕی من باشترین شێوە بۆ دوارۆژی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست هاتنە کایەی کۆمەڵە دەوڵەتێکی فێدەرالییە لەو نێوچەیەدا کە هەموو وڵاتی عەرەب و ترک و فارس و بلووچ و تەنانەت ئیسرائیلیش بگرێتە خۆی و

کوردستانیش یەکێک بێ لەو دەوڵەتە فیدرالییانە. دیارە کەسانی دیکەش هەن کە هەریەکە بیروڕای خۆی هەیە، و بڕیاری کۆتاییشی بە دەست خەڵکی کوردستانە.

## بەڕێزان

ئەمەیان وا، و بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی دیمۆکراسی و ئازادیخواز و پلوورالیست کە هەموو هەرێمەکانی کوردستان بە تەواوی بگرێتە باوەش خۆی و مافی هەموو ئەو کۆمەڵە ئێتنییانەش بدات کە لەو سنوورە مێژوویی و جوگرافیاییەدا ژیاون و دەژین. و دەورێکی دەستپێشکەرانە بنوێنێ لە خزمەتی ئاشتیی جیهان و مافی مرۆڤدا، چارەسەری کێشەی نەتەوەی کورد بە تەواوی ناکات. ڕاستییەکەی ئەوەیە ئێمە نێزیکەی ۱۰-۱۵ ملوێن کوردمان هەیە کە لە بازێڕە گەورەکانی ئەو دەوڵەتانەدا دەژین کە کوردستانیان داگیر کردووە. ئەم کوردانە هەر ئەوانە نین کە بەزۆر لە کوردستانەوە کۆچپێدراون بۆ ئاوەکیکردن و تواندنەوەیان، بەڵکو زۆربەی هەرە زۆریان سەتان ساڵە لەو شوێنانەدا دەژین، و هی واشیان هەیە سەردەمی نیشتەجێبوونیان لەو شوێنانە لە سەردەمی نیشتەجێبوونی ترک و عەرەب و فارس کۆنترە. ئەو کوردانە خەڵکی ئەو شوێنانەن و دیارە دەیانەوێ لەو شوێنانە بژین و بمێننەوە، و ئەوەش مافی خۆیانە. بۆ وێنە ٤-٥ ملوێن کوردی ئەستەمووڵ و چەند ملوێنێک کوردی ئەنقەرە و ئیزمیر و قۆنیە، زۆربەی زۆریان پاشماوەی ئەو کوردانەن کە چەند سەت ساڵێکە، و هێندێکیشیان لەپێش ترکەکاندا لەو وڵاتانە ژیاون. لە ملوێنێک زێتر کوردی فەیلی لە بەغدا و لە ملوێنێک پتر کوردی سوننی هەر لە بەغدا، لە نیشتمانی خۆیاندا دەژین. بەغدا لە پێش فتوحاتی ئیسلامیدا وڵاتی کورد بووە؛ وشەی بەغدا لە "بەگەدات" واتە (خودێ داو)ی کوردیی ئێرانی کۆنەوە هاتووە. زمانی کوردیی فەیلی پاشماوەی زمانی کوردیی پەهلەوییە کە زمانی ڕەسمیی ئیمپراتۆرێتیی ساسانی بووە و وشەی فەیلی لە پەهلەوییەوە هاتووە (۸) پتر لە ملوێنێک کورد کە ئەوڕۆ لە خۆراسان دەژین و ئێستەش بە کوردی

(کرمانجیی ژووروو) دەپەیڤن و هەرێمەکەیان بە کوردستانی خۆراسانی بەنێوبانگە هەزار ساڵ پترە لەوێ دەژین. راستە لە سەردەمی سەفەوی یە شیعە پەرستە تەنگەتیلکەکاندا هەزاران کورد کۆچپێدراون بۆ خۆراسان، بەڵام خۆراسان هەر لە کۆنەوە وڵاتی کورد و فارس بووە. سەرداری کورد ئەبو موسلیمی خۆراسانی کە لە ساڵی ٧٥٠ ز دا دەوڵەتی ئەمەوییەکانی رووخاند و دەوڵەتی عەباسی دامەزراند، کوردی خۆراسان بوو (٩). لە تاران دوو ملوێن کورد دەژین. هەروەها سەتان هەزار کورد هەن لە هەر یەکێک لە لوبنان و ئیسرائیل و پاکستان و هیندستان و ئەوروپا و ئەمریکا و ئوسترالیا. جا ئەگەر ئەم کوردانە خۆیان ویستیان بێنە کوردستانەوە، ئەوا کوردستانماڵی هەموو کوردێکە، بەڵام ئەگەر نەیانویست، یان نەیانتوانی، کە زۆر دوورە بتوانن، ئەوا پێویستە لە جێی خۆیان تەرە و پەڕەوازە نەکرێن، و فەرمانی سەرشانی نەتەوەی کورد ئەوەیە مافیان بپارێزێ، سا لە شێوەی ئۆتۆنۆمیدا بێ، یان لە شێوەیەکی دیکەدا. کوردستانی دوارۆژ کە دەبێ بە تەنگ دانی مافی کەمایەتیی عەرەبی مووسڵ و کووت و دیالە و کەمایەتیی فارسی هەمەدان و ترکمانی ورمێ و کەرکووکەوە بێ، دەبێ بە تەنگ مافی ئەو کوردانەشەوە بێ کە دەکەونە سنووری سیاسیی دەوڵەتانی بیانییەوە. ئەم پرنسیپە گرنگە تا ئێستە لەلایەن هێزە سیاسییەکانی کوردستانەوە پێشەمی پێنەدراوە. بۆ نموونە: دوو ملوێن کوردی فەیلیی بەغدا و خوارووی عێراق لە وتووێژی "ئۆتۆنۆمی" نێوان بەعسییەکان و پارتی دێمۆکراتی کوردستاندا لە ساڵی ١٩٧٠ دا خرانە پشتگوێ. ئەوەبوو رژێمی بەعسیش بە سەت هەزارانی لێدەربەدەر کردن و ماڵ و ملکی لێسەندن.

### بەرێزینە

ئێستە با درێژە بە باسەکەمان بدەین و بنوارینە کوردستانی داگیرکراو، و ئامانجی نەتەوەی کورد. ئاشکرایە ئەگەر ئامانج مافی نەتەوەی کورد و وەدەست هێنانی فەرمانڕەوایی نەتەوەی کورد بێ بەسەر کوردستاندا، ئەوا پێویست بە بوونی سەروەرێتییەکی کوردستانی هەیە. جا شێوەی ئەو

سەروەرێتییە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بێ ، یان دەوڵەتێکی فیدرالی بێ، ئەوە گرنگ نییە. مەرج سەروەرێتیی تەواوە بەسەر خاکی کوردستاندا و مافی وەک یەکە لە دەزگە ئینتەرناسیۆنالییەکاندا، بەڵام دروستکردنی ئەو چوار چێوەیە هەرچی چۆنێک بێ، پێویستی بە کردەوەیەکی کوردانەی شارستانانە هەیە. بەبێ هەوڵ و تێکۆشانێکی شارستانانە هیچ جۆرە چوار چێوەیەکی سیاسی پێکنایەت. شارستانێتی civilization لەگەڵ نیشتەجێبوون و خانوو دروستکردندا دەستپێدەکات. کۆچەر بێخانییە وماڵی بە کۆڵییەوەیە، و هەر لەبەر ئەوەشە کە کۆمەڵگەی کۆچەرێتی دەوڵەتی پێدروستناکرێ. کەواتە ئەوانەی دەیانەوێ بنیاتی چوارچێوەیەک بۆ سەروەرێتیی خەڵکی کوردستان چێبکەن، واتە خانوویەک یان خانۆچکەیەک بۆ نەتەوەی کورد بنیاتبنێن، دەبێ بە شێوەیەکی شارستانانە بیربکەنەوە، بەکورتی دەبێ لە هەڵسوکەوتی سیاسی دا واز لە بیر و بۆچوون و رەوشتی کۆچەرێتی بهێنن. لەنێو کۆچەردا هیچ کاتێک ملکەچکردن بۆ زاگۆن (قانون) ی نیشتەجێیی و خۆ بەستنەوە بە پەیمانی باژێرڤانییەوە لە نێویەکدا ریزی نییە. تەنێ ژیانی نیشتەجێی، واتە شارستانێتییە کە پێویستیی بە لەگەڵ یەک رێککەوتن و پەیمان لەگەڵ یەک بەستن و پێکهاتنە لەسەر رێکخستنی پێوەندییەکانی پێکەوە ژیان، و لە ئەنجامی ئەمەشدا واز هێنانی لایەنە لەگەڵ یەک رێککەوتووەکانە لە هێندێ داخوازیی دەستەیی و کۆمەڵی و حیزبایەتی لە پێناوی رێککەوتندا لەسەر بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگە. حیزب و کۆمەڵە سیاسییەکانی کورد و هەموو خەڵکی ناحیزبی کوردستانیش، ئەگەر دەیانەوێ بگەنە هێنانەدی ئامانجی نەتەوەی کورد لە رزگاری و ئازادیدا، دەبێ بزانن کە ناگەنە ئەم ئامانجە هەتا رێی نەرێتی شارستانێتی نەگرن. کورت و کرمانجی: دەبێ هەموو حیزب و کۆمەڵە سیاسییەکانی کوردستان لەم رۆژەدا لەسەر بنچینەی کەمترین مافی نەتەوەیەک کە هەموو جیهانی پێشکەوتوو دانی پێدا ناوە، کە ئەوەش مافی برپاردانە لەسەر دوارۆژی خۆی بەدەستی خۆی، لەگەڵ یەک پێکبێن، و هەر یەکەیان لە سنووری پاراستنی سەربەخۆیی بیر و بۆچوونی خۆیدا، شوێنی خۆی لە چوارچێوەی ئەم ئامانجەدا بدۆزێتەوە، ئەوجا بێ هەرا و زەنا و

شەرەزرتانێ و بێ ژیاندنەوەی کولتووری کۆچەریتیی سیاسی بەنێوی "پێشڕەوی"ی ساختە و دەمڕاستیی درۆزنەی ئەم چین و ئەو چینەوە. هەمووتان دەزانن نیوە سەتەیەک کە تەمەنێکی دوور و درێژە لە ژیانی نەتەوەیەکدا، دەرمانی بێهۆشی کرا بە گەرووی کوردی بەدبەختدا، ئەوەش بە نێوی "پێشڕەوی" و "خەباتی چینایەتی" و "سەرکردەیەتیی پرۆلیتاریا" و ئەم بەزمانەوە. ڕاستییەکەی نە کەس مافی "پێشڕەوی" هەیە و نە کەسیش بە کوڵ و دڵەوە بە "پاشڕەوی" ڕازییە. خەڵکی کوردستان بە ژن و پیاو و زارۆ و لاو و پیر و کرێکار و جۆتکار و سەپان و کاسپکار و خوێندەوار و نەخوێندەوار و کورد و ناکوردییەوە؛ هەموو بەشخوراو و بندەستن و هەمووش خاوەن مافن و ئەندامی کۆمەڵگەی کوردستانن کە ئەو کۆمەڵگەیەش تەنێ و تەنێ لەژێر ئالای ئازادی و یەکسانی و ڕێز لە یەک گرتندا سەربەرز دەبێ. هەتا نەتەوەی کوردیش ئاوا دیل و بندەست و وڵاتەکەی داگیرکراو بێ، هیچ کوردێک و هیچ کوردستانییەک سەربەرز نییە و نابێ. سەربەرزیی هەموو کوردستانییەک لەو ساتەوە دەستپێدەکات کە بای ئازادی سەر و دڵیان فێنک بکاتەوە.. با زۆر لەسەر قسە نەڕۆین. دەبێ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە زووترین کات هەوڵی هاتنە کایەی کۆڕێکی سەروەریتیی هەڵبژێردراو بدەن بۆ سەرپەرشتی و هاوئاهەنگکردن و بەڕێوە بردنی تێکۆشینی گشتییان بەرەو ئەو ئامانجەی باسکرا. ئەمەش پێویستیی بە بەستنی کۆنگرەیەکی نیشتمانیی کوردستانیی بەرفراوان هەیە کە لەڕێی هەڵبژاردنێکی دێموکراتییانەوە ئەندامانی ئەو کۆڕە، کە ئەوەش جۆرە پەرلەمانێکە، دەستنیشان بکات. شایانی باسە خەباتکاری کورد؛ برای خۆشەویست جەوادی مەلا کە داهێنەری بیری کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان و پەرلەمانی کوردستانە لە دەرەوەی وڵات، توانی یەکەمین کۆنگرە لە ساڵی ١٩٨٩ و دووەمین کۆنگرەش لە ساڵی ١٩٩١ دا لە لەندەن بە کردەوە بهێنێتە دی. لەو کۆنگرانەدا نوێنەرانی زۆربەی زۆری حیزبەکانی کوردستان و کۆمەڵانی کورد لە دەرەوەی وڵات بەشدارییان تێدا کرد. ئێستە خۆی و برادەرەکانی بەتەمان زەوی بۆ بەستنی کۆنگرەی سێیەم لە هەلسنکی (فینلەندە) ئامادە بکەن و سەرجەمی حیزب و کۆمەڵە

سیاسییەکانی کوردستانیش بانگێشتن بکەن. جا لەبەر ئەوەی کاکی بەڕێز ڕەهبەر مامەش کە یەکێکە لە نوێنەرانی کۆمیتەی ئامادە کردنی کۆنگرەکە لەم کۆبوونەوەی ئەوڕۆماندا بەشدارە زۆر لەسەر ئەم باسە نادووم، با ئەو خۆی بفەرموێ و لەم بارەیەوە زانیاریمان پێ بدات. (١٠).

بەڕێزینە:

سەبارەت بەوەی نیو سەتەیەکە حیزب و حیزبایەتی، بەو شێوەیەی لەسەرەوە باسمکرد، لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا دەورێک دەگێڕێ، بە پێویستی دەزانم هەر لەم بوارەدا چمکێکی دیکەی ئەم حیزب و حیزبایەتییەی کوردستان بخەمە بەر ڕەخنەی ڕۆشنبیرانە و شیکردنەوەی بابەتانە:

زۆربەی زۆری ئەو حیزبە کوردییانەی لە پاش کۆتابوونی جەنگی جیهانیی دووەمەوە دروست بوون کە سەرەتاکەی بە پارتی دیمۆکراتی کوردستان لە ١٦ ی ئابی ١٩٤٦ دا دەستیپێکرد، نە بە تەواوەتی کوردستانین و نە بە تەواوەتی حیزبی ئەو دەوڵەتەن کە ئەو پارچەیەی کوردستانی داگیرکردووە. ئەمەش زیانێکی گەورەی بەو حیزبانە خۆیان و بە سەرجەمی بزووتنەوەی کوردایەتیش گەیاندووە. دیارە هۆی ئەوەی کە ئەم حیزبانە خۆیان بە حیزبی "کوردستانی عێراق" یان "کوردستانی ئێران" یان "کوردستانی ترکیا" یان "کوردستانی سووریا" دەدەنە قەڵەم ، بەشێکی لە ترسی ئەوەیە کە نەک یە "جیاوازیخواز" بدرێنە قەڵەم. بەڵام بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە داگیرکەرەکانی کوردستان کە هەموو -وەک گوتمان- ڕژێمی دیکتاتۆر و میلیتاریست و تۆتالیتێرن، هەروەها هەموو ئەو حیزب و کۆمەڵە عێراقی و ترکیایی و سووریایی و ئێرانییانەی ئەو وڵاتانە، تەنانەت ئەوانەی کە لەسەر کاریش نین، یان حیزبی بەرهەڵستکەرانی ڕژێمەکانیانن، ئەوجا چەپییەکانیشیان و کۆمۆنیستەکانیشیان لەگەڵ، ئەوانیش ئەو حیزبە کوردییانەیان هەر بە "جیاوازیخواز" و "کلکی ئیمپریالیزم" داناوە و دادەنێن. جا ئەم حیزبە کوردییانە، چۆنکە خۆیان تەنێ بە حیزبی ئەو بەشە کوردستانە دادەنێن کە بەستراوە بەو وڵاتەوە، نەک بە حیزبی دەوڵەتەکە هەمووی (واتە با بڵێین حزبێکی عێراقی، یان ترکیایی، یان

سووریایی، یان ئێرانی)، ئەوا دیارە ئەمانە هەر لە سەرەتاوە و بە دەستی خۆیان ، خۆیان گچکە دەکەنەوە و خۆیان دەکەنە حیزبی پارچەیەک و بەمەش خۆیان بە حیزبی "کەمایەتییەک" دەدەنەقەڵەم و ڕێچۆڵدەکەن بۆ دەستڕۆیشتووان و بەرهەڵستکەرانی گەلی سەردەستە، تا یاری بە چارەنووسی ئەوانیش و کوردیش بکات. ئەمەش مانای وایە ئەم حیزبە کوردییانە هیچ کاتێک و لە هیچ دەوڵەتێک لەم دەوڵەتانەدا کە کوردستانیان بەشکردووە ، ڕێی ئەوەیان نابێ کە بێنە سەر کاری فەرمانڕەوایی. واتە ئەو دەورەی ئەمانە دەیبینن لە شەڕی چەکداری و رامیاری دا؛ هۆیەکە بۆ بێهێزکردنی ڕژێمی فەرمانڕەوا و پێکهێنانی هەلومەرجێکی لەبار بۆ بەرهەڵستکەرانی ڕژێمی گەلی سەردەستە کە بکەونە چاوو ڕاو و کەینو بەین و بە هاسانی بێنە سەر کار و ئەوجا بکەونەوە شەڕی کورد و بەمە دۆزی کورد وەک کورتانەکەی جەحاڵ هەموو جارێ، دەبێ لەسەرەوە بدوورێتەوە... خۆ ئەگەر بهاتایە و ئەم حیزبانە بەو دەسەڵاتە سوپایی و ئابووری و سیاسییانەوە کە هەیانە (و بێگومان بەرهەڵستکەرانی ترک و عەرەب و فارس نییانە) بەنێوی ڕێکخراوێکی عێراقی، یان ئێرانی، یان ترکیایی، یان سووریاییەوە کاریان بکردایە، یان هیچ نەبێ ڕێکخراوێکی جەماوەری لەو بابەتەیان دروست بکردایە و پێ یان بهاویشتایە بۆ نێو سوپا و پۆلیس و جەماوەری گەلی سەردەستە، ئەوسا لەوانەش بوو بتوانن چارێک بۆ دۆزی کورد بدۆزنەوە. ئەمەش ڕێیەکە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەسەرەوە. ئەوەش شتێکی سەیر و سەمەرە، یان ڕاوی کێوی رەش نییە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

**یەکەم:** کورد بە کەمایەتی دانانرێ، چۆنکە تا ئێستە سەرژمێرێکی ڕاستەقینە نییە کە بزانین کورد چەندە و عەرەب چەندە لە عێراق و سووریادا، یان کورد چەندە و ترک چەندە لە ترکیادا، یان کورد چەندە و فارس چەندە لە ئێراندا. گەلێکی دە هەزار کەسی لە وڵاتێکی دە ملوێنیدا کەمایەتییە، بەڵام گەلێکی (٨) ملوێنی لە وڵاتێکی (١٨) ملوێنیدا کەمایەتی نییە.

**دووەم:** کە ئەم دەوڵەتە داگیرکەرانە خۆیان بە یەک پارچە بزانن، دیارە

هەموو کەسێک مافی فەرمانڕەوایی هەیە بە نێوی پێوەنداری ئەو دەوڵەتەوە، سا هەر کەسە کە تێیدا دەژی، سا ئەو کەسە کورد بێ، یان کورد نەبێ گرنگ نییە. چۆنکە ئەگەر کورد ڕێ نەدرێ پێی لە دەوڵەتەکە جیا ببێتەوە، بە بیانووی ئەوەوە کە ئەو دەوڵەتە یەک دەوڵەتە و گەلەکەشی یەک پارچەیە، دیارە دەبێ ڕێی ئەوە بدرێ پێی کە لە سنووری ئەو دەوڵەتەدا گەشە بکا، بجووڵێتەوە و مافی یەکسانی هەبێ لەگەڵ هاووڵاتییەکانی دیکەی ئەو دەوڵەتەدا، ئەگەر وانەبێ هاووڵاتێتیش دەبێتە کۆیلەیەتی.

سێیەم: لە هەموو ئەو دەوڵەتانەدا کە کوردستانیان لە خۆیان بەشکردووە، هەر لە سەرەتاوە و تا ئێستەش هەر کەمایەتی فەرمانڕەوا بوون. بۆ وێنە: بەعسییە عەلەوییەکانی سووریا کەمایەتین، بەعسییە سوننییەکانی عێراق کەمایەتین، ترکە تۆرانییە سوننییەکانی ترکیا کەمایەتین، شیعە فارسەکانی ئێران کەمایەتین. بەڵێ ئەمانە هەموو کەمایەتیشن و کەچی جڵەوی دەوڵەتیشیان لەو وڵاتانەدا بە دەستە. بێجگە لەوەش کورد دەیەوێ لەم ڕێیەوە بگا بە مافی خۆی ، نەک ڕێگرتن لە مافی خەڵک. سەیر ئەوەیە لە "هەرێمی ئاسایشدا" کە دیفاکتۆ de facto دەوڵەتێکی کوردە، چەند پەنابەرێکی عەرەب لەوێ میوانن، بەڵام خۆیان کردووە بە دەمڕاست و سەرۆکی ئەوەی پێی دەڵێن "کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق"، نەک یەکێکی وەک کاک مەسعوود بارزانی، یان مام جەلال تالەبانی کە ئەمانە هێزی سەرەکیی ئەو "کۆنگرە" عێراقییەن و دەبوو یەکێک لەمان سەرکردەی کۆنگرە بێ، بۆ ئەوەی دواڕۆژ ببێتە سەرکۆماری عێراق.

ئەمە لە لایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە چۆنکە ئەم حیزبە کوردییانە خۆیان بە نوێنەری پارچەیەک دادەنێن لە دەوڵەتی گەلی سەردەستە، دیارە ناچارن کێشەی کوردیش هەر بە بەشێک لە کێشەی نێوخۆییی ئەو دەوڵەتە دابنێن کە پارچە کوردستانەکەی داگیر کردووە، و دیارە چارەسەرکردنیش هەر دەبێ بە دەست ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە بێ کە پارچەکەی داگیرکردووە، کە خۆیایە چارەسەر ناکرێ وەک لەسەرەوە باسمان کرد.

ئەوجا بە پێچەوانەی ئەمەوە، ئەگەر بهاتایە و ئەم حیزبانە شێوەی دووەمیان وەربگرتایە لە سیاسەتدا، واتە؛ هەر یەکەیان حیزبێکی کوردستانیی تەواو بووایە، ئەوا دەیانتوانی کێشەی کورد بکەنە کێشەیەکی سەربەخۆ، واتە ئینتەرناسیۆنالی. ئەو دەمەش زوو یان درەنگ هێز و بیر و دڵۆڤانیی ئینتەرناسیۆنالیان لەگەڵ دەبوو. دڵنیام ئێستە زۆر هەن دەڵێن کە ئەوە بە دەست حیزبە کوردییەکان نییە، بەڵکو جیۆپۆلیتیکی نێوچەکە رێی ئەوە نادات کە کوردستان بە بوویەکی جیا لەو دەوڵەتانەی داگیریان کردووە، لە قەڵەم بدرێ... بەڵێ.. راستە جیۆپۆلیتیک دەورێکی گرنگ دەگێرێ، بەڵام جیۆپۆلیتیک ئایەتی قورئان و ئینجیل و ئاڤێستا و تەورات نییە نەیەتە گۆران. جیۆپۆلیتیک لە ئاسمانەوە ناکەوێتە خوارێ بۆ سەر زەوی. هەلو مەرج شێوەی جیۆ پۆلیتیک دیاری دەکات و دەشیگۆرێ، و دروستکردنی هەلو مەرجیش بەدەبست مرۆڤ خۆیەتی. بۆ وێنە: کاتێک جەنگی جیهانیی یەکەم بە رووخاندنی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی تەواو بوو، جیۆپۆلیتیکی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و جیهان هیچ لەگەڵ ئەوەدا نەبوو کە دەوڵەتێکی ترک دروست ببێ بە تایبەتی بەڕێبەرێتیی مستەفا کەمالی "ئەتاترک". بەڵام هەوڵ و تەقەڵای "جۆن ترکەکان" کارێکی وای کرد پەیمانی سێڤر بخرێتە پشتگوێ و ئەم دەوڵەتە دەستکردەی ئەوڕۆی "ترکیا" دابتاشرێ. بە لێکۆڵینەوەیەکی کوور (قووڵ)ی بارودۆخی نێوچەکە و جیهان و بە تاوتۆکردنی ئەو هێز و بەرژەوەندییانەی کە کار دەکەنە سەر نێوچەکە، و بە خۆ ئامادەکردن و دابەشکردنی دەور بەسەر ئەوانەدا کە بەرپرسیاریان پێدەسپێردرێ لە بزووتنەوەی کوردایەتیدا، هەلو مەرجی نوێی وا دێتە کایەوە کە بە دڵی کورد بێ. وەک دەزانن پاش شکانی لەشکری سەددام، ئەمریکا رازی نەبوو "هەرێمێکی ئاسایش" بۆ کورد دروست ببێ، دوایی نەک هەر رازی بوو بە دامەزراندنی، بەڵکو سەربازی خۆشی نارد بۆ پاراستنی، و لەم رۆژانەشدا نوێنەری نارد بۆ باشووری کوردستان کە بکەونە نێوبژیی کورد و کورد(١١). گۆڕانی دیکەش دێتە کایەوە، بەڵام کورد دەبێ ئامادە بێ و دەورێکی ئەرێتی (ایجابی) هەبێ لە ئاڕاستەکردنی رێبازی ئەو گۆڕینەدا، تا بتوانێ سووت لەو

گۆڕانانە بۆ بەرژەوەندیی خۆی وەربگرێ. لەو گۆڕانانەی کە لەوانەیە لە نێوچەکەدا روو بدەن گۆڕانی رژێمی ئێران و عێراقە. بە تایبەتی چۆنکە دوو هێزی گەورەی وەک ئەمریکا و بەریتانیا ئەو گۆڕانەیان بە دڵە و بە ئاشکرا و نهێنی دژی ئەو دوو رژێمەن. هەروەها ئەمریکا و ئیسرائیل ترسێکی زۆریان لە رژێمی ئێران هەیە، بەتایبەتی لەوەی کە ببێتە دەوڵەتێکی ئەتۆمی. هیچ دووریش نییە کە سەددام حسەین جارێکی دیکە پەلاماری ئێران بداتەوە لەسەر ئەو حسێبەی کە خۆی بەو شێوەیە لای ئەمریکا و ئیسرائیل و بەریتانیا خۆشەویست بکاتەوە. بەکورتی هەوڵ و تەقەلای وا دێنە پێشەوە کە رژێمی ئێران و عێراق بگۆڕن.(١٢) بێگومان گۆڕینی ئەو دوو رژێمە بە دەستی بەرهەڵستکەرانی عەرەب و فارس شتێکی هاسان نییە، لەبەر ئەوە ئەو عەرەب و فارسانەی کە بەرهەڵستکەری ئەو دوو رژێمەن پێویستییەکی ژیارییان بە هێزی کورد هەیە. بۆیە پێویستە جارێ ئەم بەرهەڵستکەرانە بناسین و بزانین کێن؟ ئەگەر ئێستە عێراق بکەینە نموونە دەبینین کە بەرهەڵستکەرانی عەرەبی عێراق بریتین لەو چەند ناسیۆنالیستە شۆڤینیستە عەرەبە بەعسییەی کە سەر بە سووریا و لە سووریا پەنابەرن، هەروەها لەو رێکخراوە شیعەیەی کە نێوی نراوە "المجلس الاعلى للثورة الاسلامية في العراق" بە سەرۆکایەتیی سید باقر الحكيم کە ئەمانە لە ئێران پەنابەرن،(١٣) و بێجگە لەمانەش چەند کەسێکی دیکەی کەم هەن وەک سعد صالح جبر (کوڕی ساڵح جەبر)....ئەمانە هیچیان دەسەڵاتی لابردنی سەددامیان نییە. خۆ ئەگەر چەند عەرەبێکی شۆڤێنی دیکە هەبن کە لە سوپای سەددامدا مابنەوە، ئەوا ئەوان ناتوانن دەست لە سەددام بوەشێنن، چۆنکە بە دەمی خۆیان دەڵێن کە "لابردنی سەددام لەم بارودۆخەدا؛ مانای "سەربەخۆ بوونی کوردستان"ە، و ئەوانیش ئەوەیان ناوێ. چۆنکە هەموو کاتێک مانی سەددامیان پێ باشترە لەوەی کورد بگاتە هێندێک مافی خۆی. لەبەر ئەوە دەکەونە فرت و فێڵ لە کورد. تا لەم رۆژانەدا کە لەشکری سەددام پەلاماری کفری و هێندێک شوێنی دیکەی "هەرێمی ئاسایش"ی داوە؛ و بە پێی ئەو دەنگو باسانەی گەیشتوون، هێزی پێشمەرگەی کورد ئازایانە رێیپێگرتوون و زیانێکی زۆری لێداون، ئەوەتا دەبینین بەعسییەکانی سەر بە

سووریا و پیاوەکانی رژێمی مەلاکانی ئێران چوونەتە "ژووررووی عێراق" - وەک ئەوان نێوی باشووری کوردستان دەبەن - و چوونەتە سلاوی مام جەلال و کاک مەسعوود و خەریکن بە قسەی لووس بیانخاپێنن. تەنانەت رژێمی مەلاکان گوایە "هۆشیارکردنەوە" یەکی ناردووە بۆ "ئەوانەی دەچن بە گژ حیزبی تالەبانیدا؛ کاتێک حیزبی تالەبانی لە شەڕدایە دژی سەددام". ئێمە لێرەدا بە کوتە مەلاکانی ئێران دەڵێین کە نە مام جەلال و نە کاک مەسعوود و نە هیچ کوردێکی دی پێویستی بە ئامۆژگاریی ئێوەیە ، و نە کەسیش هێندە گێل و گەوجە تەفرەی "هۆشیارکردنەوە" ی ئێوە بخوات.

ئەمەشیان وا، و بەڵام با بێینەوە سەر باسی بەرهەڵستکەرانی رژێمەکانی عێراق و ئێران و دەوڵەتی ترک و سووریا لە عەرەب و فارس و ترک و با بزانین ئەمانە چۆنن:

بەرهەڵستکەرانی ئەو رژێمانەی نێو بران لە عەرەب و فارس و ترک، خۆیان لە خۆیاندا بە ژمارە کەم و بێهێز و کەمدەسەلاتن. ئەگەر دەسەلاتێکیشیان هەبێ، ئەوا لەم دەوڵەت و لەو دەوڵەتی دوژمن بە دەوڵەتەکەی خۆیانەوە دێ، و لەبەر ئەوە لە بریارداندا سەربەخۆ نین. لەمەش بترازێ، و وەک تایبەتکارێکی گرنگی ئەم بەرهەڵستکەرانە ئەوەیە کە ئەمانە خۆیان لە خۆیاندا دێمۆکرات و ئازادیخواز و سەر بە رەوشی پلوورالیزم نین. بەڵکو ئەوانیش کۆپییەکی ئەو رژێمە ملهوڕانەن کە لەسەر کارن. با جارێ ئێران وەک نموونەیەک بهێنینەوە. با بزانین لە ئێران بەرهەڵستکەران کێن؟

بەهێزترین کۆمەڵی بەرهەڵستکەرانی رژێمی ئێران دار و دەستەی "موجاهدینی خەڵک"ن (مجاهدین خلق) بە سەرۆکایەتیی مەسعوودی رەجەوی (مسعود رجوی) و ژنەکەی مەریەمی عەزدانلوو (مریم عضدانلو). "موجاهدین" پاش ئەوەی ماوەیەکی باش لەگەڵ رژێمی خومەینیدا هاوکاریی تەواویان کرد، ئەوجا لێیجیا بوونەوە و کەوتنە بەریەرەکانیی رژێمی خومەینی بە چەک و بە سیاسەت. ماوەیەکیش لەگەڵ حیزبی دێمۆکراتی کوردستان (ئێران) دا هاوکارییان کرد بۆ ئەوەی حیزبی دێمۆکرات رێیان بدا لە رۆژهەلاتی

کوردستاندا بژین و بنکەی چالاکیی دژ بە رژێمی خومەینی دابنێن. ئەوجا کەوتنە هاوکارییەکی خەستو خۆڵ لەگەڵ رژێمی سەددام، و کە هەستیان بەوە کرد شەهید ئەوڕەحمانی قاسملو رێیان نادات دەست بخەنە نێو کاروباری کوردەوە، کەوتنە بەربەرەکانیی قاسملو و حیزبی دێمۆکرات و دوژمنایەتی کردن لەگەڵ کورد. "موجاهدینی خەڵک" وەک خۆیان دەبێژن دەیانەوێ لە جیاتی رژێمی ئێستەی ئێران "کۆماری دێمۆکراتی ئیسلامیی ئێران" دابمەزرێنن. "دێمۆکراتی ئیسلامی" ی ئەوانەش هەر لە ئێستەوە دیارە. ئەوەتا مەسعوودی رەجەوی، مریەمی ژنی کردووە بە "سەرکۆمار"ی ئێران بەبێ پرسو را کردن بە نەتەوەی کورد، یان گەلانی ئێران. بێجگە لەمەش لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ دا نەتەوەی کورد رژێمی "دێمۆکراتی ئیسلامی" ی موجاهدینی باشتر تاقیکردەوە کاتێک چەتەکانی "موجاهدینی خەڵک" شان بە شانی پیاوەکانی سەددام و فەلەستینییەکان کەوتنە کورد کوشتن لە خوارووی کوردستاندا، و زورنا ژەنەکانیشیان لە ئەورووپا کەوتنە بڵاوکردنەوەی پرۆپاگەندە لە دژی "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان" کە گوایە ئەمانە پیاوی رژێمی ئێرانن، چونکە "یەکێتی" لەو رۆژانەدا بەرهەڵستی دەستدرێژییەکەی "موجاهدین" ی کردبوو (١٤).

جا وەنەبێ بەرهەڵستکەرە ئێرانییەکانی دیکە وەک "کۆمار خوازان" (جمهوری خواهان" یان بەرەی ناسیۆنال (جبهه ملی) وشاپەرستان (سلطنت طلبان) و کۆنە ساواکییەکان و تەنانەت چەپهاژۆکانی وەک فیدائیانی خەڵک (فدائیان خلق) (اکثریت) و کۆنە توودەیی یەکانیش لە "موجاهدینی خەڵک" جیاوازبن. نەخێر. ئەوانیش هەرچەندە هەموو هەوڵی رووخاندنی رژێمی مەلاکان دەدەن، و هەوڵی ئەوەش دەدەن کە لەلای کاربەدەستانی ئەمریکا و ئەورووپا خۆیان خۆشەویست بکەن و نێوی "موجاهدین" خراپ بکەن و بە تیرۆریست باسیان بکەن و پەیتا پەیتایش داوای یارمەتی لە ئەمریکا و ئەورووپا دەکەن بۆ رووخاندنی رژێمی مەلاکان، بەلام ئەمانەش هەموو لە یەک خاڵدا لەگەڵ "موجاهدین" و رژێمی ئێستەی ئێران یەکدەگرنەوە. ئەوەش ئەوەیە کە کورد نابێ وەک گەل هیچ جۆرە ئازادییەکی دەستبکەوێ، تەنانەت ئۆتۆنۆمیش کە

فارسەکان "خود موختاری" (خودمختاری) پێدەڵێن، ئەوەش نابێ ببێ. ئەمانە هەموویان وەک "موجاهدین" و کاربەدەستانی رژێمی مەلاکان سەری زمان و بنی زمانیان "تمامیت ارضی" واتە (تەواویەتیی خاک)ە، کە بەپێی ئەمە لەم ئێرانەی ئەورۆ کە پارچەیەک کوردستان و پارچەیەک ئازربایجان و پارچەیەک عەرەبستان و پارچەیەک بلووجستان و پارچەیەک ترکمانستانی بە خۆیەوە لکاندووە، نابێ هیچ بەشێکی لێکەمببێتەوە. لەوەش بترازێ هەموو ئەم دەستانەی سەرەوە کە نێومان بردن، زمانی فارسی کە تەنێ زمانی گەلی فارسە، بە زمانی ناسیۆناڵ "ملی" ئێران دادەنێن، نەک هەر هی فارسەکان، و داواش لە هەموو ئێرانییەک دەکەن کە زمانی فارسی بە "زمانی ناسیۆناڵ" ی خۆی بزانێ. رۆژنامەی "کیهان" کە لە لەندەن لە لایەن چەند کۆنە شاپەرست و ساواکییەکەوە دەردەچێ، بووەتە زمانی حاڵی هەموو ئەمانە و بەردەوام پرۆپاگەندەی ژەهراوی دژی کورد بڵاو دەکاتەوە، ئەوجا نەک هەر کوردی رۆژهەڵاتی کوردستان کە نووسێنراوە بە ئێرانەوە بەڵکو لە دژی کوردی هەموو لایەک. تەنانەت لەو رۆژانەدا کە دکتۆر شەرەفکەندی و برا کوردەکانی لە چێشتخانەی میکۆنۆس لە بەرلین شەهید کران، لە کاتێکدا لە تەنیشت گوایە" بەرهەڵستکەرانی ئێرانییەوە "دانیشتبوون - کە هیچ کامێک لەم "بەرهەڵستکەرانە" گوللەیەکیان لێنەدرا، ئا ئەم "کیهان"ە چەند وتارێکی بڵاوکردەوە کە هەرکەسێک بیخوێندایەوە هەستی بەوە دەکرد کە ئەم رۆژنامەیە و نووسەرەکانی بە کوشتنی ترسنۆکانەی تیرۆریستانەی بێرۆمەتانەی شەرەفکەندی و هاورێ کوردەکانی زۆر کەیفخۆش بوون. دەبێ ئەمەش بزانین یەکێک لە نووسەرەکانی "کیهان" بە نێوی خواستەمەنیی "کتانە سلطانی" یەوە سالانی ساڵ لەو "کیهان"ەدا وتاری بڵاودەکردەوە کە بە ئاشکرا داوای کوشتن و لەنێو بردنی کوردی دەکرد. ئەوجا نەک هەر لە ئێراندا بەڵکو لە هەموو جێیەک.

## لێرەدا با چەند وێنەیەک وەک نموونە پێشانبدەین:

"وەزیری دادخوازی"ی پێشووی ئێران (لە سەردەمی شای لێخراو دا) محەممەد

باهیری (محمد باهری) لە وتوویژیکدا کە لەگەڵ رۆژنامەی "کیهان" کردبووی، گوتی: "پیاو نابیٚ گلەیی لە پاسدارانی رژیمی ئیسلامی بکات کاتیک گوللەی تفەنگەکەیان دەگرنە سنگی کوردیکی جیاوازیخواز". لەبەر ئەوە گلەیی لە هیندیک فارس کردبوو کە بیزاریی خۆیان بەرامبەر بە کوشتنی دوکتۆر قاسملو و دوکتۆر شەرەفکەندی و سەرۆکە کوردەکانی دیکە دەربریبوو، چۆنکە ئەمانە بە قسەی وی "جیاوازیخوازن" و جیاوازیخوازیش لەلای وی "تاونبار"ە و دەبیٚ وەک "تاوانبار" هەڵسوکەوت بکریٚ لەگەڵی. (کیهان، ١٩٩٣/٦/٣).

## نموونەیەکی دی:

لە ژمارە (٥٤٤)ی رۆژنامەی "کیهان"دا کە لە رۆژی ١٩٩٥/٢/١٦ (بەرامبەر بە ٢٧ی بەهمەنی ١٣٧٣ ی فارسیی شیعەیی) بڕیک لە نامەی کوردیکی بە نیوی سەعیدی کرماشانی (سعید کرمانشاهی) بڵاوکردبووەوە، کرماشانی رەخنەی لەوە گرتبوو کە زمانی فارسی بە "زمانی ناسیۆناڵ"ی ئیران دادەنریٚ و نووسیبووی: "زمانی فارسی زمانی رەسمی ئیرانە نەک زمانی ناسیۆناڵ، چۆنکە لە دەوڵەتیکدا کە خەڵکەکەی بە چەند زمانی جیاواز دەپەیڤن، زمانی ناسیۆناڵ بوونی نییە. دووەم ناسیۆناڵ بە شتیک دەگوتریٚ کە هەموو دانیشتووانی یەک دەوڵەت بە ئارەزووی خۆیان پەسەندیبکەن و بە هەموو دڵ و گیانەوە خۆشیانبویٚ و بە هەموو هیزیکیانەوە لە پیناوی پاراستن و هیشتنەوەیدا تیبکۆشن. لە کاتیکدا ئەگەر ئیوە کەمیک راستیبین (واقعی) بن، هەست بەوە دەکەن کە زمانی فارسی لە نیو گەلانی ئیراندا بەم جۆرە نییە، و لە سەردەمی دەستپیکردنی فەرمانڕەواییی پەهلەوییەوە بەم شیوە کلاسیکەی ئەورۆی بەسەر "گەلانی ئیراندا سەپینراوە". لە وەرامی ئەم قسە راستەدا "خیراندیش" نیونیک کە هەموو ژمارەیەک وتاریک دەنووسیٚ وەک "حکیم حق نظر" کە وەک دەڵین ئەم دوو نیوە نیوی خواستەمەنین و هەر یەک کەسە، هەر لەو ژمارەیەدا و لەو شوینەدا وتاریکی نووسیبوو لەژیر نیوی "مرده باد زبان فارسی" واتە "بمریٚ زمانی فارسی" و ئەم قسە هەقانەی بەوە داناوە کە کورد هەوڵدەدەن بۆ زیندوو کردنەوەی زمانی خۆیان و مراندنی زمانی

فارسی، وەک راگرتن و خزمەتکردنی زمانی کوردی لەلایەن کوردەوە مردنی زمانی فارسی بێ. لەم رووەوە دەبێژێ: "ئەز دیکتاتۆر نیم و باوەڕم بە دیکتاتۆریّتی نییە. بەلاٚم لە کاتێکدا کە دیکتاتۆریّتی بۆ پاراستنی یەکێتیی ناسیۆنال و زمانی ناسیۆنال پێویست بێ، پشتگیریی دیکتاتۆریّتی دەکەم". ئەمەش ئەو دێمۆکراسییەیە کە بەرهەڵستکەرانی ئێران دەیخەنە کار ئەگەر هاتو رۆژێ لە رۆژان جێی مەلاکانیان گرتەوە. (١٥)

ئەوجا بام بێینەوە سەر بەرهەڵستکەرانی رژێمی عێراق و گوێ رابگرین لەو قسانەی کە سید محمد باقر الحکیم؛ نوێنەری ئەوەی نێوی نراوە "ئەنجومەنی بەرزی شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق" (المجلس الاعلی للثورة الاسلامیة في العراق) کە لە مانگی شوباتی ١٩٩٢ دا کردی. الحکیم لە وتووێژێکدا کە لەگەڵ رۆژنامەی "الحیاة" کە لە لەندەن دەردەچێ کردبووی، داوای "یەکێتیی عێراق"ی دەکرد بە "گەڵ و خاک و حکومەت"ەوە (شعبا وترابا وحکومة) وهەر لەوێدا گوتی: "عێراق وڵاتێکی عەرەبیی ئیسلامییە و بەشێکە لە نەتەوەی عەرەبی موسوڵمان" (... بلدا عربیا اسلامیا و جزء من الامة العربیة الاسلامیة) (رۆژنامەی "الحیاة" ٢٥/٢/١٩٩٢). ئەمەش هەر قسەکانی بەعسە بەلاٚم ئیسلامەکەی چووەتە سەر، و خودێ هەڵناگرێ لەم دواییەدا سەددام بۆ خۆڕێکخستن لەگەڵ ئەمانە و رژێمی ئێران، ئەوەتە دەستی هەژار و برسی دەبڕێ ئەگەر بێتو بچن بیر لە دزینی هێلکەیەک بکەنەوە و برسێتی خۆیانی پێ دەربکەن.

شایانی باسە کە ناسیۆنالیستە عەرەبەکانی دژ بە سەددام وەک دار و دەستەی سید الحکیم، دان بە "کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق" (المؤتمر الوطني العراقي)دا نانێن، چونکە دەسەلاٚتی پارتی و یەکێتی تێدایە، و ئەو عەرەبانەش کە لە "المؤتمر الوطني العراقي" دان؛ هەلی ئەم براکوژییەی نێوانی پارتی و یەکێتی بەکار دەهێنن و داوای ئەوە دەکەن کە بەڕێوەبەرێتیی حکوومەتی کوردستان بدرێتە دەستیان، لە کاتێکدا ئەمانە خۆیان لە خوارووی کوردستان (هەرێمی ئاسایش) پەنابەرن و لەنێو عەرەبیشدا هیچ جۆرە بنکەیەکی جەماوەرییان نییە.

ئەوجا عەرەبە ناسیۆنالیستەکانی دژ بە سەددامیش کە لە سوپای عێراقدان، بە ئاشکرا دەریدەبڕن کە بۆیە نایانەوێ دەست لە سەددام بوەشێنن، چونکە لەوە دەترسن کە کورد هەلیان بۆ هەڵ بکەوێ و "ژووررووی عێراق" جیا بکەنەوە و بیکەنە دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

بەکورتی "بەرهەڵستکەرانی ئێرانی" مانی رژێمی مەلاکانیان پێ باشترە لە سەربەستیی کورد و "بەرهەڵستکەرانی عێراق و عەرەب"یش مانی رژێمی سەددامیان لەسەر کار، پێ باشترە لە سەربەستیی کورد.

ئەوجا ئەمانەی باسکران هەموو درۆپێکن لە زەریایەک دوژمنایەتی و شۆڤێنیێتی و کین و رک و بیری تۆتالیێتیرانە و دیکتاتۆرانە و شەڕخوازانەی بەرهەڵستکەرانی عێراق و عەرەب بە گشتی و فارس و ئێران بەگشتی و هەر بەو جۆرەش بەرهەڵستکەرانی حکوومەتی تانسو چیللەر لە دەوڵەتی ترکدا وەک حیزبی ANAP بە سەرۆکایەتیی مەسعوود یلماز و حیزبی رەفاهی ئیسلامیی بە سەرۆکایەتیی ئەربەکان و حیزبی C.H.P بە سەرۆکایەتیی بولەند ئێجەڤیت، هەموو دژی چیللەرن، بەلام لە کێشەی کورددا هەموو پشتگیریی چیللەر دەکەن بۆ پێشێلکردنی مافی کورد (١٦).

هەر لەکاتی پەلاماری لەشکری ترکدا بۆ سەر خوارووی کوردستان لە بەهاری (نەورۆزی) ١٩٩٥دا ، دوو بەرهەڵستکەری حکوومەتی چیللەر، مەسعوود یلمازی سەرۆکی ANAP و بولەند ئێجەڤیتی سەرۆکی CHP ؛ پشتگیریی هەڵوێستی رژێمی چیللەریان کرد لە پەلاماردانی خوارووی کوردستاندا بە نیزیکەی (٤٠٠٠٠) سەرباز کە گەلێک کوردی لە هیچدا نەبوو لە زارۆ و پیر و ژن بوونە قوربانی ئەو پەلامارە.

لە سووریاش دوو حیزب هەن بەرهەڵستی رژێمی بەعسیی سووریا دەکەن، یەکێکیان "برا موسوڵمانەکان" (الاخوان المسلمون) کە حیزبی عەرەبە سوننییەکانی سووریایە، و ئەوی دیکەیان حیزبی کۆمۆنیستی ریازولترک (ریاض الترک) ە کە خۆی ئەمە چەند ساڵێکە لە بەندیخانەی سووریایە،

هەردووکیان دژی کوردن. "برا موسوڵمانەکان" (الاخوان المسلمون) کورد بەوە گوناهبار (متهم) دەکەن کە گوایە "دارو دەستەی حکوومەتی حافیز ئەسەدن". هەموو کەسێکیش دەزانێ کە هەڵوێستی رژێمی ئەسەد بەرامبەر کوردەکەی ژێردەستی خۆی چۆنە. ئەوجا حیزبی ریاض الترک یش کورد بەوە تاوانبار دەکەن کە گوایە هەموو سەر بە خالید بەگداشن. خالید بەگداشیش بەوە گوناهبار دەکەن کە گوایە کوردێکی دژ بە عەرەب و ناسیۆنالیزمی عەرەب و یەکێتیی عەرەبە. ئەمە لە کاتێکدا کە خالید بەگداش لە هیچ سەردەمێکی ژیانیدا هیچ جۆرە کوردایەتییەکی نەکردووە، و کە حیزبەکەشی لە حکوومەتی ئەسەددا هاوبەش بوو هیچ رۆژێک لە رۆژان دژی "پشتێنی عەرەبی" (الحزام العربي) یەک وشەی لە دەم دەرنەهاتووە و داوای هیچ جۆرە مافێکی کوردی نەکردووە.

بەکورتی؛ بزووتنەوەی کوردایەتی ناتوانێ پشت بە هێزی بەرهەڵستکەرانی نێو ئەو دەوڵەتانە ببەستێ کە کوردستانیان داگیر کردووە. سەبارەت بەم راستییە، ریدان بەو هێزە بەرهەڵستکەرانە بۆ هاتنە سەرکار بە تەنێ؛ زیانێکی یەکجار گەورەیە بو کورد. لەبەر ئەوە کورد نابێ "کەرێک بگۆرێتەوە بە کەرێ"، بەڵکو دەبێ رووخاندنی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان کاتێک بێ کە هێزە کوردستانییەکان بتوانن جێیان پربکەنەوە. بەتایبەتی لەم رۆژەدا کە لە گەلێک لایەنی نێوچەیی و جیهانییەوە هەوڵدەدرێ بۆ رووخاندنی رژێمی سەددام (لە عێراق) و رژێمی مەلاکان (لە ئێراندا). پێویستە هەموو کوردێک لە خۆی بپرسێ، و بێژێ: ئەم دوو رژێمە هەردووکیان دوژمنی کورد و دیمۆکراسی و ئازادین، بەڵام پاش ئەوەی ئەو دوانە بە یارمەتیی کورد رووخێنران، کێ دێتە سەر کار؟. ئایا ئەوەی کە وەک ئەو دوو رژێمە و بگرە لەوانیش خراپتر هەڵسوکەوت لەگەڵ کورد دەکات، ئەگەر هاتە سەرکار رژێمێکی دیمۆکراسیی لە عێراق یان لە ئێراندا دادەمەزرێنێ؟ بێگومان نا.... کەواتە بۆچی دەبێ کورد رێ بە چوار پیاو خراپی عەرەب، یان چوار پیاو خراپی ئێرانی بدات، ئەو دوو رژێمە بە پشتگیریی کورد، یان بەبێدەنگیی کورد لەسەر کار لا ببەن و خۆیان بە هاسانی بێنە سەرکار و ژەهری مار بکەن بە گەرووی کورددا؟

## ئێستە با سەرنجێکی کورت لەو هێزە دەرکییانە بدەین کە پێوەندییان بە کێشەی کوردەوە هەیە:

### (١) ئەوروپا

ئەوروپا ئەو وڵاتانەن کە سەتان ساڵ وڵاتەکانی خۆرهەڵاتیان کردووە بە کۆلۆنی خۆیان و شیلەی ژیانی ئابووریی گەلانی خۆرهەڵاتیان دەمژی و یارییان بە چارەنووسیان دەکرد. بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا کە سێ دەوڵەتی کولۆنیالیستی ئەوروپا بوون، پاش جەنگی جیهانیی یەکەم و شکاندنی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی، وڵاتی کوردستانیان پارچە پارچە کرد و دابەشیان کرد بەسەر چەند دەوڵەتێکی داتاشراوی دەسکرددا، و نەتەوەی کوردیان لە مافی بڕیاری چارەنووسی خۆی و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی، بێبەش کرد، و لە ئەنجامی ئەوەدا رۆژی کورد گەیشتە ئەم رۆژە ناخۆشەی ئەورۆ.

ئێمە کە ئەم باسە دەکەین، مەبەستمان لە گێڕانەوەی دیرۆکی خۆمان و باسی ئیمپریالیزم و کولۆنیالیزمی ئەوروپایی، ئەوە نییە بمانەوێ رکی کورد هەستێنین و هانیان بدەین بۆ تۆڵە سەندنەوە. چونکە ئەو ئەوروپاییانەی ئەو رۆژە، ئەوروپایی ئەورۆ نین و لە هەموو گەلێکیشدا باش و خراپ هەیە. بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە ئەو ئەوروپایەی کە ئەورۆ لەنێو خۆدا گەیشتووەتە دامەزراندنی رژێمی دیمۆکراسی و پلوورالیزم ؛ چەندان شەڕی کورت و درێژی لەنێو خۆیدا دیوە، کە جەنگی جیهانیی دووەم تەنێ نموونەیەکە لەوانە.

ئەوروپا لە چەند دەوڵەتێک پێکهاتووە کە لە باری ژیانی ئابووری و چڕیی دانیشتووان و دەسەڵاتی پیشەسازییەوە وەک یەک نین. لە پێش هەرەسهێنانی رژێمی سۆڤێتدا، ئەوروپا دوو لەت بوو. لەتێکی سەر بە بەرەی سۆڤێت بوو، لە باری ئابوورییەوە دواکەوتوو و تا هەندازەی هەژاری. و لە باری ئازادیشەوە رژێمی تۆتالیتێر و گرێدراو بوو بە سۆڤێتەوە. لەتەکەی دیکەش بریتی بوو لە ئەوروپای رۆژاوا، هێندێکیان زۆر بەهێز و دەوڵەمەند وەک ئەڵمانیا و فەرەنسا

و بەریتانیا و هێندێکیشیان نیوە بەهێز وەک ئیتالیا و نەمسا و ولاتانی ئەسکەندینافیا و بەلجیکا، و هێندێکیشیان کەمهێز وەک ئیسپانیا و پرتوگالْ. رووخانی رژێمی سۆڤێت کارێکی وای کرد کە ئەوروپا بەرەو یەکگرتن بچیْ و هەولْ بدا جیاوازیی ئابووریی نێوان دەوڵەتەکانی کەمتر بکاتەوە، کە بێگومان ئەوەش کارێکی یەکجار سەختە و کاتێکی زۆری دەویْ، کە لەوانەشە سەر نەگریْ.

یەکێک لە ئەنجامە گرنگەکانی رووخانی سۆڤێت یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا بوو. ئەڵمانیا بەم یەکگرتنە؛ لە لایەکەوە گەورەتر و بەهێزتر بوو، لە لایەکی دیکەوە تووشی گەلێک کێشە بوو؛ وەک نا یەکسانیی ژیانی ئابووری لە هەردوو لاکەی ئەڵمانیادا و سەختیی نێزیککردنەوەی ئەم دوو گەلە لە یەک کە نێزیکەی پەنجا ساڵێک لە یەک پچڕا بوون و لە ژێر دوو رژێمی بەتەواوی جیاواز لە یەکدا دەژیان.

یەکێک لەو پرنسیپە گرنگانەی کە ژیانی ئەوروپای لەسەر دامەزراوە بازرگانی و چاو چنۆکییە بۆ پارە و دەسکەوتی ماددی. ئەوروپا لە چەند دەوڵەتێکی پیشەسازی و بازرگانی پێکهاتووە کە پێویستییان بە بازاڕ و کڕین و فرۆشتنە. بازاڕیش لە هەلو مەرجی پشێوی و ئاژاوەدا سەر ناگریْ؛ بەتایبەتی چۆنکە سەرمایە پێویستی بە خستنەکارە بۆ گەشەکردن و قازانج هێنان. جا کە سەرمایەدارانی ئەوروپا بیانەویْ لە ولاتێکی دواکەوتوو، یان پێشکەوتوودا سەرمایە بخەنە کار بە نیازی قازانج، بەر لە هەموو شتێک بۆ شوێنێک دەگەڕێن کە شەڕ و هەللاو پەشێوی تێدا نەبیْ. لەبەر ئەوە چاویان لە رژێمێکە کە لە جێی خۆی دامرکابیْ. ئەوجا ئەو رژێمە؛ دیکتاتۆرە، ئاینییە، ناسیۆنالیستە، دیمۆکراتییە، چییە، ئەوە بەلایانەوە گرنگ نییە. هەر لەبەر ئەوەیە کە دەوڵەتەکانی ئەوروپا و هەموو دەوڵەتە گەورەکان زۆرجار پشتی ئەو رژێمانە دەگرن کە ملهوڕ و خوێنڕێژن و بەزۆری زۆردارەکی خۆیان راگرتووە، و گەلێک جاریش چەک و یارمەتیی دیکە بە رژێمە دکتاتۆریەکانی ئەو دەوڵەتانە دەدەن بۆ ئەوەی لەسەر کار بمێنن و بەزۆری تفەنگ ئاسایش رابگرن.

یارمەتیی ئەوروپا و ئەمریکا و سۆڤیێت و ژاپۆن و چین بۆ رژێمەکانی سەددام و شا و خومەینی و ئەسەد و رژێمە تۆرانییەکانی ترک، هەر یەک نموونەن بۆ ئەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە زۆرجار شۆرشی رەوای کورد بۆ ئازادی؛ بە چەک و تفاقی جەنگیی ئەم دەوڵەتە پیشەسازییانە لە خوێن و خوڕدا پێشێلکراوە. بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە دەوڵەتەکانی ئەوروپا هەرچەندە لەنێو خۆیاندا بەتەنگ راگرتنی سیستەمی دیمۆکراسییەوە دێن، بەڵام لە سیاسەتی دەرەوە یاندا ئامادەن لەگەڵ هەموو سیستەمێکی نادیمۆکراسی و تۆتالیتێر و تیرۆریست هاوکاری بکەن هەر بۆ پێشخستنی دەسکەوتی ماددی خۆیان. دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان کە بۆ ئاژاوەی نێو خۆیی و کودەتای سوپایی و شەڕ و بە یەکدادان لە جیهاندا هاوتایان کەمە، زۆرجار لەلای ئەوروپاییەکان؛ کورد بە چەند "هۆزێکی ئاژاوە گێڕ" و شەڕفرۆش و لەنێو خۆدا ناکۆک و "گێرەشێوێن" دەدەنە قەڵەم بۆ ئەوەی دەوڵەتانی ئەوروپا و دەوڵەتە پیشەسازە بەهێزەکانی جیهان والێبکەن کە کورد بە کۆمەڵگەیەکی وا بناسن کە پشتی پێنەبەسترێ و کەس رووی تێنەکات. جا لەم رووەوە هەموو شەڕ و بەیەکدادانێکی نێوخۆیی کورد خزمەتێکی گەورەیە بۆ داگیرکەرانی کوردستان. ئەوروپا کەسێکی ناوێ کە کێشە و گیروگرفتی زۆر بێ و هەژار و بێدەسەلات بێ. دەبێ کورد لە پێوەندییەکانیاندا لەگەڵ ئەوروپا ئەوە بگرنە بەرچاو، کە شتێکیان پێ بێ پێشکێش بە ئەوروپای بکەن تا ببنە هەڤاڵی وتووێژ لە گەڵیان.

## رووسیا :

رووسیا ئەو وڵاتەیە کە یەکەمین بەردی بناخەی زانستی کوردناسی تێدا دانراوە، ئەوەش لە سەتەی هەڤدەیەمدا. دراوسێتیی ئەم وڵاتە لەگەڵ کوردستان، و شەڕ و شۆڕی ئیمپراتۆرێتیی رووسیای قەیسەری لەگەڵ دەوڵەتانی عوسمانی و قاجاری، وای لە رووسیا کردبوو کە سووت لە ژیهاتێتیی سوپاییی کورد وەربگرێ و هێزێکی کوردیی دەستوەشێن دروستبکات بەرامبەر بە هێزی "حەمیدییە" ی عوسمانی (حمیدیە آلایلی) کە

لە سەرەتای ئەم سەتەیەدا لە هۆز و سەرەک هۆزەکانی هێندێک نێوچەی کوردستان پێکهاتبوو. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە پێوەندیی رۆشنبیرانی کورد و سەرۆکەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی بە رووسیاوە لە کۆتاییی سەتەی نۆزدەهەم و لە دەمەدەمی سەتەی رابوردوودا وای لە رووسیای قەیسەری کردبوو کە سیاسەتی نێزیکبوونەوە لە کورد پێڕەوی بکات و بیر لەوەش بکاتەوە کە ئایە دامەزراندنی دەوڵەتێک بۆ کورد دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی مەترسیی عوسمانی و گەلە ترکە موسڵمانەکانی قەفقاسی ژێردەستەی رووسیا یان نا!. ئەم رێبازە لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەمدا لەلای قەیسەری رووسیاوە بەرەو پێش دەچوو، بەڵام هێشتا بڕیاری تەواوەتی لەسەر نەدرابوو کە شۆرشی کۆمۆنیستانەی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ رووی دا. هاتنە سەرکاری رژێمی کۆمۆنیستی لە رووسیا و دامەزراندنی سۆڤێتستان ئەم نەخشەیەی بەجارێک پووچکردەوە.

دەوڵەتی سۆڤێت کە نێزیکەی ٧٠ ساڵێک ژیا، سیاسەتێکی نادۆستانە و تەنانەت دوژمنانەشی بەرامبەر بە کورد گرتبووە بەر. ئەم سیاسەتە نادۆستانەیە هەر لە "کۆنگرەی گەلانی خۆرهەلاّت"ەوە دەستیپێکرد کە لە ١-٨/٩/١٩٢٠ لە شاری باکۆ بەسترا و هەشت کوردیش بەشدارییان تێدا کرد. کۆنگرە هەرچەندە بۆ ئەوە بەسترا بوو کە باسی چارەنووسی گەلانی ژێردەستەی خۆرهەلاّت بکات، ئەمەش کاتێک بوو کە دەوڵەتی عوسمانی رووخابوو، وَ پەیمانی سێڤریش لەو رۆژەدا لە کایەدا بوو بۆ دەستنیشانکردنی دوارۆژی کورد، بەڵام "کۆنگرە" بە یەک وشە باسی کوردی نەکرد. بە پێچەوانەی ئەمەوە کۆنگرە پشتگیریی خۆی بۆ ئەتاترک و "حکوومەتی ئەنقەرە" دەربڕی کە ئەو دەمە هێشتا هیچ دەوڵەتێک دانیپێدا نەنابوو. لە ١٩٢١/٣/١٦ یشدا یەکێتیی سۆڤێت بە سەرۆکایەتیی لینین پەیمانێکی "هاوڕێیەتی" لەگەڵ "حکوومەتی ئەنقەرە" بەست.

جا هەرچەندە لە سەردەمی لینیندا کۆمارێکی ئۆتۆنۆمیدار "لەنێوچەی لاچین و قوبادلی و کەلبەژار و .... و هێندێ شوێنی دیکەی کوردنشیندا بەنێوی

"کوردستانی سۆر"ەوە دامەزرا، بەڵام هەر پاش نەمانی لینین و هاتنە سەرکاری ستالین و دارو دەستەکەی، ئازەرییە خۆ بە ترک زانە مێشک تۆرانییەکان چاویان بڕییە خاکی کورد و ستالینیان لە کورد هاندا، بەنێوی ئەوەوە کە گوایە کورد دژی کۆمۆنیزم و یەکێتیی سۆڤێتن و "کرێگرتە"ی بەرەی خۆراوان. ستالین وەک سەرکردەیەکی فاشیست و تیرۆریست کۆچی بە کوردەکان کرد بۆ کازاخستان و سیبریا. ئەوجا ئازەرییەکان توانیان نێوچەی کوردەکان لرف بدەن و بە هەموو جۆرێک بکەونە تواندنەوەی کورد، و لەم کاتە بە دواوە لە ئازربایجان زمانی کوردی رێبەند کرا. لە چلەکاندا و لە کاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا جارێکی دی کورد لە لایەن ستالین و ئازەرییەکانەوە کۆچپێدران و ئەوجا کوردەکانی "کوردستانی سۆر" بوونە ئاردی نێو درکی چەند کۆمارێکی سۆڤێتی و لە هەموو لایەک تووشی بندەستی و بێبەشی بوون. تەنێ لە کۆماری رووسیا و کۆماری ئەرمەنستاندا توانیان تا هەندازەیەک خزمەتی زمان و کولتووری خۆیان بکەن. هێندەی ئەمە پێوەندیی بە ئەرمەنستانەوە هەیە، ئەوا ئەم رێدانە بە خزمەتکردنی زمانی کوردی سیاسەتێکی ئەو دەمەی کاربەدەستانی ئەرمەنی بوو، نەک هی دەوڵەت و رژێمی سۆڤێت. ئەمەش راستینەکە کە لەم سالانەی دواییدا پێیگیشتووم..

شایانی باسە ستالین و ئازەرییە تۆرانییەکان هەر لە تەفروتوونا کردنی "کوردستانی سۆر"دا چالاک نەبوون، بەڵکو لە هەوڵدانیشدا بۆ دەستبڕینی کورد لەکاتی دامەزراندنی کۆماری کوردستان بە سەرۆکایەتیی پێشەوا قازی محەممەد لە دەمە دەمی کۆتاییی جەنگی جیهانیی دووەمدا چالاک بوون. ئازەرییەکان نەیاندەویست کە کورد کۆمارێک بۆ خۆیان دابمەزرێنن؛ بەڵکو دەیانویست ببنە پارچەیەک لە کۆماری ئازربایجان، بۆ ئەوەی ئەو پارچە کوردستانەش وەک "کوردستانی سۆر" لرف بدەن. بەڵام پێشەوا قازی محەممەد ئەم پیلانە گلاوەی پووچکردەوە. ئەوجا کە کۆماری کوردستان دامەزرا، ئەوەبوو ستالین لە پشت سەری کوردەوە لەگەڵ رژێمی شای ئێران رێککەوت کە لەشکرەکەی لە کوردستان بکشێنێتەوە بەرامبەر وەرگرتنی مافی گەڕان بە دوای نەوتدا لە ژووروی ئێران. کشاندنەوەی لەشکری سۆڤێت بوو بە هۆی رووخانی

کۆماری کوردستان، چونکە کۆماری کوردستان سوپایەکی پڕ چەکی نەبوو. ئەوجا پێشەوا و چەند سەرکردەیەکی دیکەی کورد لە سێدارە دران.

پاش تۆپینی ستالین، سیاسەتی سۆڤێت بەرامبەر بە کورد نەهاتە گۆڕان. لە سەردەمی خرۆشێڤ دا هێندێک لە کوردە کۆچپێکراوەکانی "کوردستانی سۆر" گەڕانەوە شوێنی خۆیان، بەڵام ئازەرییەکان ڕێیان نەدان حکوومەتەکەی خۆیان دابمەزرێننەوە. لەم کاتەدا سەرۆک مستەفا بارزانی کە ئەو دەمە لە سۆڤێت پەنابەر بوو، و لە سەردەمی ستالیندا خرابووە زیندان، بەرەڵلا کرا. لەگەڵ ئەوەشدا کورد هەر بە زۆرلێکراوی مانەوە، چونکە سیاسەتی سۆڤێت لەسەردەمی خرۆشێڤ و پاش خرۆشێڤ، هەتا هەرەسهێنانی سۆڤێت روویکردە دۆستایەتیی سیاسی و بازرگانیکردن لەگەڵ هەموو ئەو دەوڵەتە دیکتاتۆرییانەی کوردستانیان داگیر کردووە، بە تایبەتی عێراق و سووریا و فرۆشتنی چەکی قورس و قرکەر بە ڕژێمە خوێنڕێژەکانیان. ڕژێمی سۆڤێت سەرچاوەی چەک و تفاقی جەنگی هەردوو ڕژێمی بەعسیی عێراق و سووریا بوو، هەر لە ١٩٧٠وە تا ڕمان و گۆڕەگۆڕ بوونی. شایانی باسە کە لە دەمە دەمی گیانەلای ڕژێمی سۆڤێتدا باسی ئەو گەلانە دەکرا کە لە سەردەمی ستالیندا کۆچپێدرابوون و پەرتەوازە کرابوون و لەنێو ئەوانەشدا گەلی کورد. ئا لەو ڕۆژانەدا جارێکیان خانم دانیال میتران ژنی سەرکۆماری فەرەنسا فرانسوا میتران لە گۆرباچۆڤی پرسیبوو "ئایە کوردە کۆچپێدراوەکان دەتوانن بگەڕێنەوە کوردستانی سۆر و لەوێ کۆمارێک بۆ خۆیان پێکەوە بنێن"؟ گۆرباچۆڤ لە وەرامدا گوتبووی : "کوردستانی سۆر" لە کوێیە؟. ئەمە نموونەیەکە بۆ ناسینی گۆرباچۆڤ ، و پێموایە پێویست بە هیچ جۆرە لێدوانێک ناکات.

پاش ئەوەی ڕووسیا بوو بە کۆمارێکی سەربەخۆ و یەڵتسین بوو بە سەرۆک وەزیران و توانی بەرامبەر گەلێک شەپۆلی کورسیبزوێن و ئاژاوە خۆی ڕابگرێ، ڕووسیا هەروەک زلهێزێک لە جیهاندا مایەوە، ئەگەرچی نەک بە ڕادەی ئەمریکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو لایەک حسێبی زلهێزێکی بۆ دەکرێ. بەڵام ڕووسیا گەلێک کێشەی ئابووری هەیە بۆ وێنە : بێکاری و برسێتی لە

سنوور بەدەرن، دزی و جەردەیی و پیاو کوشتن و چالاکیی مافیایی هەر باس ناکرێ. بێجگە لەوەش چەچانستان داوای جیابوونەوە دەکات لە کۆماری رووسیا. گوناهی بەشێکی ئەو کێشانە کە رووسیا بەدەستیانەوە دەناڵێنێ دەکەوێتە ئەستۆی جیهانی خۆراوا و بەتایبەتی ئەورووپا و بەتایبەتتر ئەڵمانیا. چۆنکە رووسیا پاش هەرسهێنانی کۆمۆنیزم زۆر دۆستانە لە جیهانی رۆژاوا هاتە پێشەوە و ئەڵمانیای رۆژهەلاتی دایە دەست کاربەدەستانی ئەڵمانیای رۆژاوا، و ئەورووپای رۆژهەلاتیشی بەرەڵلا کرد کە ببێتە هاوپەیمانی ئەورووپای رۆژاوا. بەلام جیهانی رۆژاوا بەتایبەتی ئەڵمانیا هەڵوێستەکانی بەرامبەر رووسیا راستبێژانە و بە ویژدانانە نەبوو، بەڵکو زۆربەی زۆری بەڵێنەکانی درۆ و دەلەسە و گوتەی پووچ بوون. ئێستەش ئەوەتە ئەمریکا رێ نادا بە رووسیا چەکی نیوکاکلی بە ئێران بفرۆشێ، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەمریکا خۆی تا ئێستە چەک و کەرەسەی جەنگی بە ئێران فرۆشتووە و مەسەلەی ئێران - گێت یەکێکە لەو بەزمانە. ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەمریکا چەک و کەلو پەلی جەنگی بە گەلێک رژێمی شەڕخوازی وەک سەددام و جونتای ترکیا فرۆشتووە و دەفرۆشێ. بەلام ئەمە بۆ رووسیا بە ڕەوا نازانێ. لەبەر ئەوە رووسیا هەستی خۆشبینی بەرامبەر جیهانی رۆژاوا و ئەو دەوڵەتانەش نییە کە سەر بە جیهانی رۆژاوان کە دیارە دەوڵەتی ترکیش دەگرێتەوە. بۆیە دوور نییە کە رووسیا لە ژێر کارکرد (تأثیر) ی ئەم بارە و گوشاری ئەو هێزە ناسیۆنالیست و کۆمۆنیستانەدا کە رۆژ بە رۆژ لە رووسیا دەسەلاتیان فراوانتر دەبێ، سیاسەتێکی ناسیۆنالی سەربەخۆی خۆی بگرێ، لە جۆری سیاسەتی سەردەمی قەیسەر و دووریش نییە خۆی بکاتە هەڤاڵبەندی عێراق و ئێران، کە ئەمەش مەترسییەکی زۆری تێدایە بۆ گەلانی خۆرهەلاتی نێوەڕاست، بە تایبەتی گەلی کورد و ئاشتیی جیهان بەگشتی. لە هەمووش مەترسی تر ئەوەیە کە زانست و تەکنیکی رووسیا یارمەتیی عێراق و ئێران بدەن بۆ وەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی و پێشبردنی زانستی بەرهەمهێنانی چەکی کۆمکوژ وەک چەکی میکرۆبی و کیمیایی کە تا ئێستا چەند جارێک دژی خەڵکی کوردستان بەکار هێنراون.

لێرەدا پێویستە بگوترێ کە کوردەکانی کۆمارەکانی پێشووی یەکێتیی سۆڤێت لەپاش هەرەسهێنانی یەکێتیی سۆڤێت کەوتنە جموجۆڵ و کۆمەڵەیەکیان پێکهێنا کە مەڵبەندەکەی لە مۆسکۆیە.

لەسەرەتای نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٩٤ دا کۆنفرانسێکی گەورە بۆ لێکۆڵینەوەی دۆزی کوردستان بە دەستپێشکەریی پ ک ک لە مەڵبەندی کولتووریی کورد لە مۆسکۆدا گیرا. رژێمی ترک لەم هەڵوێستەی رووسیا زۆر بەگومانە و چەند جار پێوەندیی لەگەڵ کاربەدەستانی رووسیا گرتووە بۆ بەستنی ئەو "چالاکی یە کوردانە" یەی کە رژێمی ترکیا بە چالاکیی تیرۆریستانەی پ ک کێی دەداتە قەڵەم. دەبێ ئەوەش بزانین کە پ ک ک لە مۆسکۆ نوێنەری هەیە. ماهیر وەلات Maher Welat نوێنەری ERNK یە لە رووسیا. رووسیا لەوە دەترسێ کە دەوڵەتی ترک خۆی بکا بە دەمڕاستی ئەو کۆمارە ترکزمانانەی کە پاش هەرەسی سۆڤێت دروست بوون وەک ئازربایجان و ترکمانستان و .. هتد. سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی ترک تانسو چیللەر بە ئاشکرا هەوڵی یەکێتیی "دەوڵەتە ترکزمانەکان" دەدا بە "سەرۆکایەتیی ترکیا". دەوڵەتی ترک تا ساڵی ١٩٩٥ نیزیکەی ٥,٦ ملیارد مارکی ئەڵمانی بەخت کردووە لە قازاخستان و قرخیزستان و ترکمانستان و ئۆزبەکستاندا.

بەمەی پێشوودا دەردەکەوێ بۆمان کە دەوڵەتی رووس چە لەسەردەمی قەیسەردا و چ لە سەردەمی سۆڤێتیدا و چ لە سەردەمی رووسیای فیدەراڵی ئێستەدا؛ هیچ چاکەیەکی بەسەر کوردەوە نییە بەڵکو هەمیشە هەوڵیداوە کورد دابدۆشێ بۆ بەرژەوەندیی خۆی. لەبەر ئەمە کورد دەبێ لە هەڵسوکەوتیاندا لەگەڵ دەوڵەتی رووسیا زۆر هۆشیارانە بجووڵێنەوە.

## ئیسرائیل:

دامەزراندنی دەوڵەتێک بۆ جووان بەنێوی "ئیسرائیل" ەوە لە ساڵی ١٩٤٨ دا، لە ئەنجامی راستەوخۆی بەڵێنی "بەلفوور" و کەینوبەینی "دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی رۆژاوا"؛ یان "بەرەی سەرمایەدارانی رۆژاوا" ەوە نەبوو؛

وەک عەرەبە ناسیۆنالیستەکان و کۆمۆنیستەکان و کوردە خۆ بە چەپیزانەکان دەیانگوت و ئێستەش زۆربەیان هەر دەیڵێن و دەیڵێنەوە، بەڵکو پێوەندیی مێژوویی مووساییەکان بە "خاکی پیرۆز" واتە "ئۆرشەلیم" یان "قودس" ەوە، و هەروەها پلەی پێشکەوتنی شارستانێتیی مووساییەکان لەچاو گەلانی عەرەب و موسوڵماندا و دەسەلاتی رۆشنبیرانیان بەسەر کۆمەڵگەی ئەوروپایی و ئەمریکاوە، دەوری سەرەکی لەم کارەدا گێڕا. واتە مووساییەکان خۆیان دەوڵەتیان بۆ خۆیان دروستکرد، نەک "ئیمپریالیستە خوێنمژەکانی ئەوروپا". کەس دەوڵەت بۆ کەس دروست ناکا. هەر ئەو ئەوروپاییانە بوون کە بە ملوێن جوویان بە گاز خنکاند. خۆ ئەگەر مووساییەکان خۆیان هیچ نەبوونایە، ئەوا بەڵێنی "بەلفوور"یش مینا بەڵێنەکەی پەیمانی "سێڤر" کە بە کورد درا، وەک تری بن گۆمی لێدەهات. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە تەنگە تیلکەییی عەرب و خۆ گێڤکردنەوە و فیشاڵکردنیان بە قڕکردنی جوولەکە و هەڕەشە کردنیان بەوەی فڕێیان دەدەنە نێو زەریاوە، دەورێکی گەورەی گێڕا لە سەختگیریی مووساییەکاندا. خۆ ئەگەر عەرەبەکان هەر لە سەرەتاوە بە گیانێکی رۆشنبیرانەی تێگەیشتووانەوە بکەوتنایە کار، ئەوا ئیسرائیل هەر لە یەکەم رۆژەوە لە سنوورێکی تەنگ و خاکێکی گچکەدا و لە تەنیشت دەوڵەتێکی فەلەستینیی عەرەبەوە و لە نێو زەریایەک عەرەبدا وەک دوورگەیەک دروست دەبوو. ئەوساش شەڕی ١٩٤٨ و ١٩٥٦ و ١٩٦٧ و ١٩٧٣ هەڵنەدەگیرسان و ئیسرائیلیش ئەو وڵاتە فراوانەی داگیر نەدەکرد و ئەوڕۆش عەرەبەکان پاش نیو سەتەیەک ماڵوێرانی و دوای ئەو هەموو هەڕەشەو گوڕەشە و هاشو هووش و خۆ بە زلگرتن و قسە پف هەڵدراوانە و کوشتن و لەسێدارەدانی خەڵکی بێگوناە بە تۆمەتی "سیخوڕیی بۆ ئیسرائیل" و کودەتای سوپایی و دیکتاتۆرێتیی بەنێوی خۆ ئامادە کردنەوە بۆ "رزگارکردن"ی فەلەستین، ناچار نەدەبوون بچنە سلاوی ئیسرائیل کە تا دوێنێ بوو بە "ئیسرائیلی بێژی" (اسرائیل اللقیطة) و "زیۆنیستی تاوانبار" (الصهاینة المجرمون) و چی و چی. نێویان دەبردن.

ئەمەیان وا، و ئەوجا دەبێ بزانین کە سیاسەتکارانی کورد، کە هەموو چاویان لە بیری مارکسێتیی سۆڤێتانە دەکرد، هەر بە وێنەی ناسیۆنالیست و

کۆمۆنیستە عەرەبەکان بۆ دۆزی فەلەستین دەچوون و بگرە توندتر و خەستتریش لەوان. ئەوەی راستی بێ؛ یەکێتیی سۆڤیێت وەک دەوڵەتەکانی بەرەی خۆراوا لەساڵی ١٩٤٨دا، واتە لەسەردەمی ستالیندا دەنگی بۆ دابەشکردنی فەلەستین لە نێوان عەرەب و جوولەکەدا دابوو، بۆیە کۆمۆنیستە عەرەبەکان لە سەرەتاوە بە پێرەویکردنی سیاسەتی سۆڤیێت پشتگیریی دابەشکردنی فەلەستین و لایەنگیریی "برایەتی عەرەب و جوولەکە" یان دەکرد، بەڵام دوایی بە ناچاری و لە ترسی تێرۆری ناسیۆنالیزمی عەرەب؛ بایان دایەوە، و لەگەڵ گۆڕانی سیاسەتی سۆڤیێت بەرامبەر بە ئیسرائیل لە پەنجاکاندا و بەتایبەتی لە سەردەمی خرۆشیڤدا کە سۆڤیێت هەڵوێستێکی دژ بە ئیسرائیلی گرتبوو، کۆمۆنیستە عەرەبەکان (بەتایبەتی لە عێراق و سووریا وکوردە مارکسییەکانی ژێردەستەی ئەم دوو وڵاتەشیان لەگەڵ) کەوتنە جنێو دان بە ئیسرائیل و پەلاماردانی بە قسە. دیارە ئەو کوردانەی هەڵوێستێکی نەیارێتییان بەرامبەر بە ئیسرائیل هەبوو، هێندێکیان لەرووی ترسەوە بوو، هێندێکیشیان لە هەلپەرستییەوە، یان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی خۆیان، یان لە گەوجی و نەزانییەوە بوو. ئەمە کارێکی وای کرد کە بزووتنەوەی کوردایەتی نەتوانێ هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ ئیسرائیلدا هەبێ. ئەوجا ئەگەر ئێمە ئەو ماوە کورتەی لێدەربکەین کە خودێلێخۆش بوو سەرۆک مەلا مستەفای بارزانی لەرێی عیسمەت شەریف وانلی و سامی عەبدولرحمانەوە پێوەندییەکی بێحسێبی لەگەڵ ئیسرائیل هەبوو، ئەوا هیچ جۆرە پێوەندییەکی دیکە نەبوو، تەنانەت ئەم پێوەندییەش هیچ بەرهەمێکی نەبوو. چۆنکە نە ئەو کوردانەی سەر بە بارزانی بوون و دەستیان لەم کارەدا بوو، مرۆڤی سیاسەتکار بوون و نە ئەو کوردانەی لە ریزەکانی بارزانی جیا بووبوونەوە و بەربەرەکانییان دەکرد، رێیان دا ئەم پێوەندییە پەرە بسێنێ و رێکو پێک بکرێ. پاش هەرەسی بەهاری ١٩٧٥ و هەتا ئەم دواییەش باسکردنی ئیسرائیل شتێکی بڤە و تابوو tabu بوو.

دیارە ئیسرائیل لە سیاسەت و پێوەندییەکانیدا بە خەڵکی ئەم جیهانەوە، بە دوای دەسکەوت و بەرژەوەندیی خۆیدا دەگەڕێ. بەڵام کێ هەیە وا نەکات ،

مەگەر کورد، لەگەڵ ئەمەشدا لەوانە بوو ئیسرائیل لە دەیەکانی رابوردوودا پێوەندییەکی توند و تۆڵ بە بزووتنەوەی کوردایەتییەوە ببەستێ ئەگەر بهاتایە و بیزانیایە کە بزووتنەوەیەکی کوردایەتیی یەکگرتووی وا لە کایەدایە پشتی پێببەستری. چۆنکە ئەگەر پێوەندییەکی وا لەسەر بنچینەیەکی پتەو ببوایە، دووز نەبوو زۆر سووتی بە بزووتنەوەی کوردایەتی بگەیاندایە، چ لە باری سوپایی و چ لەباری دیپلۆماسییەوە. من پتر لە سی ساڵێک لەمەو بەر ئەم قسانەم دا بە بای گوێی سەرکردە کوردەکانی ئەو سەردەمەدا، بەلاّم هەر ئەوەندەی مابوو بمکەن بە کێو دا. راستییەکەی ئەز دەمزانی سیاسەتی دەوڵەتان و گەلانی عەرەب (و کوردە کۆمۆنیست و مارکسیستەکانیشیان لەگەڵ) بەرامبەر ئیسرائیل و جوولەکە سیاسەتێکی شۆڤێنیستانەی چەوت و چەوێڵە و خزمەتی دۆزی فەلەستین و گەلی فەلەستین ناکا، و دەشمزانی کە سەرکردە عەرەبە شۆڤێنیستەکان رۆژێ لە رۆژان ناچار دەبن بچنە سلاّوی ئیسرائیل، لەبەر ئەوە نەمدەویست گەلی کورد، بە کەرێتی و شۆڤێنێتی ئەوان زیان بهێنێ، بۆیە لە سەمینارێکدا کە لە ١٩٨٥/٥/١١ دا لە شاری ستۆکهۆڵم بەسترابوو بۆم بە ئاشکرا گوتم: "هاکا عەرەبەکان لەگەڵ ئیسرائیل رێککەوتن" (جەمال نەبەز: دۆزی ناسیۆنالی کورد - ئۆتۆنۆمی، یان کوردستانێکی سەربەخۆ، یان بڕیاری چارەنووس لە ئازادیدا و بۆ ئازادی" سوێد ٢٦٨٥ ک / ١٩٨٥ ز، ل ٣٧).

بەکورتی نیو سەتەیەک ماوە هەبوو بۆ کورد ئاوڕێک لە ئیسرائیل بدەنەوە و سووتێک لە شەڕی نێوان شۆڤێنیزمی عەرەب و ئیسرائیل وەربگرن، بەلاّم ئەوا ئەو هەلە لە دەستچوو. چۆنکە ئێستە ئیسرائیل دەیەوێ تا پێیدەکرێ خۆی لەگەڵ عەرەبەکان رێکبخا و چارێک بۆ کێشەی فەلەستین بدۆزێتەوە و لەم مەیدانەشدا کەمێک هاتووەتە پێشەوە. ئیسرائیل ئێستە لەگەڵ میسر و ئەردەن و مەغریب پێوەندیی دیپلۆماسی هەیە و لەگەڵ سووریاش وتووێژی هەیە. بێجگە لەوەش لەگەڵ PLO بە سەرۆکایەتیی یاسر عەرەفات پەیمانی بەستووە بۆ دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی لە هێندێک نێوچەی فەلەستیندا. لە هەمان کاتدا ئیسرائیل دەیەوێ پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی ترک باش بکات، چ لە

باری سوپایی و چ لە باری ئابوورییەوە، گوایە بەنێوی "بەربەرەکانیی تێرۆریزم" ەوە، کە دیارە "تێرۆریست" بەلای ئیسرائیلەوە ئەو عەرەبە فەلەستینییە ناسیۆنالیستە سەختگیرانەن (وەک "بەرەی گەلێر" (الجبهة الشعبية) و "کۆڕی شۆرشگێڕ (المجلس الثوري)ی ئەبوو نیزال (ابو نضال) هەروەها موسڵمانە بنچینەگرەکانی وەک کۆمەڵەی "حەماس" (حماس) و "جیهادی ئیسلامی" (الجهاد الاسلامي) و..هتد. "تێرۆریست"یش بە لای ترکەوە PKK و هەموو کوردێکە کە داوای مافی کورد بکات، یان هەر کەسێکی دیکە کە کورد نەبێ، بەڵام لەسەر مافی کورد بەدەنگ بێ وەک ترکی رۆشنبیر و ئاشتیخواز کە دژی کورد کوشتنن. بەڵام نە دەوڵەتی ترک دەتوانێ بەرەیەکی نوێ بۆ شەڕ دژی عەرەبە ناسیۆنالیست و موسڵمانە بنچینە گرەکانی عەرەب بکاتەوە لەبەر خاتری ئیسرائیل ، و نە ئیسرائیلیش دەتوانێ بەرەیەکی نوێ دژی کورد ، بەتایبەتی پێ کێ کێ بکاتەوە لەبەر خاتری ترک. لام وایە ئیسرائیل هێندە نەزان نەبێ کە بە خوتو خۆڕایی نەتەوەی کورد بکاتە دوژمنی خۆی، یان بچێ پەلاماری پێ کێ کێ بدات و ناچاری بکات تۆڵە بستێنێتەوە لێی . بەڵام رەنگە لە سنووری هەواڵگوزاری و جاسووسێتیدا پشتی دەوڵەتی ترک بگرێ، کە دیارە ئەمەش دژی بەرژەوەندیی کوردە و کوردیش دەبێ و مافی خۆیەتی کە لەم رووەوە زۆر وریا بێ (١٧).

بەکورتی دوور نییە ئیسرائیل ئەورۆ خۆی لە بارێکی وادا ببینێ کە پێی وابێ هێندەی جاران کاری بە کورد نەبێ. بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە چارەسەرکردنی یەکجارەکیی کێشەی فەلەستین هەروا بە هاسانی و بەم زووانە لە دەسەڵاتی ئیسرائیلدا نییە. چۆنکە نە ئیسرائیل دەتوانێ واز لەو هەموو خاکە بهێنێ کە فەلەستینییەکان و سووریا و عەرەبەکان بەگشتی داوای دەکەن و نە فەلەستینی و سووری و عەرەبەکان بەگشتی بە شتێکی کەم لە ئیسرائیل خۆش دەبن. ئەمە بێجگە لە دوژمنایەتیی مێژوویی عەرەب و جوولەکە و بەربەرەکانیی موسوڵمانە بنچینەگرەکان لە هەموو لایەکی جیهاندا و یارمەتیدانیان لەلایەن کاربەدەستانی ئێران و سۆدان و ئەفغانستانەوە.

## ئەمریکا:

ئەمریکا ولاٚتێکی گەورەی ۹.۲۰۰ ملیۆنییە. لەباری ئابوورییەوە پیشەسازییەکی یەکجار گەشە کردوو، و کشتوکاڵێکی فراوان و هەموو جۆرە و ، لەباری رامیاریشەوە رژێمێکی دیمۆکراتیی پەرلەمانییە. ئەمریکا تا ماوەیەک لەمەو بەر یەکێک بوو لە دوو زلهێزەکەی ئەم جیهانە. بەلاٚم پاش هەرەسهێنانی یەکێتیی سۆڤێت، ئەمریکا بوو بە زلهێزی یەکەم لە جیهاندا. ئەمریکا چ لەباری سیاسی و چ لە باری ئابووری و چ لەباری ستراتیژیی سوپاییەوە بەرژەوەندییەکی ژیاری هەیە لە گەلێک شوێنی ئەم جیهانەدا کە یەکێک لەوانە نێوچەی خۆرهەلاٚتی نێوەڕاستە، کە کوردستانیش دەگرێتەوە. تێکەڵبوونی ئەمریکا لەگەڵ سیاسەتی خۆرهەلاٚتی نێوەڕاست لە ماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا دەستیپێکرد، کاتێک ئەمریکا هەوڵی دا خۆی لە دەوڵەتی ترک و ئێران نێزیک بکاتەوە بۆ بنکە دانان لەو ولاٚتانە بە مەبەستی بەربەرەکانیی دەسەلاٚتی رژێمی کۆمۆنیستی سۆڤێت. لەکاتی کشانی "لەشکری سۆر" بەسەر ئازربایجانی ئێران و رۆژهەلاٚتی کوردستاندا کە بوو بەهۆی دامەزراندنی کۆماری کوردستان و کۆماری ئازربایجان، ئەمریکا لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا، یارمەتیی ئێرانیان دا بۆ دەرکردنی لەشکری سۆڤێت لە ئێران، کە ئەنجامەکەی بە رووخانی کۆماری کوردستان تەواو بوو. لەپاش جەنگی جیهانیی دووەمەوە ئەمریکا توانی لە ئێراندا دەسەلاٚتێکی زۆر پەیدا بکا و زۆر یارمەتیی رژێمی حەمە رەزا شای ئێرانی دا بۆ پاراستنی تەختەکەی و تەنانەت کودەتای جەنەراڵ زاهیدی دژی حکومەتی دوکتۆر موسەدیق بە پشتی دەزگەی نهێنی ئەمریکا (سیا) سەرکەوت، کە لە ئەنجامدا شای راکردوو توانی بگەرێتەوە ئێران. پاش ئەوەش ئەمریکا بە چەک و تەکنەلۆژی و هەواڵگوزاری یارمەتیی رژێمی شای دا و لە بەهاری ساڵی ۱۹۷۵ دا کاتێک شای ئێران لە جەزائیر لەگەڵ سەددام حسەین رێککەوت و پەیمانی جەزائیری دژی کورد و شۆرشی ئەیلول بەست، ئەمریکا پشتیکردە کورد، هەرچەندە لەوەو پێش بەڵێنی بە سەرکردەکانی شۆرش دابوو کە یارمەتیی کورد بدا، بەلاٚم لە کۆتایی هەفتاکاندا و پاش ئەوەی شای ئێران ویستی خۆی بکاتە هێزی

پێنجەم لە جیهاندا و ببێتە سەرکردەی نێوچەی کەنداو، ئەمریکا پشتی شای بەرەڵلاْ کرد، و پاش ئەوەی کە شا ئێرانی بە جێهێشت و خومەینی سەرکەوت؛ تەنانەت ڤیزەیەکی نەدەدا بە شا کە بچێ بۆ ئەمریکا چاری نەخۆشییەکەی بکا.

هەرچەندە ئەمریکا لە سەرەتاوە زۆر پشیپشی بۆ رژێمی خومەینی کرد، بەلاْم رژێمی خومەینی زۆر دوژمنانە لەگەڵ ئەمریکا هەڵسو کەوتی کرد. و تاقمێ خوێندکار کە بە خۆیان دەگوت "خوێندکارانی هێڵی ئیمام" پەلاماری سەفارەتخانەی ئەمریکایان دا لە تاران و کاربەدەستانی سەفارەتخانەیان ٤٤٤ رۆژ وەک دیل گرت. کاتێک هێزێکی ئەمریکایی ویستی ئەم دیلانە بەرەڵلاْ بکا فرۆکەکەیان لە تەبەس کەوتە خوارەوە و هەر کەسێکی تێدا بوو مرد. خومەینی تا مابوو ئەمریکای نێو نابوو "شەیتانی گەورە". پاش مردنی خومەینیش سەید عەلی خامەنەیی جێنشینی خومەینی، ئەویش وەک خومەینی دوژمنایەتیی ئەمریکا دەکا. ئەمریکاش رژێمی ئێران بە دوژمنی هەرە گەورەی خۆی دەزانێ. لە مانگی شوباتی ئەمساڵە (١٩٩٥)دا سەرۆکی کۆنگرەی ئەمریکا لە وتارێکدا کە بۆ ئەفسەرەکانی هەواڵگوزاری و پاراستنی ئەمریکا لە واشەنتن دای ، بنچینەگریی ئیسلامی وەک "مەترسییەکی گەورە" دانا بۆ کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتان و گوتی دەوڵەتی ئەمریکا دەبێ تێبکۆشێ بۆ لە بنجهەڵکەندنی کۆماری ئیسلامیی (ئێران). ئەمە لە کاتێکدا کە ئێرانییە کۆچکردوەکان بۆ ئەمریکا (فارس و ئازەری) لە هەرە دەوڵەمەندترین کەسانی ئەمریکا دەژمێردرێن. پتر لە ... ٥ مامۆستای زانستگەکانی ئەمریکا ئێرانین (کیهان - چاپ لندن ش ٥٤٥ ، ١٩٩٥/٢/٢٣ ص ٧).

سەرەڕای ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا بەرامبەر ئێران و ئێران بەرامبەر ئەمریکا، ئەمریکا هیچ یارمەتی بە گەلی کوردی ژێردەستەی رژێمی ئێران نادا بو خۆ رزگار کردن لە چنگی ئەو رژێمەی کە ئەمریکا بە رژێمێکی "تیرۆرپستی" دادەنێ.

دەبێ ئەوەش بێژین کە پاش دامەزراندنی "هەرێمی ئاسایش" و "نێوچەی

نەفرین" ئەمریکا یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کە ئەو نیوچەیە لە هێرشی سەددام دەپارێزێ، بەلاّم لە کوشتن و بڕین و دەربەدەر کردنی کوردی کەرکووک و مووسڵ و دیالە و بە عەرەب کردنی ئەو نیوچانە لە لایەن سەددامەوە بێدەنگە.

ئەمریکا پشتی دەوڵەتی ترک دەگرێ، هەرچەندە دەزانێ کە دەوڵەتی ترک دەوڵەتێکی میلیتاریستی رەگەز پەرستی دوژمن بە کوردە و بە هەموو جۆرێ یارمەتیی دەوڵەتی ترک دەدا کە ببێتە ئەندامی یەکێتی ئەورووپا و بە پارە و تەکنۆلۆژی بەهێزی دەکا. بەر لەوەی سەددام پەلاماری کوێت بدا ئەمریکا زۆر یارمەتیی سەددامی دا دژی ئێران.

## چی بکرێ باشە:

بە بیروڕای من پێویستە کورد و بزووتنەوەی رزگاریخوازەکەی لەباری ئێستەدا بە پێی پرۆگرامێکی تایبەتی و دەرزکراو بکەوێتە کار و لەم کاتەدا ئەم خالاّنەی خوارەوە بگرێتە بەرچاو:

١- کورد پێویستە ستراتیژ و تاکتیکی خۆی هەبێ و هیچ کاتێک ستراتیژی خۆی کە ئازادی و یەکسانیی کوردە بە پێی گۆڕانی بارودۆخی نیوچەکە و جیهان نەگۆڕێ، بەلاّم تاکتیکی خۆی لەگەڵ ئەو گۆڕانانەدا بگونجێنێ کە روو دەدەن، بێ ئەوەی دووریی تاکتیک لە ستراتیژەوە هیچ دەستکارییەکی بنچینەیی بەسەردا بێ.

٢- لە سنووری بەپەند کردن و ریسوا کردنی ئاژاوەی حیزب حیزبێنە و شەڕە گەڕەکی سیاسی و براکوژیدا (کە خۆ کوژییە) پێویستە هەوڵ بدرێ جۆرە هاو ئاهەنگییەک لە سنووری ستراتیژیی هاوبەشدا لەنێو حیزبەکانی کوردستاندا چێ بکرێ و ئەو هێزە سوپاییانەی کە حیزبەکان هەیانە رێکوپێک و دەسکەنە بکرێ و لە شێوەی سوپایەکی کوردستانیی مۆدێرندا بپارێزرێ.

٣- پێویستە لە سنوورێکی ئینتەرناسیۆنالدا ببرێتە مێشکی دەسەلاّتدارانی

ئەم جیهانەوە کە تاکە جێگر (ئالتەرناتیڤ) ێک بۆ ئەم رژێمە دیکتاتۆر و تیرۆرپەرست و تۆتالیتێرانەی رۆژهەلاتی نێوەڕاست (بە تایبەتی ئەو ٦ ولاتەی کوردستانیان داگیرکردووە) دەسەلاتێکی کوردیی ئازادیخوازانەی دێمۆکراتی پلوورالیستانەیە کە ئاشتی و پێکەوە ژیانی بە هێمنی و ئاسایش لە نێوچەکەدا مسۆگەر بکات. ئەگەنا هەر هێزێکی دیکە، بێجگە لە کورد، هەر بەو رێیەدا دەڕوا کە ئەم رژێمانەی ئێستە پێیدا رۆیشتوون و دەڕۆن.

٤- پێویستە ئەو پێوەندییەی لە نێوان هێندێک دەولەت و کورددا دروست بووە لە رێی کۆمەلی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو هێزانەوە کە "هەرێمی ئاسایش" لە کوردستاندا دەپارێزن، بکرێتە پێوەندییەکی درێژخایەن بۆ بەرژەوەندیی کورد و ئەو لایەنانە. لەبەر ئەوە پێشەمیدان بە چالاکیی دیپلۆماسیی سەرومڕی رۆشنبیرانە لە هەموو جیهاندا، بە تایبەتی لە ئەمریکا و ئەوروپا و رووسیا و ئوسترالیا و ئیسرائیل یەکجار پێویستە، بێ ئەوەی ولاتەکانی دیکە بخرێنە پشتگوێ.

# پەراوێزەکان

(١)- وشەی "وار" کە بەمانای "جێ" و "شوێنی لێدانیشتن" و "نیشتمان" دێ، لە وشەی "هەوار"ەوە هاتووە، وشەی "هەوار" بەشی دووەمی "کوم هەوار"ە؛ واتە "هەوار" یان "هەوارگەی کۆمەڵگە" کە بووەتە "کۆمار" و ئەورۆ بەمانای "جمهورية" بەکاردێ. وشەی "جمهور"ی عەرەبی و فارسی و ترکی لە "کۆم هەوار"ەوە هاتووە، کۆم هەوار >کۆمهوار>گومهور>جمهور. چونکە دەنگی "گ" لە زمانی عەرەبیدا نییە. دەنگی "ک" و "گ" زۆرجار لە کوردیدا لە جیاتی یەک بەکاردێن. سەرنجی وشەی "سک" و "زگ" بدە، هەروەها وشەی "باوکم" لە زاراوەی سۆرانی و "باوگم" لە زاراوەی فەیلیدا. هەر لەسەر ئەم دەستوورە"بزرگمهر"ی فارسی لە عەرەبیدابووە بە"بزرجمهر".

(٢)- بەپێی ئەم بەڵگەنامە مێژووییە ئەو کەنداوەی کە فارسەکان پێی دەبێژن "کەنداوی فارسی" و عەرەبەکان پێیێ دەبێژن "کەنداوی عەرەبی"، کەنداوی کوردیشە.

(٣)- وشەی "مداین" (مادایین) کە عەرەبەکان بەکاریان هێناوە لە گەڵی وشەی "مدینة" (شار)ەوە نەهاتووە. وشەی "مادایین" (لەسەر کێشی وشەی "زەراین")، کە گوندێکە لە ستانی سلێمانی.. برگەی یەکەمی کە "ماد"ە ئاماژە بۆ بنەچەو رەچەڵەکی وشەکە دەکا.

(٤)- ئەمانە وشەی عەرەبی و ترکی و فارسین، یەکەمیان بەمانای "سوارە" و دووەمیان بەمانای "پارێزەر" و سێیەمیان بەمانای "پاسەوان" دێ بۆ شاردنەوەی مەبەستی راستینەی بوونی ئەم دەستانە وەک بەکرێگیراوی داگیرکەران.

(٥)- وشەی "جاش" لە زمانی کوردیدا هەر بە مانای بێچووی کەر بەکار ناهێنرێ، بەڵکو جاش بەمانای "دەستی دووەم" و "ساختە" و "ناڕاست" و "ناڕەسەن"یش بەکاردێ، وەک "جاش پۆلیس" واتە کابرایەک پۆلیسێتی دەکا بەڵام پۆلیسی راستینە نییە، "جاش کەوش" واتە "کەوشە و لەپێ دەکرێ" بەڵام "کەوشی راستینە" نییە.

(٦)- ئەم پێنج دەوڵەتە، بویتین لە: دەوڵەتی ترک و عێراق و سووریا و ئێران و ئازربایجان (کەپاش هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرێتیی سۆڤێت دروست بوو). جا لەبەر ئەوەی پاش شەڕی ئەرمەن و ئازەری، بەشێکی کوردستانی سۆر کەوتە دەست ئەرمەنەکان و بەشێکی دیکەی هەر بەدەست ئازەرییەکانەوە ماوەتەوە، ئەوا کوردستانی ئەورۆ بەسەر شەش دەوڵەتدا دابەشکراوە.

(٧)- مافی بڕیاری چارەنووس لە ئازادیدا و بۆ ئازادی لە سەمیناری "دۆزی ناسیۆنالی کورد، ئۆتۆنۆمی یان کوردستانێکی سەربەخۆ، یان بڕیاری چارەنووس لە ئازادیدا

بۆ ئازادی" بە رۆنی شیکراوەتەوە، کە لە رۆژی ١٩٨٥/٥/١١دا لە ستۆکهۆلم (سوید) پیشکیشم کردووە.

(٨)- دەنگی (پ p) و (ف f) لە زمانە ئیرانییەکاندا جێی یەک دەگرن. شایانی باسە دەنگی (پ p) لە دەنگی (ف f) کۆنترە. ئەم کۆنیتییە لە زمانی کوردیدا باش پاریزراوە، بەلام لە زمانی فارسیدا کەمتر پاریزراوە، بۆ وینە: پیرۆزە (کوردی) / فیروزە (فارسی)، پەرپووت (کوردی) / فرتوت (فارسی)، سپی (کوردی) / سفید (فارسی). وشەی "فەیلی" هیچ پیوەندییەکی بە وشەی "فیل"ەوە نییە وەک هیندیک کەس دەبیژن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە دەبینن کە فەیلییەکان هەموو وەک فیل بەهیزن.

(٩)- لە نیوچەی خۆراسان هەریمیکی گەورە هەیە بەنیوی "کوردستانی خۆراسانی" (سەرنجی وتاری مینۆرسکی بدە لەبارەی "کورد"ەوە لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا چاپی یەکەم) یەکیک لە رۆشنبیرە بەتەنگەوە هاتووەکانی ئەوی، کە نیوی کەلیموللای تەوحودی (کلیم الله توحدی)یە لەپاش دامەزراندنی کۆماری ئیسلامیی ئیران؛ چەند بەرگیک لیکۆلینەوەی لەبارەی میژوو و رەوشتوخوو و فەرهەنگی ئەو کوردانەوە بلاوکردەوە، کە بوو بەهۆی گرتن و ئازاردانی زۆری لەلایەن رژیمی ئاخوندەکانی ئیرانەوە. نووسەرە ئاوارەکانی ئیران لە ئەورووپا و ئەمریکا کە بۆ گرتنی هەر یەکیک لە خۆیان هەرایان دەگاتە ئاسمان، کەچی بۆ گرتنی تەوەحودی، یەک وشەیان لەدەم نەهاتە دەرەوە. شایانی باسە کە کوردەکانی خۆراسان هەر ئەوانە نین کە لە سەردەمی سەفەوییەکاندا کۆچپیدراون بۆ ئەوی، بەلکو کوردی نیشتەجیی ئەوینشن. بیجگە لەوەش کوردیکی یەکجار زۆر هەن لە دەورووبەری زەریای خەزەر، چونکە لە ئیرانی کۆندا کورد لە هەموو لایەکی ئیراندا ژیاون، نەک هەر لە کوردستان. ئەوی کتیبە کۆنەکانی عەرەب بخوینیتەوە دەزانی کە لە نیوچەی شیرازدا گەلیک هۆزی کورد ژیاون.

(١٠)- هاوبیری جوانەمەرگ رەهبەر مامەش لەو جڤینەدا قسەکانی خۆی کرد و بە خەستی باسی ئامانجەکانی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانی کرد، بەلام بەداخەوە لەبەر هەول و تەقەلای نامەردانەی کوردی هەلپەرست و کوری رۆژ بۆ سەرنەگرتنی کۆنگرەکە، کۆنگرە لە فیللەندا نەبەسترا، بەلکو لە پاریس لە ١٨ تا ١٩٩٦/٩/١٩ بەسترا. لە پاریسیش دوو دەستە زۆر بەتوندی دژی بەستنی کۆنگرە وەستان. دەستەی یەکەم داروودەستەی پی کی کی کە پییان ناخۆش بوو باسی کۆنگرەی نیشتمانی و نەتەوەیی بکری، تەنیا رژیمی سووریا دلی بیەشی لییان. یەشار کایای سەر بە پی کی کی داوای هەلوەشاندنەوەی کۆنگرەی دەکرد، بەنیوی ئەوەوە کە کۆنگرە بەهۆی کابرایەکی سیخوری فەرەنسا (ئەمە قسەی یەشار

کایایە) وەک کەندال نەزان لە پاریس دەبەستری، بۆیە کاربەدەستانی فەرەنسا سالۆنێکیان لە مەڵبەندی پەرلەمانی فەرەنسا داوە بە کۆنگرە. کەندال نەزانیش چوو بووە لای کاربەدەستانی فەرەنسا و فەرمووبووی ئەم کۆنگرەیە لەلایەن پێ کێ کێ وە ڕێکخراوە، لە ئەنجامی ئەوەوە حکوومەتی فەرەنسا سالۆنەکەی لە کۆنگرە سەندەوە. بەڵام هاوبیرانی کۆنگرە توانیان لە جێیەکی دیکە کۆنگرەکە ببەستن و رووی نامەرد رەش و هەزاران چرا لەسەر گۆڕی هاوبیر رەهبەر مامەش کە لە رۆژی ١٩٩٨/٤/٦دا کۆچیدوایی کرد.

(١١)- هەوڵ و تەقەلای ئەمریکا لەگەڵ پارتی و یەکێتی بۆ ئاشتبوونەوە درێژەی کێشا، هەتا لە مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٩٨دا بەسەرپەرشتیی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا مادلین ئۆلبرایت "پەیمانی واشەنتن" لەنێوان بەڕێزان مەسعوود بارزانی و جەلال تالەبانی ئیمزا کرا، بەڵام تا ئەورۆ کە ئەم پەراوێزە دەنووسم (ئۆکتۆبەری ٢٠٠١) هێشتا بە تەواوی نەخراوەتە کار.

(١٢)- لایەکی ئەم گۆڕانە "زاگۆنی رزگارکردنی عێراق"، (قانون تحرير العراق) بوو کە لەلایەن کۆنگرەی ئەمریکاوە ئیمزا کرا.

(١٣)- بنەماڵەی حەکیم و ئاسەفی و شاهروودی، هەموویان بە بنەچەوڕەچەڵەک ئێرانین؛ بەڵام لە عێراق لەدایکبوون. ئەمانە بوونە سەرکردەی "المجلس الاعلى للثورة الاسلامية في العراق" کە رژێمی ئێران لە تاران دایمەزراند.

(١٤)- بەبۆنەی ئەو دوژمنایەتییەوە کە لە سەرەتای هەشتاکاندا لەنێوان ئەمریکا و رژێمی خومەینیدا دروستبوو، ئەمریکا رووی خۆشی کردە "مجاهدين خلق"، بەڵام لەبەر ئەوەی "مجاهدين خلق" بوو بە دەسکەلای دەستی سەددام و کاری تیرۆریستانەی زۆر نواند، دەوڵەتی ئەمریکا و دوای ئەویش دەوڵەتی بەریتانیا "مجاهدين خلق"یان بە ڕێکخراوێکی تیرۆریستی دایە قەڵەم.

(١٥)- وشەکانی کرماشانی بە فارسی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

"نمی دانم شما از کدام پایگاه فکری-اجتماعی برخاسته اید که این چنین برای تمام اقلیت های قومی ایران تعیین تکلیف می کنید وانچه را به عنوان یک فارس وظیفه خودتان است بر آن ها هم واجب می دانید... نکته مهمی که قبل از هر چیز باید یاد آور حضور مبارکتان شوم این است که زبان فارسی زبان رسمی ایران است نه زبان ملی. زیرا اولا درکشور یکه مردمانش به چندین زبان مختلف صحبت می کنند، اصلا زبان ملی وجود ندارد. دوم این که صفات ملی را انسان به چیزی می دهد که تمام ساکنان یک کشور و با رضایت آن را قبول کنند، با تمام

وجودشان به آن عشق بورزند و با همه توان برای حفظ و نگهداری آن بکوشند درحالی که اگر کمی واقع بین باشید به این مسئله پی خواهید برد که زبان فارسی در بین اقوام ایرانی چنین وضعیتی ندارد واز زمان شروع سلطنت پهلوی به صورت کلاسیک امروزین بر دیگر اقوام ایران تحمیل شده است".

وەرامی "خیراندیش" بە فارسی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

"من دیکتاتور نیستم و به دیکتاتوری عقیده ندارم ولی دیکتاتوری را در آنجا که برای حفظ وحدت ملی و زبان ملی ضرورت داشته باشد تأیید می کنم".

ئەوە گوایە نە دیکتاتۆرە و نە باوەڕی بە دیکتاتۆرێتی هەیە، بەڵام بەدەمی خۆی پشتگیریی دیکتاتۆرێتی دەکا بۆ ئەوەی کورد زمانی خۆی بەرەسمی بەکار نەهێنێ.

(١٦)- چەند ساڵێک دوای ئەوەی ئەم سەمینارە پێشکێش کرا، ئەربەکان بوو بە سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی ترک بە هەڵبژاردنی پەرلەمان، بەڵام سەرکردەیەتیی سوپای ترک ئەربەکانی ناچار کرد دەست لە سەرۆک وەزیرانی هەڵبگرێ و بەشێوەیەکی ناڕەوا و نادێمۆکراتی؛ کەچی لەگەڵ ئەم هەموو ریسواییەشدا کە لە ڕژێمی ترک بەسەری هاتبوو، کاتێک لە هەولێر ئاڵای کوردستان بۆ ماوەیەک هەڵکرا، ئەربەکان لە پێش سیاسەتکارەکانی دیکەی ترکدا دژی ئاڵای کوردستان قسەی کرد و رک و کینی خۆی بەرامبەر بە کورد و ئاڵاکەی پێشان دا.

(١٧)- وەک لە دواییدا دەرکەوت ڕژێمی ئیسرائیل یارمەتی ڕژێمی ترکی دا بۆ فڕاندنی سەرکردەی PKK عەبدوللا ئۆجەلان لە پاییزی ١٩٩٨ دا. کە دەستەیەک کورد لە بەرلین لەبەردەم سەفارەتی ئیسرائیلدا خۆپێشاندانیان سازکرد، کاربەدەستانی سەفارەتخانە لە پشتەوە دەستڕێژیان لە خۆپێشاندەرەکان کرد و چوار کوردیان کوشت کە یەکێکیان کچ بوو. ئەمە لەکاتی سەرۆک وەزیرانیی نەتەن یاهوودا بوو. حکوومەتی ئەڵمانیا هیچ جۆرە هەڵوێستێکی وەرنەگرت بەرامبەر بەم تاوانەی ئیسرائیل و، کورد کوژەکان بێ ئەوەی سزا بدرێن گەڕانەوە ئیسرائیل.

جەمال نەبەز

# کورد و شۆڕش

وتارێکی سەمینارییە کە بۆ یەکەمجار

لە لەندەن لە ڕۆژی ٢٤/١/١٩٩٨دا بە بانگێشتی

کۆمەڵەی ڕۆژاوای کوردستان پێشکێش کراوە

# لــه جــیــاتی سەرەتــا

**خوێنەرەوەی بەڕێز!**

ئەو بابەتانەی لەم بەرگــەدا جــێگەیان کــراوەتەوە، بریتــین لە چەند سەمینارێك، لەو ریزە سەمینارانەی کە لە کات و شوێنی جیاوازدا و، بە بۆنەی جیــاوازەوە، چ لە ئەڵمانیــا و چ لــە شــوێنەکــانــی دیکەی ئەورووپا پێشکێش بە کۆمــەڵگەی کــوردی ئەورووپا کــراون و زۆربەشــیــان لە ســەر کاسێتی ڤیدیۆ و دەنگ وەرگر تۆمار کراون.

هاوبیــری هێژا و خــۆشــەویست، بەڕێز سیــروان کــاووسی، ئەندامی کۆنگرەی نیــشــتــمانیی کــوردســتــان کە بە نوێنــەرێتی پارتی ســەربەخۆیی کوردستان لە چوارەمین کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستاندا (کە لە لەندەن لە ١٠ ــ ١١/ ١٠/ ١٩٩٨ بەســترا) چالاکــانە بەشــداری کــرد و، لە **«ســەمــیــناری «بارودۆخی ئێــســتــەی نەتەوەی کــورد و پێــشــبــینی یەکی دوارۆژی»** دا ئامــادە بوو، پێــشنیــازی چاپکردنی سەمــینارەکــان و ئەو وتارانەی کــرد کە هێــشــتــا لە شێوەی پەرتۆکدا بڵاو نەکــراونەتەوە و، لە هەمان کاتدا جوامێرانە دەستەبەر بوو بەوەی ئەرکی گرانی خستنە سەر دیسکێتیــان بــکێشێ، کــە لەم دەرفــەتەدا پڕبەدڵ ســوپاسی هەستی بەرز و هەڵوێستی دڵسۆزانەی دەکەم.

جا ئەگەر ئەم کۆمەڵە سەمینار و کۆڕە زانستی یانە بتوانن سووتێك بە کۆمەڵگەی کورد بگەیەنن، خۆم بە بەختیار دەزانم.

بەرلــین ١٩٩٨/١٢/٢٤
جــەمــال نــەبــەز

# کورد و شۆڕش

**تێبینی: ئەم سەمینارە بۆ یەکەمجار لە ۱۹۹۸/۱/۲٤دا لە لەندەن بەبانگهێشتنی کۆمەڵەی رۆژاوای کوردستان پێشکێش کرا و کاسێتێکی ڤیدیۆیی لێ هەڵگیرا. بەڵام کاسێتەکە هێشتا لەنێو کامێراکەدا بوو لەماڵی بەڕێز شێرکۆ زینەلۆش لە لەندەن، کە شەوێکیان دز دایپوری بەسەر ماڵەکەی دا و کامێرا و کاسێتی پێکەوە دزی بوو. دوواپی هەر ئەم سەمینارە لە نورنبێرگ و لە شاری گۆتینگن (ئەڵمانیا) و بەرلینیش دووپاتکراوەتەوە. کاسێتێکی ئەم سەمینارەی نورینبێرگ هەیە بەڵام ناتەواوە. کاسێتەکەی لەندەن بیروبۆچوونی مامۆستایان ئەحمەد هەردی و خوالێخۆشبوو برایم ئەحمەد و حەمە رەسووڵ هاواری لە سەر بوو کە لەو سەمینارەدا ئامادە بوون.**

**گوێگرانی بەڕێزا**

لە کاتی دڵەوە خۆشهاتن لە هەمووتان دەکەم و، سوپاسێکی گەرمیش بۆ بەشداریتان بەم ژمارە زۆرەوە لەم سەمینارەدا.

**بەرێزینە**

وەك دەزانن بابەتی سەمیناری ئەورۆمان "**کورد و شۆرش**"ە. جا بۆ ئەوەی پێوەندیی کورد بە شۆرشەوە بە شێوەیەکی زانستانە بخەینە بەرچاو، پێویستمان بەوە هەیە بزانین شۆرش چی یە، واتە سنوور و چوارچێوەیەك بۆ **تێگە** (مفهوم)ی شۆرش دەستنیشان بکەین. بەڵام با جارێ وەك سەرەتایەکی باسەکە وشەی شۆرش لەباری زمانەوانی یەوە شی بکەینەوە.

وشەی "**شۆرش**" چاوگی کاری تێنەپەر "شۆران" و کاری تێپەر "**شۆراندن**"ە. "**شۆر**" لە زمانی کوردی دا بەمانای تیژ (تێژ) و برێو دێ. (سەرنج: وشەی برێوم لە سەرکێشی بزێو داتاشیوە. بزێو بە کەسێك دەبێژن کە زۆر بیزوێ و برێویش شتێکە کە زۆر تیژ بێ و باش ببرێ). کورد دەبێژن "**سیلاحشۆر**" واتە "چەك تیژ" کە هێندێ کەس بە هەڵە بە "سیلاحشۆر" دەری دەبرن. "**شۆر**" لە زمانی کوردی دا بە مانای "**سوێر**"یش بەکار دێ. بۆ وێنە دەبێژێت: چێشتی بامێکە شۆر بوو، واتا سوێر (سۆر) بوو. وشەی "شۆرباو"ی کوردی کە لە عەرەبی دا بووە بە شوربا و لە

فارسی دا شوربا و لە ترکی دا **چوربا Çorba**، مانای "شۆر بە ئاو"ە، واتە ئاوێك کە خوێ ی تێدایە، کە دیارە ئاو لە زمانی کوردی دا هەر ئاوی خواردنەوە نی یە؛ بەڵکوو بە شلایی (سوائل **Fluids** و**Liquids** ) بە گشتی؛ دەبێژن ئاو. وەك ئاوی میوە، ئاوی سەوزە، ئاوی گۆشت (گۆشتاو)، ئاوی گیانەوەر و... هتد.

ئەوجا کاری **"شۆراندن"** لە زمانی کوردی دا بە گەلێك مانا دێ، لەوانە؛ **تیژ کردن و هاندان و راپەڕاندن و گاڵدان و خرۆشاندن و خستنە سەر پلوپا و جموجۆڵ و ئاڵۆش پێ پەیدا کردن و هورووژاندن.** هەر لە زمانی کوردی دا شەڕ و شۆڕ هەیە کە هێندێك بە هەڵە دەبێژن شەڕ و شۆڕ. شۆر لێرەدا راپەڕینە. لە زمانی کوردی دا وشەی **"شۆرە"** هەیە کە "شۆرە" نێوە و لە "شۆر"ە وەرگیراوە. وەك چۆن وشەی **"بۆرە"** لە "بۆر"ەوە وەرگیراوە. **"شۆرە"بە مانای دژخی هورووژاندن و توند و تیژی و تووڕەیی و تەقینەوە و جموجوڵ و هەڵچوون بەکار دێ.** ئەوەش دەبێ بزانین کە "شۆرە" مەنی **(مادە)**یە کە لە زەوی دەردەهێنرێ بەزمانی ئینگلیزی **Saltpetre** و بە زمانی ئەڵمانی **Salzpeter**ی پێ دەبێژن و بە زمانی زانست **"نەتراتی سۆدیۆم"**ە. ئەم شۆرە یە لە کوردستان لە سەردەمی کۆندا بۆ دروست کردنی باروت بەکار دەهێنرا. ئەوجا ئەم وشەی **"شۆرە"**یە هەر بەو مانایە و بەو شێوەیە بەڵآم بە **"و"**ی تەنگ " **Û** "واتە **"شوُرە"** چووەتە زمانی عەرەبی یەوە. هەروەها وشەی **"شۆرە"** لە شێوەی **"سەورە"** (سۆرە)دا هاتووەتە زمانی عەرەبی یەوە و بووەبە **"ثورة "** کە واتە رەگی وشەی **"ثورة "**ی عەرەبی وشەی **"شۆرە"** و **"شۆرش"**ی کوردی یە. شایانی باسە کە جێگۆڕکێی دەنگی **(ش Ş ) بە (س S)** وەك چۆن لە زمانی کوردی دا باوە، لە زمانی عەرەبیشدا باوە. بۆ وێنە لە زمانی کوردی دا؛ وشەی **"شیلە"** کە لە بنەڕەتدا **"شیرە"**یە، بووە بە **"سیلە"** (سەرنجی وشەی **"بەرسیلە"** واتە **ترێ ی نەگەیو** بدەن کە **"بەرشیلە"** یە، واتە **"ترێ"** بەرلەوەی شیلە (شیرە)ی تێ بیەڕێ). هەروەها سەرنجی وشەی **"شەوتاندن"** لە کوردی باکوور و **"سووتاندن"** لە کوردی ناڤیندا بدەن کە یەك مانایان هەیە. ئەوەش دەبێ بێژین کە وشەی **"سوُر"**ی عەرەبی لە بنەڕەتدا **"شوورە"**یە. **"سوُر"** لە **"سنوور"**ەوە وەرگیراوە کە بە مانای مەرز **(حدود)**ە **(بەراوردی بکەن لە گەڵ وشەی Ceinture ی فەرەنسی** کە مانای **"پشتێن"**ە). نموونەی دیکە بۆ ئەم جێگۆڕکێی دەنگی **"س" و "ش"** زۆرن. یەکێك لەوانە وشەی **"شەروال"**ی

کوردی یە کە زمانی عەرەبی لە کوردی یەوە وەری گرتووە و کردوویەتی بە **"سروال"** و، وشەی **"باپشتیان"**ی کوردی لە عەرەبی دا بووە بە **"بافستیان"**. هەروەها وشەی **"خەمشە"** کە لە **زمانی ئارامی کۆندا** بە مانای **"پێنج"** دێ، لە زمانی عەرەبی دا وەك **"خەمسە" (خمسة)** دەردەکەوێ. وشەی **"شەما"** کە لە زمانی عیبری دا بە مانای **"ئاسمان"** دێ؛ لە زمانی عەرەبی دا بە شێوەی **"سماء" ( سەما ء)**دەردەکەوێ. ئەوەی باسکردنی لێرەدا پێویستە ئەوەیە وشەی **"سماء" و "شما" لە بنەڕەتدا لە وشەی کوردی ی ئێرانی "ئاسمان"ەوە وەرگیراون**. بناوانی وشەی **"ئاسمان"** وشەی **"ئاسۆ"** و **"مان"**ە واتە **"ئاسۆمان"**. **"ئاسۆ"** مانای **"افق"ە** و **Horizont** و **"مان"**یش لە زمانی کوردی دا بە مانای **"جێ"یە**، وەك چۆن **"دارەمان"** (کە شوێنێکە لە نێزیك کەرکووکەوە) لە **"دار"** و **"مان"ەوە هاتووە**؛ واتە جێی دار و درەخت". **"هەورامان"** کە بە بۆچوونی من لە بنەڕەتدا **"ئاهورامان"**ە، مانای جێ ی **"ئاهورا"**یە؛ کە **"ئاهورا"**یش **خودێ ی زەردەشتی یەکانە**. با ئەوەش لێرەدا بێژم کە وشەی "**سەما**" **واتە دیلان، هەڵپەڕین، داوەت کردن** بە شێوەیەکی تایبەتی، لە وشەی **"ئاسمان"**ەوە وەرگیراوە، **واتە هەڵپەڕین و هەڵقونانەوە بەرەو ئاسمان. "سەما"** لە **"سۆمبا"**ی خۆشکی **"رۆمبا"**وە نەهاتووە.

با بگەڕێینەوە سەر وشەی **"شەما"**ی عیبری. ئەم وشەیە **لە تەورات دا** هەیە؛ **تەورات** لە بارەی هاتنە بوونی جیهانەوە دەبێژێ: **«برێشیت بەرا ئێلۆهیم ئێت هەشەمایم و ئێت هائارێتز»**. واتە: **"لەسەرەتاوە خودێ ئاسمانەکان و زەوی هێنایە بوون"** کە بیکەیتە عەرەبی دەبێتە: **"بالرأس (واتە: في البدء خلق الاله السماوات و الارض)**. وەك دەبینین زمانی **عیبری** و زمانی **عەرەبی** دەستە خۆشکی یەکن. لێرەدا سەرنجی وشەی **"رێش ...... ی عیبری و "راس"ی عەرەبی** بدەن؛ کە لە یەکەمدا هەمان وشە دەنگی (ش Ş)ی تێدایە و، لە دووەمدا دەنگی (سS)ی تێدایە. زۆر رێی تێ دەچێ کە هەر دوو وشەکە؛ **عیبری و عەرەبی**، **"مێتاتێزی"**ی یەك بن؛ واتە **عیبری و عەرەبی** کە هەردووکیان بە مانای **"بیابانی"** دێن، بەهۆی جێگۆڕکێی دەنگەکانیانەوە بووبنە دوو وشە. ئەم جێگۆڕکێی دەنگە لە کوردیشدا باوە. سەرنجی وشەی **دەروێش و دەورێش، تیپ و پیت، کن و نك، زیخ و خیز... هتد بدەن.**

راستی یەکەی ناتوانم بێژم سەردەمی وەرگرتنی وشەی **"ئاسمان"**ی کوردی لە

لایەن زمانی **عیبری** (واتە ئارامی کۆنەوە) و بوونی بە "**شەما**" لە کەینێ وەیە. دوور نی یە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی یەکجار کۆن؛ کاتێك کە جووەکان دەربەدەر کران بۆ **وڵاتی میدیای جاران (کوردستانی ئەوڕۆ)**. ئەوەتە **تەورات** چیرۆکی سەردەمی **مادەکان** دەگێڕێتەوە و **زۆر پەسنی میواندارێتی و دۆستایەتی و ڕەوشتبەرزی و لەسەر کردنەوەی لێقەوماوان و ڕێزگرتنی پەیمان و هەڵسوکەوتی بازێرڤانانە (مدنی)ی مادەکان دەدا.**

ئەوجا با بێینەوە سەر وشەی "**ثورة**" و "**سَورة**" لە زمانی عەرەبی دا. بەڕاستی زۆر هەوڵم دا بزانم کەینێ ئەم دوو وشەیە لە کوردي یەوە پەڕیونەتە **نێو** زمانی عەرەبی؛ بۆم دەرنەکەوت. شایانی باسە؛ وشەی "**ثورة**" و "سورة" نە لە **قورئان و نە لە حەدیسی پەیامبەر (د) و نە لە وێژەی عەرەبی پێش ئیسلامدا** بەرچاو دەکەوێ. دوور ني یە لە سەردەمی **ئەمەوی یەکان** دا یان **عەباسی یەکان دا** بووبێ، کاتێك شۆرش و بەرخۆدانی کورد بەرامبەر بە داگیرکەرانی عەرەب پەرەی سەند و کورد بە زنجیرەیەك بەرخۆدان و ڕاپەڕین و بزووتنەوەی چەکدارانە کەوتە بەربەرەکانیی فەرمانڕەوایانی عەرەبە موسڵمانەکان و ، مەزنترینی ئەم بزووتنەوانە کە بێ دوودڵی بتوانرێ نێو بنرێ "**شۆرش**" شۆرشی هەژاران و رووتەی کورد بوو **بە سەرۆکایەتیی فەیلەسووف و پاڵەوانی نەتەوەی کورد پاپەکی خورەمدین** کە دووایی باسی دەکەین.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوە بێژم کە **فارسەکانیش** وشەی "**شۆرش**" (شورش) بەکار دەبەن؛ بەڵام نەك بەو مانایەی کە کورد بەکاری دەبەن. وشەی "**شۆرش**" لە کوردیدا بەرامبەر بە **revolution** ی ئینگلیزی و فەرەنسي و ئەڵمانی یە کە لە بنەڕەتدا وشەی **revolvere** ی لاتینی یە و بە مانای خولدان بۆ دوواوە و پێچدان بۆ پشتەوەیە. بەڵام فارسەکان وشەی "شۆرش"**(شورش)** بۆ ئاژاوە و **پشێوی** و سەرپێچی کردن بەکار دەبەن، کە ئەم وشەیە لە زمانی ئەڵمانی دا:

**Unruhr و Aufruhr و لە زمانی ئینگلیزیدا insurrection و revolution دەگرێتەوە. ئەم وشەیە هێندێك جار لە زمانی ئەڵمانی دا دەبێتە revolte. بۆ وێنە ئەڵمانەکان لە کۆتایی شەستەکاندا بە ڕاپەڕینی خوێندکارەکانیان دەگوت:**

**Studentische revolte** واتە **سەرپێچی و پشێوی خوێندکاران**. فارسەکان

بە "**شۆرش**"ی کوردی دەبێژن "**انقلاب**". کە ئەم وشەیەیان لە زمانی عەرەبی یەوە وەرگرتووە، بەڵام بەو مانایە بەکاری ناهێنن کە زمانی عەرەبی بەکاری دەهێنێ. وشەی "**انقلاب**" لە زمانی عەرەبی دا بە مانای "**هەڵگەڕانەوە**"و "**ژێروژوور**" بوونەوە دێ کە بە زۆری بۆ **کودەتای سوپایی** بەکاردەبرێ، **یان بۆ دۆخێك کە کەسانێك بچن بە زۆر کاربەدەستانی رژێمێك لەسەرکار لابەن و خۆیان بچنە جێ یان، یان خەڵکێکی دیکە بخەنە شوێنیان، بێ ئەوەی دەست بەن بۆ نرخ و نەرێتی سیستەمی لا دراو**. راستی یەکەی وشەی "**انقلاب**" کە لە کار (**فعل**)ی «**قلب**» واتە هەڵگێڕانەوە هاتووە؛ لە بنەڕەتدا عەرەبی نی یە؛ بەڵکو کوردی و فارسی یە. «**قلب**» هەڵگێڕانەوەیە و ئێستەش لە کوردی دا وشەی **قلپکردنەوە و قولپاندن (بە کرمانجی ی باکوور)** بەکار دەبرێ. وشەکە وشەیەکی هێند و ئەورووپایی یە و؛ پێوەندیی بە وشەی **لاتینی ی Collapsus**ەوە هەیە، کە بەمانای **داڕووخان و قلپ بوونەوەیە** و لە ئەڵمانی دا بووە بە **Kollaps** و بە ئەڵمانیی پەتی — **Zusammenbruch** ، واتە **هەرەسهێنان**.

لێرەدا حەز دەکەم بۆ پێکەنین چیرۆکێك بگێڕمەوە. پاش **کودەتای عەبدولکەریم قاسم لە عێراق (١٤/٧/١٩٥٩)** رۆژێکیان لە بەغدا دەمەتەقێ یەك لە نێوان کوردێکی سەر بە پارتی **کۆمۆنیستی عێراق** و کوردێکی سەر بە پارتی **دیمۆکراتی کوردستان** دا دروست بوو. کۆمۆنیستەکە دەستوەشاندنی **سوپای عێراقی** لە بنەماڵەی **شا فەیسەڵ** و گۆڕینی سیستەمی **شایەتی** بە سیستەمی **کۆماری** بە **شۆرش** دادەنا و کوردە سەر بە پارتی یەکەش دەیگوت نە، ئەمە "**ئینقلابە**". کە بە کۆمۆنیستەکەم گوت بۆچی وادەزانیت شۆرشە. گوتی چونکە حکوومەتی نوێ دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکا و بەریتانیایە و دۆستی **یەکێتیی سۆڤێتە** و پێشکەوتنخوازە. گوتم: بۆچی پێشکەوتنخوازی ئەوەیە تۆ دۆستی یەکێتیی سۆڤێت بیت؟، گوتی : "ئا. چونکە ئەگەر تۆ دۆستی سۆڤێت نەبوویت، ئەوا بتەوێ و نەتەوێ ؛ پیاوی ئەمریکایت". ئەوجا بە کوردە پارتی یەکەم گوت؛ ئەی تۆ چۆن ئەم بارەی ئێستە بە "**ئینقلاب**" دەزانیت؟" گوتی: "پاش هەموو ئینقلابێك خەڵك لە سێدارە دەدەن، ملیان دەکەن بە پەتدا کە پەتەکەش قولاپێکی پێوەیە. "ئینقلاب" خۆی لە "قولاپ"ەوە هاتووە. واتە ملی خەڵك دەکەن بە قولاپ دا". لێرەدا واز لە فەرموودەی ئەو دوو

هاوولاتی یە بەرێزە دێنم و، بەر لەوەی درێژە بە باسەکەم بدەم، کەمێك لەسەر وشەی قولاپ دەڕۆم. قولاپ و قولاپە هەردووکیان بە یەك مانا لە زمانی کوردی دا هەن. بۆ وێنە پیرە مێرد دەبێژێ:

گیانە بەسیەتی، گیانە بەسیەتی — توخوا بەسیەتی؛ دەرد و مەینەتی
هەر هێندە دەبێ تووشی و نەگبەتی — قنیاتم تەنیا ژاراوی پەتی
لە نەحسی چارە و بەختی گومڕاهم — عالەم بێزارە لە ناڵە و ئاهم
ئەجەل **قولاپەی** گیر کرد لە جەرگم — نیشانم ئەدا نیشانەی مەرگم
ئەوا هەناسەم کەوتە ژمارە — هێندەی نەماوە؛ وا ئەمرم دیارە

ئەم هۆنراوەیەم وەك پشتیوانەیەك بۆ وشەی **قولاپە** خوێندەوە، ئەگەنا ئەمە لەبەر خاتری هۆنراوەکە نەبوو. هەڵوێستی من بەرامبەر هۆنراوە و هۆنەران نەگۆڕاوە و، رۆژێکیش دێ بکەومە وێزەی ئەم باسە.

**قولاپ** یان **قولاپە** لە زمانی کوردی دا بە پارچە ئاسنێکی **گر (خڕ)** دەبێژن. ئەم وشەیە رەگێکی هێند و ئەورووپایی هەیە و ، تەنانەت لە زمانی **سلاڤی** کۆندا؛ وشەی **کولا** هەیە کە مانای **"خڕ"**ە. لە زمانی کوردیشدا دەبێژن: **قولی مست؛** واتە کە مستت **گرد (خڕ)** دەکەییەوە، هەروەها **"قولە پێ"** هەیە لە کوردی دا واتە شوێنی **خڕی پێ**. هەر لەم وشەی "کولا"یەوە کە وشەیەکی **سلاڤی کۆنە؛** زمانی **چێکی** وشەی **کولیچەی** داتاشیوە کە کەوتووەتە زمانی **ئەڵمانی نەمسایی و، هەر لە وڵاتی چێکەوە خۆی کێشاوە تا کوردستان.**

**هاوولاتانی بەرێز:**

تا ئێرە باسی ئێتمۆلۆژیای وشەی **شۆرش** و خزمەکانی بوو؛ خستمانە ژێر هوردە بینی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی یەوە؛ هیوام وایە کە کورد بتوانن فەرهەنگێکی ئێتمۆلۆژیا بۆ زمانی کوردی چێ بکەن. ئەوەی ئەز لە دەستم هاتبێ لەم بارەیەوە بۆ شیکردنەوەی گەلێك وشە و بردنەوەیان بۆ سەر بنەچە و رەچەڵەکیان؛ درێخم نەکردووە؛ بەڵام نە جێ و رێ ی من و نە تەمەنی من رێ دەدەن بەوەی فەرهەنگێکی ئێتمۆلۆژیای زمانی کوردی بنووسمەوە.

**ئێستە با بزانین شۆرش وەك تێگەیەکی رامیاری و کۆمەڵایەتی چییە!:**

ئێمە کە دێینە سەر وشەی شۆرش یەکەم شت کە سەرنجی مرۆڤ رابکێشێ ئەوەیە

کە **شۆرش بزووتنەوەیەکی بەگرۆپیفە**. بەڵام هەر شۆرش بزووتنەوەیەکی بە گرۆپیف نی یە، هێندێك بزووتنەوەی دیکەش هەن کە، لەم رووەوە لە بابەتی شۆرشن، وەك: **راپەڕین، ئاژاوە، هەستان، رابوون، پشێوی، بەرخۆدان، سەرهەڵدان.** ئەمانە هەموو بزووتنەوەی بەگرۆپیفن. لەبەر ئەوە دەبێ بزانین تایبەتکاری شۆرش چی یە کە ئەمانەی سەرەوە لە شۆرش جیا دەکاتەوە.

**شۆرش بە مانا زانستانەکەی بزووتنەوەیەکە دەبێ بە هۆی گۆڕانێکی بنچینەیی ی ئەو نرخ و نەرێتانەی کە لە کۆمەڵگەدا رەوان و، پڕکردنەوەیان بە نرخ و نەرێتێکی دیی جیاواز لە هی پێشوو. بە مەرجێ شێوەی ئەو گۆڕینە لە دەستوور و زاگۆن (قانون)ی ئەو وڵاتە یان ئەو دەوڵەتەی کە لە بنەوە هەڵدەتەکێنرێ؛ دەستنیشان و رەچاو نەکرا بێ.**

کەواتە **شۆرش بزووتنەوەیەکی نازاگۆنی یە کە دەبێ بە هۆی گۆڕینی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی، یان رامیاری، یان ئایینی، یان ئابووری، یان ناسیۆناڵ؛ لە بنچینەوە و پڕکردنەوەی جێ ی ئەو سیستەمە بە سیستەمێکی دیکەی جیاواز لەوەی پێشوو، بێ ئەوەی ئەو بزووتنەوەیە خۆی ببەستێ بە دەستوور و زاگۆنی ئەو دەوڵەتە یان ئەو کۆمەڵگەوە کەوا بزووتنەوەکە لە چوارچێوەی دا روو دەدا.** ئەوجا کە ئەمە روون بووەوە بۆمان؛ ئەوا شێوەی هێنانە دی ئەو گۆڕینە هیچ دەورێك ناگێڕێ لە دیاریکردنی دا. بۆ نموونە: ئەو بزووتنەوەیەی شۆرشەکە بە ئەنجام دەگەیەنێ، بزووتنەوەیەکی چەکدارانە بێ یان بێ چەك بێ. سوپای وڵاتێك بیکا، یان جۆتکاران، یان کرێکاران، یان ژنان، یان خوێندکاران، یان مەلاکانی ئەو وڵاتە بیکەن؛ ئەوە هەمووی وەك یەکە. کەواتە **شۆرش هەر بە مانای خوێنڕشتن و چەك وەشاندن نی یە، و هەموو چەك وەشاندنێکیش شۆرش نی یە.** بۆ نموونە: لە ساڵی ١٦٨٨ ـ ١٦٨٩ دا لە ئینگلستان شۆرشێك رووی دا کە بوو بە هۆی لابردنی **شا جێمسی دووەم** و پەسندکردنی "**دەستووری ماف**" کە ئەم دەستوورە **سەروەرێتی پەرلەمانی** لە جیاتی **مافی ئێزدانی شاکان** جێگر کرد. ئەم شۆرشە بێ چەك و بێ خوێنڕێژی رووی دا و، هەر لەوەشەوە نێوی بە "**شۆرشی بێ خوێن**" بەنێوبانگە. هەروەها شۆرشی پیشەسازی لە ئەورووپا بێ چەك رووی دا. شۆرشی پیشەسازی کە بە داهێنانی مەکینەی هەڵم لە لایەن **جێمس واتەوە لە ١٧٦٦**دا دەستی پێکرد،

شێوەی بەرهەمهێنانی لە کۆمەڵگەی ئەورووپایی دا **بێ چەك و خوێنرشتن لە بنچینەوە گۆڕی**، کاتێك ئامێر (آلة) جێی کاری دەستی گرتەوە و، شەمەندەفەر و پاپۆڕی هەڵم و لۆری بارهەڵگرتن داهاتن و کارخانەی گەورە گەورە کەوتنە کار و جیاوازیی نێوان چینەکان و توێژەکانی کۆمەڵگە پتر چلوورەی بەست، **چینی کرێکار و چینی سەرمایەدار پەیدا بوون.**

بەڵام **شۆڕشی ئەمریکا** کە سەرەتاکەی لە ساڵی ١٧٧٥دا رووی دا و، ساڵێك دووای وی جاڕی سەربەخۆیی ی کۆلۆنی یەکانی بەریتانیای دا و، لەشکرێکی نیشتمانیی بە سەرۆکایەتیی جۆرج واشەنتن پێك هێنا؛ **شۆڕشێکی چەکدارانە بوو لە ١١/١٠/١٧٨١ دا** (لەشکری نیشتمانیی ئەمریکا لەشکری کۆلۆنیالیستە بەریتانیایی یەکانی شکاند و بەریتانیا ناچار بوو لە **کۆنگرەی ڤێرسای لە ٢٠/١/ ١٧٨٣دا**)، دان بە **سەربەخۆیی ی ئەمریکا** دا بنێ بە سەرۆکایەتیی **جۆرج واشەنتن.**

هەروەها **شۆڕشی فەرەنساش** کە لە تەباخی ١٧٨٩دا رووی دا ؛ **بە چەك و** خوێنرێژی یەکجار زۆر توانی گەلێك نرخ و نەریتی کۆمەلایەتی و ئاینی بگۆڕێ. شۆڕشی فەرەنسا **رژێمی شایەتیی ملهوڕی گۆڕی بە رژێمێکی کۆماریی دیمۆکراتی.** لیکۆڵەرەوەکان لەبارەی هۆی هەلگیرسانی شۆڕشی فەرەنساوە یەك نین، **بەڵام هۆی هەلگیرسانی** شۆڕشی فەرەنسا هەرچی یەك بووە! با بێ، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە جەماوەر کەوتنە بزووتنەوە و **دروشمی دادپەروەری و ئازادی و برایەتی یان هەڵگرت**، کە لەوە پێش بە خەونیش نەدەبینرا... خەڵکەکە خۆیان لە ١٧/ ٦/ ی ئەو ساڵەدا پەرلەمانێکیان بە نێوی "ئەنجومەنی دامەزرێنەر"ەوە پێکەوە نا و، لە ١٤/ ی تەمووزی ئەو ساڵەدا جەماوەر پەلاماری **بەندیخانەی باستیلی دا** و گەلێك لە پاسەوانەکان و زیندانی یەکانیش کوژران و لە ١٤/ ٨ دا **ئەنجومەنی دامەزرێنەر هەموو ئیمتیازاتی دەرەبەگایەتی ی لابرد** و لە ١٧٩١دا دەستوورێکی دانا بۆ وڵات کە ئەم دەستووورە دوواییی بوو بە بناخەیەك بۆ داخۆیانی کردنی مافی مرۆڤ لە جیهاندا. هەروەها جەماوەر لە ١٠/٨/ ١٧٩٢دا پەلاماری کۆشکی شای دا و، گەلێك پاسەوانی کۆشك کوژران و، هەر لە ٢١/٩ی ئەو ساڵەدا **کۆنگرەی نیشتمانیی سیستەمی شایەتی لابرد و گۆڕی بە سیستەمی کۆماری** و ، لە کانوونی دووەمی ١٧٩٣دا **شا لویس** و، گەلێك کەسایەتیی ناسراوی وەك کیمیازانی

بەنێوبانگ **لافوازێ** بە تۆمەتی خیانەت لە سێدارە دران. جا هەرچەندە پاش ئەوە بەرەی **کۆنەپارێز** توانی بۆ ماوەیەك بێتەوە سەرکار، بە تایبەتی لە پاش **کودەتای ناپلیۆن** لە ۱۷۹۹/۱۱/۱۹دا؛ بەلاّم **بۆرژوازیی سەرمایەداریی فەرەنسا** بە تەواوی جێی خۆی کردەوە و، **دەرەبەگێتی** بە جارێ نەهێشت و، کاریشی کردە سەر تەواوی ئەورووپا. هەر لەمەشەوە هوردە بۆرژوازیی فەرەنسا دەولەتی **تێریتۆریالی** گۆری بە **دەولەتی ناسیۆنالْ** و، ئەوجا هێدی هێدی لە هەموو ئەورووپادا دەولەتی ناسیۆنالْ دروست بوون.

لەبەر رۆشنایی ئەم باسەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ کە **بزووتنەوەی "جۆن ترکەکان" بە سەرۆکایەتیی مستەفا کەمال (ئەتاتورك)** شۆرش بوو، چونکە **سیستەمی خەلافەتی ئیسلامیی عوسمانی گۆری بە سیستەمی جیهانیی نا ئاینیی تورانێتی. ئەمە بێجگە لە دامەزراندنی دەولەتێکی ناسیۆنالی ترك لە جیاتی دەولەتی تێرتۆریالی عوسمانی و گۆرینی ئەلفوبێی ترکی لە ئەلفوبێی رۆژهەلاّتی یەوە بۆ لاتینی.**

بزووتنەوەی چەکدارانەی ئۆکتۆبەری ۱۹۱۷ لە ئیمپراتۆریی رووسیای **قەیسەری** دا شۆرش بوو، چونکە نەك هەر **رژێمی قەیسەری گۆری بە رژێمی بۆلشەوێکیی سۆڤێتی،** بەلْکو **زەوی و زاری تایبەتیشی کرد بە مالّی دەولەت و سیستەمی کۆلخۆزی هێنایە پێشەوە و، باوەڕ کردن بە خودێ و باوەڕ پێنەکردنی وەك یەك لە قەلەم دا بە پێی قانوون، بە لابردنی دەسەلاّتی کلیسەی دیانی، ئەوش لە رێی بەکارهێنانی زۆر و خوێنرێژی یەکی لە تام بەدەر و کوشتنی هەزاران کۆلاك و رێپەندکردن (منع)ی ئازادی لە هەموو رەخنەگر و بەرهەلْستکەرێك.**

هەروەها بزووتنەوەی **پێرسترۆیکا** لە ئیمپراتۆرێتیی سۆڤێتیدا بەسەرۆکایەتیی گۆرباچۆف شۆرش بوو؛ چونکە **سیستەمی سەرمایەداریی دەولەتی گۆری بە سیستەمی سەرمایەداریی تایبەتی (اهلي)** و، **سیستەمی تاکە حیزبی گۆری بە سیستەمی فرە حیزبی،** بەلاّم بێ **خوێنرێژی و بە خشکەیی. بێجگە لەوەش ئیمپراتۆرێتی سۆڤێتیی لە بنەڕەتەوە هەلْوەشاندەوە و هێندێك لەو گەلانەی کە دەولەتی سەربەخۆیان نەبوو؛ وەك گەلە ترکزمانەکان؛** بوونە **خاوەن دەولەت و هێندێك گەلانی دیکە** وەك گەلی کورد لە جاران **بەشخوراوتر بوون و بوونە ئاردی نێو دڕك و**

**کۆچەر.**

**بزووتنەوەی جەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم لە ١٩٥٨/٧/١٤دا لە عێراق، لەیەك رووەوە شۆرش بوو. چونکە سیستەمی دەوڵەتی عێراقی لە دەوڵەتێکی نا ناسیۆنالییەوە گۆڕی بە سیستەمی ناسیۆنالی عەرەبی و، رژێمی نیوە دێمۆکراتی، نیوە ئۆتۆریتێری گۆڕی بە رژێمێکی میلیتاریستی تۆتالیتێر.**

جا ئەگەرچی چەند حیزبێکیش هەبوون، بەڵام هەموو حیزبی بێ دەسەڵاتی نائازاد بوون. شۆرشی نیوەناچڵی قاسم، بوو بە هۆی هەڵگیرسانی شۆرشی بەعسی و دەوڵەتی عێراق بە جارێك بوو بە دەوڵەتی ناسیۆنالی عەرەبی، خاوەن رژێمێکی میلیتاریستی تۆتالیتاریستیی تێرۆریستانە.

**بزووتنەوەی مەلاکان لە ئێران شۆرش بوو. نەك لەبەر ئەوەی مەلاکان بەسەرۆکایەتیی خومەینی رژێمی شایەتیی چەند هەزار ساڵەیان کرد بە رژێمێکی کۆماری، بەڵکو ئەو سەنگ و تەرازووە شێوە لیبەراڵەی کە حکوومەتی شا بە کاری دەبرد لە بنەڕەتەوە گۆڕا. رژێم بوو بە رژێمێکی ئیسلامیی شیعەگەریی خومەینی یانە** و، هێندێك قانوونی سزای ئیسلامی خرانە کار لە جیاتی قانوونی لیبەراڵی لە ئەورووپاوە خواستراوی سەردەمی شا. لێرەدا مەبەستم ئەوە نی یە بێژم **رژێمی حەمەرەزا شا** لیبەراڵ بوو وەك ئەوانەی ئەورووپا. نەخێر. **لەسەردەمی شادا ئازادیی رامیاری نەبوو،** بەڵام ئازادیی تایبەتی تا سنوورێك هەبوو. بۆ وێنە: هەموو کەسێك دەیتوانی چ جۆرە جلکێك بخوازێ لەبەری بکا، کراقات لە مل ببەستێ یان نەبەستێ. ئەلکۆل بخواتەوە یان نەخواتەوە، نوێژ بکا یان نەیکا. ژنان دەیانتوانی پێچە بگرنەوە یان نەیگرنەوە، **سەربەستیی تایبەتی هەتا هەندازەیەك هەبوو.** ئەم جۆرە سەربەستی یە لە بنچینەوە نەما.

بزووتنەوەی **سوپای لیبیا** بەسەرۆکایەتیی سەرهەنگ **موعەممەری قەزافی** کە بە **شۆرشی فاتیح** بەنێویانگە و لە ١٩٦٩/٩/١دا رووی دا، شۆرش بوو،نەك لەبەر ئەوەی رژێمی شایەتیی گۆڕی بە کۆماری، بەڵکوو لەبەر ئەوەی سیستەمی کۆمەلایەتی و بەڕێوەبەرێتی و حیزبایەتی لە بنچینەوە گۆڕی، بە دروستکردنی کۆنگرەی گەلیر **(موءتمرات شعبیة)** لە جیاتی حکوومەت و، **دانانن بە مافی نەتەوەی کورددا بۆ سەربەخۆیی ی کوردستان.** ئەمە لە کاتێکدا کە هیچ دەوڵەتێك و

هیچ سەرۆك دەوڵەتێك تا ئێستە نەیوێراوە خۆی لەو باسە بگەیەنێ. بە تایبەتی سەرکردەکانی عەرەب و ترك و فارس. **قەزافی** بەمە پەردەیەکی درۆ و دەلەسە و ترسی بەجارێك دراند.

**بزووتنەوەی نازێتی لە ئەڵمانیادا شۆڕش** بوو. **چونکە سیستەمی دێمۆکراتی لیبەرالی گۆڕی بە سیستەمێکی دیکتاتۆریی رەگەزپەرستانەی دژ بە هەموو کەسێك کە لە رەگەزی گوایە ئاری نەبێ و، سیستەمی چەند حیزبیشی گۆڕی بە سیستەمی یەك حیزبی، حیزبی نازی. (۱)**

بزووتنەوەی **رۆشنبیرانەی مرۆڤ دۆستانەی** زانای ترك **ئیسمایل بێشکچی** دژی بیرو بۆچوونی تۆرانێتی؛ لە بنەڕەتەوە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە بوو. **بێشکچی کوردستانی بە کۆلۆنی یەکی ئنتەرناسیۆنالی داناوە** و لە رێی ئەو بەرهەمانەوە کە بە نووسین خستنیە بەرچاوی ملیونان خەڵك، **شۆڕشێکی رۆشنبیری** بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە هەڵگیرساند، بەڵام بوو بە هۆی ئازاردان و گرتن و زیندانی کردنی دەیان ساڵ و تا ئەوڕۆش(۲).

**بڵاوکردنەوەی یەکەمین رۆژنامەی کوردی بە نێوی "کوردستان"ەوە لە مانگی نیسانی ۱۸۹۸دا** واتە سەت ساڵ لەمەوبەر، شۆڕشێك بوو لە مەیدانی بەکارهێنانی دەزگەی راگەیاندنی جەماوەری دا، کە هەر بەم بۆنەیەوە پیرۆزبایی ی سەت ساڵەی رۆژنامەگەریی کوردی لە هەموو لایەك دەکەم.

دامەزراندنی **یەکەمین چاپخانە** لە کوردستاندا (لە ۱۹۱۵ لە شاری حەلەب) لە لایەن بەهەشتی **داماوی موکریانی** یەوە شۆڕشێکی گەورە بوو لە مەیدانی تێکنۆلۆژیای راگەیاندن دا، چونکە کورد پێش ئەوە چاپخانەیان بە خۆیانەوە نەدیبوو.

دامەزراندنی **تەلەفیزیۆنی مێد Med TV'** لە ۱۹۹٥دا شۆڕشێکی گەورەی دیکە بوو لە مەیدانی تێکنۆلۆژیای راگەیاندنی جەماوەریدا، بەتایبەتی بۆ نەتەوەیەکی بێ دەزگەی دەوڵەتی وەك کورد. مێد تی ڤی دەورێکی دیاری هەیە لە گۆڕەپانی خۆناسین و هۆشیارکردنەوەی کورد و نێزیککردنەوەی شێوەکانی زمانی کوردی دا(۳).

هاتنەکایەی فەلسەفە و رێبازی **کاژیك** لە کوردستاندا لە ۱۹٥۹/٤/۱٤دا

شۆڕشێکی ڕۆشنبیرانە بوو بۆ هەرەسپێهێنانی کۆشکی تۆتالیتاریزمی چەپاژۆ لە هەموو جیهاندا. ئەوانەی تا دوێنێ تیر و شیریان دەسوو لە کاژێک، ئەوەتە ئەوڕۆ وشەی "نەتەوەیی"یان کردووە بە وێردی زمانیان.

بەمانەی سەرەوەدا تێگەیشتین کە هەر شۆڕشێك بریتی یە لە بزووتنەوەیەك کە دەبێ بە هۆی گۆڕینی چمکێکی بنەما، یان تەواوی بنەمای کۆمەڵگەیەك لە ڕێی پڕکردنەوەی سیستەمی ڕەوا (ڕاهن) وە بە سیستەمێکی دیکەی جیاواز لەوەی پێشوو. دیارە هەموو بزووتنەوەیەك کە ئامانجی ئەم جۆرە گۆڕینە بێ و، نەگاتە ئەو گۆڕینە و لەنێو بچێ، پێی دەگوترێ بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە. کەواتە هەر شۆڕشێك سەنگ و تەرازوویەك دێنێتە پێشەوە کە لە سەنگ و تەرازووی پێشوو ناچێ. بۆ وێنە: سەنگ و تەرازووی ڕژێمی سۆڤیاتی کۆمۆنیزمی دەوڵەتی بوو. سەنگ و تەرازووی ڕژێمی مەلاکانی ئێران شیعەگەرێتی یە، سەنگ و تەرازووی ڕژێمی ئەڵمانیای نازی ڕەگەزپەرستی بوو. سەنگ و تەرازووی شۆڕشی فەرەنسا دێمۆکراتی لیبەرالی و هاونیشتمانی بوو. سەنگ و تەرازووی شۆڕشی مستەفا کەمال ئەتاترك و هاوکارەکانی تۆرانێتی بوو. سەنگ و تەرازووی کاژێك ئازادی و یەکسانی و دەوڵەتی نەتەوەیی بوو.

ئەوجا ئێستە هەر بەم لێکدانەوەی سەرەوەمدا دەردەکەوێ کە **شۆڕش بزووتنەوەیەك نی یە کە هەر دەبێ پێشکەوتنخواز بێ. شۆڕش هەیە دووا کەوتنخوازە.** ڕاستی یەکەشی ئەوەیە، تا ئەوڕۆ لە هەموو جیهاندا بە دەگمەن شۆڕش ڕوویان داوە کە پێشکەوتنخواز بووبن، یان سەنگی لایەنی پێشکەوتنخوازی یان لە سەنگی لایەنی دوواکەوتنخوازی یان گرانتر بووبێ. **شۆڕش بە زۆری هاوڕازی ڕك و کینە و هەستی تۆڵەسەندنەوە و دەستدرێژی بووە بۆ سەر مافی مرۆڤ.** ئەمەش ڕاستی یەکە نابێ چاو بپۆشرێ لێی. دەشزانم ئەم قسەیە بەدڵی گەلەك کەس نی یە.

ئێستەکە وا هاتووینەتە سەر باسی **پێشکەوتنخوازی و دوواکەوتنخوازی،** پێویستە بزانین هەر یەکێك لەم دووانە چی یە.

ئەگەر ئێمە مرۆڤ بکەین بە **تەوەرە (محور)ی ژیان،** دەبێ دان بەوەدا بنێین کە **لە نێو هەموو تایبەتکار و پێویستی یەکی مرۆڤدا؛ تاکە یەك پێویستی هەیە کە سەر دەستەی پێویستی یەکانی دیکەیە.** ئەوەش ئازادییە. ئازادی پێویستییەکی بنچینەیی

و دەست لێبەرنەدراوی مرۆڤی ژیرە. هیچ گیان لەبەرێك نی یە کە دژی ئازادیی خۆی بێ و، بیەوێ بە ئارەزووی دڵی خۆی واز لە ئازادیی خۆی بهێنێ و دەست هەڵبگرێ لێی. هیچ درندە و هیچ ئاژەڵ و هیچ مەلێك رازی نابێ بەوەی بە زۆر بیخەیتە کونێکەوە و دەرگە خڕ داخەی لەسەری. هەر کاتێك دەرفەت هەڵکەوت بۆی؛ دەردەپەڕێ و خۆی ئازاد دەکا. هیچ مرۆڤێکی ژیر رازی نابێ بە ئارەزووی خۆی ببێتە کۆیلەی ئەم و ئەو و ئازادی لێ بگیرێ. تەنانەت ئەو دیکتاتۆر و ملهوڕانەی کە رازی نابن کەس ئازادی هەبێ، رازی نابن ئازادی لە خۆیان بستێندرێتەوە. بە کورتی: **شەڕ و هەرای ئەم جیهانە شەڕە لەسەر ئازادی و، لەبەر ئەوە بوون و نەبوونی ئازادی تاکە پێوەرێکە و تاکە سەنگ و تەرازوویەکە بۆ پێوانی پێشکەوتن و پاشکەوتن لە کۆمەڵگەی ئادەمزاددا. چونکە بوونی ئازادی؛ بوونی دەسەڵاتە و نەبوونی ئازادیش؛ نەبوونی دەسەڵاتە و هیچ گیان لەبەرێکیش نی یە بە بێ دەسەڵاتی رازی بێ. بەڵام کە ئازادی مانای دەسەڵات بێ**، دیارە ئازادی پڕ بە پڕی دەسەڵاتە و پێچەوانەش بە پێچەوانە. واتە **ئازادیی وەك یەك، خۆی لە دەسەڵاتی وەك یەك دا دەنوێنێ**. واتە؛ کاتێك دەسەڵاتی تاکەکەسێك و تاکە کەسێکی دیکە، یان دەسەڵاتی کۆمەڵە کەسێك و کۆمەڵە کەسێکی دیکە، یان دەسەڵاتی گەلێك و دەسەڵاتی گەلێکی دیکە؛ وەك یەك نەبێ، ئازادیی هەر دوو لاش وەك یەك نابێ. **جا لەبەر ئەوەی سروشتی ئازادی وەك تایبەتکارێکی بنەمایی ی هەر مرۆڤێك پێپیلکەیی نی یە، واتە لە پلەپلەکردن و بەش بەشکردن و کەم و زۆری نایێ**؛ وەك چۆن سروشتی تەندروستی لە پلەپلەکردن نایێ. بۆ وێنە: مرۆڤێك یان تەندروستە یان تەندروست نی یە. کەمێك تەندروستی مانای نەخۆشی یە و کەمێك نەخۆشیش هەر نەخۆشی یە. دیارە کەمێك نائازادی هەر ژێر دەستەیی یە. بە کورتی: چۆن لە نێوان مردن و ژیاندا پلەیەکی دیکە نی یە، کەمێك ژیان، یان کەمێك مردن نی یە، لە نێوان ئازادی و بندەستی دا پلەیەکی دیکە نی یە. **لە بەر ئەوە ئازادی تەنێ لە دۆخی یەکسانی دا شیاو.(قابل)ی هاتنە دی یە.**

جا ئەگەر ئێمە ئازادی بکەینە سەنگ و تەرازووی پێوانی ئامانج و بەرهەمی شۆرش؛ دەبینین **شۆرشی کۆمۆنیستەکانی رووسیا بە سەرۆکایەتیی لینین و ستالین و شۆرشی شیعەکان لە ئێراندا بە سەرۆکایەتیی ئاخوندە فارس و ئازەری یەکان و**

**شۆرشی تورانی یەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە سەرۆکایەتیی مستەفا کەمالی ئەتاترک و جۆن ترکەکان و، شۆرشی نازی یەکانی ئەلمانیا بە سەرۆکایەتیی هیتلەر و، شۆرشی جەنەراڵ کەریم قاسم لە عێراقدا** و، گەلێك شۆرشی دیکە؛ **شۆرشی پێشکەوتنخوازانە نەبوون؛ بەڵکو پاشکەوتنخوازانە بوون. ئەم شۆرشانە کۆمەڵگەیان بەرەو کۆمەڵگەیەکی تۆتالیتێر، یان میلیتاریست برد؛ کە دەنگی ئازادیی بیروباوەڕ دەربڕین و بڕیاری چارەنووسی تاکەکەس و کۆمەڵ و مافی کار و یەکسانیی ژن و پیاو و، گەلێك مافی دیکەیشان لە خەڵك بڕی.** بە کورتی ئەم شۆرشانە نەبوونە هۆی ئەوەی دەسەلاتی وەك یەك لە هیچ روویەکەوە، چ رامیاری، چ خوێندەواری، چ ئابووری، چ ئاینی، چ کۆمەلایەتی، چ ناسیۆنال، بۆ خەڵکەکە پێك بهێنێ، ئەگەرچی نەریتی کۆمەڵگەکەیان سەرەوژێر کرد و، لەگەڵێك رووەوە لە بنچینەوە گۆڕییان. **بە پێچەوانەی ئەمەوە، شۆرشی فەرەنسا، سەرەڕای هەموو هەڵە و خوێنڕێژی یەکی؛ شۆرشێکی پێشکەوتنخوازانە بوو.** هەروەها شۆرشی **پێرسترۆیکا**؛ سەرەڕای گەلێك لایەنی رەش و چەپەڵی، لە هێندێك رووەوە پێشکەوتنخواز بوو.

ئەوجا با ئێستە لەبەر رۆشنایی ئەم قسانەی سەرەوەدا لە کورد و شۆرش بکۆڵینەوە:

کورد، وەك یەکێك لە نەتەوە هەرە کۆنەکانی رۆژهەلاٽ، ئەگەر نەبێژین یەکێك لە نەتەوە هەرە کۆنەکانی جیهان، لە ولاتێکدا دەژی کە هەر لە کۆنەوە سەرەڕێی پەلاماری گەلان و هۆزە جۆرجۆرەکانی رۆژهەلاٽ و رۆژاوا بووە. بەتایبەتی **مەغۆلەکان و هۆزە ترکەکان و فارسەکان و ئەفغانی یەکان و تاجیکەکان لە** خۆرهەلاتەوە پەلاماریان داوە. **رۆمەکان لە باکوورەوە و، عەرەبەکان و، هۆزە سامی یەکان** لە باشوورەوە پەلاماریان داوە. **دیارە کە کورد تا ئەورۆ ماوە، هۆی ئەوەیە کە توانیوێتی خۆی بەرامبەر بەم دەستدرێژکەرانە بپارێزێ و لە رێ ی بەرخۆدانەوە، چ چەکدارانە و، چ رۆشنبیرانە؛ دەستی درێژیان کورت بکا.** ئەگە نا گەلێك گەل هەبوون؛ وەك **سۆمەری یەکان و بابلی یەکان و فنیقی یەکان و میسری یە کۆنەکان و ئەکەدی یەکان** کە لە خۆرهەلاتی ناڤیندا ژیاون و کولتووری مەزنیان دامەزراندووە؛ کەچی ئەورۆ هەتەر و پەتەریشیان نەماوە.

بزووتنەوەی چەکدارانە و رۆشنبیرانەی کورد زۆرن، بەلاٽم بە پێی ئەو

بەڵگەنامانەی کە کەوتوونەتە بەردەست: بزووتنەوەیەك کە لە کۆندا رووی داوە و، بە شــۆرش دەدرێتــە قــەڵەم؛ بزووتنەوەی هەژار و رووتەی کــورد بووە لە دژی فــەرمــانرەوایانی عــەباسی و، بە تایبــەتی **خەلیفەی عــەباسی مستــەعسەم بیلا (مستعصم باللە)** کە لە ساڵانی ٧٩٠ تا ٨٤١ ژیاوە. موستــەعسەم کە لە ساڵی ٧٩٩ دا پاش مردنی **مەئموونی (مامون)**ی برای کرا بە خەلیفە، کابرایەکی زۆردار و ملهــۆڕ بوو. لەبەر ئەوە کــورد و فــارس و رۆمــەکــان لێی راپەڕین. ئەویش چوو ژمارەیەکی زۆر **جاشی ترکی** لە ئاسیای نێوەڕاستەوە هێنایە وڵاتی خەلافەتی ئیسلام و، دەستی بەرڵڵا کــردن بۆ تالآن و بڕۆیی و خــوێنڕێژی (شایانی باســە کــە **تالآن** وشەیەکی **مەغۆلی** یە و کەوتووەتە نێــو زمانی کوردی یەوە). دووایی ترکــەکان کە دەسەلآتیان سەند، کەوتنە چاوترساندنی موستەعسەم. ئەویش ناچار بوو لە جێ یەك نیشتەجێ یان بکا و، داویان دامەزرێنێ، لەبەر ئەوە شارۆچکەی **سامەرا (سامرا)**ی دروستکرد بۆیان، کە لەوێ هێدی هێدی توانەوە و بوون بە عەرەب.

شۆرشی ئەو دەمــەی کورد لە نیوەی یەکــەمی ســەتەی نۆیەمــدا بەســەرۆکایەتیی **پاپەکی خوڕەمدین** هەڵگیرسا. پاپەك کە مێژوونووسە عەرەبەکان بە **"بابەك"** (بابك) نێــوی دەبەن؛ چونکە دەنــگی پێ P لە زمانەکەیاندا نی یە، رۆشنبیرێکی گەورە و ســەربازێکی ئازا و نەترسی کــورد بوو. پاپەك کــە لە کــردەوەی جــانەوەرانەی کاربەدەستە عــەرەبە عــەباسی یەکان و جاشە ترکــەکانی لە کوردستــاندا وەڕس بوو بوو، کــەوتە کــۆکــردنەوەی ژمــارەیەك چەکــدار لە دەوری خــۆی و بانگی خــۆ جیاکردنەوەی لە ئیمپراتۆرێتیی **عەباسی** دا **بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێك کە زەوی و زار ملکی تاکەکــەس نەبێ، بەڵکوو ملکی گشــتی بێ**. چونکە عــەرەبە داگیرکــەرەکان زەوی و زاری کوردستانیان کردبوو بە ملکی خۆیان و کورد وەك جۆتکار و سەپان و پاڵە کــاریان بۆ عــەرەبەکان دەکرد لە زەوی خۆیاندا. هەروەها **پاپەك** دەیگوت **دەبێ ژن و پیاو لە کۆمەڵگەدا مافی وەك یەکیان هەبێ**. چونکە عەرەبە داگیرکەرەکان ژنیان بە نیوەی پیــاو لە قەڵەم دەدا و وەك کۆیلە و بەندە و کەنیزەك (جاریــة) تەماشایان دەکــردن. ئەمــانە هەر قســە و بەڵێن نەبوون لە لایەن پاپەکــەوە، بەڵکوو بە کــردەوەش هێنرانە دی و، دەوڵەتی پاپەك لە چیاکانی باشووری کوردستــاندا نێزیکەی بیست ساڵێك بەرگەی گرت و ژیا؛ تا خەلیفەی عەباسی بە فیلْ و تەڵەکە و خیانەتی یەکێك

لە سەرکردەکانی **لەشکری پاپەك** کە نێوی **ئەفشین** بوو، توانی پاپەك بگرێ و بیکوژێ. لەشکرەکەی پاپەك هێندە بەهێز بوو، هەموو هەژار و بێ نانێك لە ریزەکەی دا بە کوڵ و دڵەوە دەجەنگی. کۆنە مێژوو نووسە عەرەبەکان زۆر بێ ویژدانانە باسی پاپەکیان کردووە، بە بوختان دەبێژن کە گوایە پاپەك ئاینێکی داناوە کەس ملکی نەبێ و ژنیش ژنی یەك پیاو نەبێ، واتە ژنێك بتوانێ لەیەك کاتدا شوو بە چەند پیاوێك بکا بە ئارەزووی خۆی. بێگومان هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نی یە کە پاپەك وای گوتبێ. راستە لە سیستەمی فەرمانڕەوایی پاپەکدا یەکسانیی ژن و پیاو هەبوو؛ بەڵام لە هیچ جێ یەکدا باسی ئەوە نەهاتووە کە پیاو چەند ژنی هەبێ و ژن چەند پیاوی هەبێ. **شایانی باسە کە ژن لە کۆمەڵگەی کوردەواریی پێش ئیسلامدا وەك دیل تەماشا نەکراوە.** کچ بە زیندوویەتی زیندە بە چاڵ نەکراوە؛ وەك عەرەبەکان کردوویانە. ئەگەر ژنی کورد پێش ئیسلام رێز و قەدری خۆی نەبووبێ پاپەك نەیدەتوانی باسی یەکسانیی ژن و پیاو بکا. **شایانی باسە کە کورد لە کۆندا خودێ یەکی ژنیان پەرستووە نێوی ئەناهیتا بووە** کە گەورەترین پەرستگەی ئەم خودێ یە ئەوڕۆش لە **کەنگەوەری نێزیك کرماشان** ماوە. راستی یەکی دیکە کە زۆر لە کۆنەوە سەرنجمی راکێشاوە ئەوەیە کوڕی ئازا و کچی لێ هاتوو لەنێو کوردەواری دا نێوی دایکیان وەردەگرن؛ نەك نێوی باوکیان. ئەمە نەك هەر لە فۆلکلۆری کوردی دا هەیە، وەك چیرۆکی کارۆسلیقی، بەڵکوو تا ئەوڕۆش لە نێو کوردەواری دا هەر ماوە. بۆ وێنە: **خولە پیزە (٤)، گەلاوێژی نەعە خان، محەممەد لەیلا (٥)، سەعەی گەوهەر (٦).** لەمەش بترازێ دەبێ ئەوە بێژم کە زەوی و زاری بەشێکی گەورەی کوردستان تا نێوەڕاستی سەتەی رابردوو ملکی گشتی بوو، واتە زەوی و زاری کشتوکاڵ هی هۆزێك یان هی چەند گوندێکی نێزیك بەیەك بوو. لەو ساڵانەوە کە عوسمانی یەکان زاگۆنی **"تەنزیمات"** یان داهێنا (١٨٤٣ ـ ١٨٤٩) کەوتنە داگیرکردنی زەویی کشتوکاڵیی کوردستان و نوێنەری خۆیان لەسەر دانا بۆ بەڕێوەبردنی. دووایی ئەو زەوی یانە بوونە ملکی ئەو نوێنەرانە و خێزانەکانیان و کاتێکیش **تاپۆ** داهات تاپۆ کرا لەسەریان. بەم جۆرە لە کوردستاندا چینێکی خاوەن زەوی و زاری دەرەبەگ و چینێکی هەژار و جۆتکار و پاڵەی بێ زەوی و زار دروست بوون کە چینە دەرەبەگەکە بە زۆری لەگەڵ حکوومەتی داگیرکەر هاوکاری دەکرد بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی یە

تایبەتەکانی خۆی. ئەم میراتە تا ئەورۆش بۆ نەوەی نوێ ماوەتەوە. سیستەمی **گوندپارێز (قۆروجو)** کە تۆرانی یەکانی ئەم سەردەمە دایانهێناوە لە باکووری کوردستاندا، درێژەیەکە لەوەی رابردوو.

شایانی باسە کە شوێنەواری سیستەمی زەوی و زاری گشتی و شێوەی بەرهەمهێنانی سەردەمی کۆن هێشتا لە نێو کوردەواری دا لە هێندێك شوێندا ماوە وەك شێوەی **"هەرەوەز"** و برشت گرتن لە هێندێك زەوی کە پێیان دەگوترێ **"نێوکۆیی"** واتە ملکی هەموو لایەك **(مُشاع)** و مالی گشتی. ئەمەش ئەو راستی یە دەگەیەنێ کە **سیستەمی سۆسیالیستی** بە لای کوردەوە شتێکی نامۆ نی یە و، کورد ئەم سیستەمەی ناسیوە بەر لە ئەورووپایی یەکان.

لە سالی ١٢٥٨ ز دا **مەغۆلەکان و هۆزە ترکەکان** بە سەرۆکایەتیی **هەلاکۆ؛** پەلاماری بەغدادیان دا و بەوە سەروەرێتیی عەرەبی موسولمان بەسەر کوردستان و ولاتی فارسدا نەما. هەر چەندە مەغۆل و هۆزە ترکەکان کە بەرەو پێتەختی خەلافەتی عەباسی (بەغدا) تێپەرین؛ خوێنێکی یەکجار زۆرتریان لە کوردستاندا رژاند و، ماوەیەك بوونە فەرمانبەری هێندێك شوێنی داگیرکراوی کوردستان، لەگەل ئەوەشدا کوردستان هەر وندا نەبوو. ئەوەتە **حەمدوللای مستەوفی قەزوینی لە کتێبەکەیدا "نزهت القلوب" (سەیرانی دلان)** کە لە سالی ٧٤٠ کۆچی (١٣٣٩/٤٠ز) دا بە زمانی فارسی نووسیوێتی، **باسی کوردستانێك دەکا کە لە ١٦ ستان (پاریزگە) پێکهاتووە** و یەکێك لە کورەکانی **سولتان سەنجەری سەلجووقی** فەرمانرەوای بووە. جا لەبەر ئەوەی کورد لەم ماوەیەدا لە سنووری یەك دەولەتدا هەموو پێکەوە ژیاون؛ یا فەرمانرەواکەشیان کورد نەبووبێ، بەلام کورد خۆی لە نێوخۆی دا بووە، پتر دەنگی بەیەك گەیشتووە، توانیوێتی هوردە هوردە خۆی لە دەسەلاتی بیانی جیا بکاتەوە و **چەند میرنشینێکی سەربەخۆ** دروست بکا. **شەرەفنامە** کە لە سالی ١٥٩٧/١٥٩٦ لەلایەن زانا و میرزادەی کورد **شەرەفەدینی بیتلیسی** یەوە نووسراوەتەوە؛ باسی ژمارەیەکی زۆر **دەولەت و فەرمانداریتیی سەربەخۆ** دەکا کە لە پێش سەردەمی **شەرەفەدینی بیتلیسی** دا دامەزراون و هێندێکیشیان هەتا سەردەمی شەرەفەدین هەر ماون. دیارە **راگرتنی ئەم سەربەخۆییەش** تا ئەو سەردەمە، واتە کۆتایی سەتەی شانزەیەم لە ئەنجامی شۆرش و بەرخۆدانەوە بوو دژی داگیرکەرانی

**مەغۆل و عەرەب و ترك و فارس.** بەلآم ئەم **میرنشینە سەربەخۆیانە** پاش ئەوەی لەگەڵ ترکە عوسمانی یەکان لە ساڵی ١٥١٥دا ڕێککەوتن و پێکەوە ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی یان دامەزراند، سوڵتانەکانی عوسمانی ڕێزی سەربەخۆیی ی نێوخۆیی ئەم میرنشینانەیان نەگرت. لەبەر ئەوە کورد لە هەموو لایەکەوە کەوتنە ڕاپەڕین بۆ جیابوونەوە لە ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی و وەدەستهێنانەوەی سەربەخۆیی لە ڕێی شۆڕشەوە.

**بزووتنەوەی کوردایەتی لەو سەردەمانەدا بەسەرکردایەتیی سەرکردە کلاسیکەکانی کورد بوو. ئەم بزووتنەوانە لە باری ناسیۆناڵەوە شۆڕش بوون،** چونکە سەرکردە کلاسیکەکان هەوڵی سەربەخۆیی کوردستانیان دەدا، واتە دەیانویست ئەو سیستەمی نایەکسانیی ژێردەستەیی یە؛ بگۆڕن بە سیستەمێکی یەکسانی لەباری ناسیۆناڵەوە، بەلآم لە رووی ئابووری و... هتدەوە بزووتنەوەکان بە شۆڕش دانانرێن، **چونکە هیچ** گۆڕانێکی بنچینەیی لەو رووانەوە نەخرابوونە بەرچاو. ئەم سەردەمەش، **واتە سەردەمی سەرکردایەتیی کلاسیك، هەتا کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم درێژ دەبێتەوە،** پاش ئەمە هوردە بۆرژوازیی کورد کەوتە خۆ کۆکردنەوە تا توانی لە حەفتاکاندا، پاش هەرەسهێنانی **شۆڕشی ئەیلوول** بە سەرکردەیەتیی **سەرۆك بارزانی،** بە جارێ دەست بەسەر بزووتنەوەی کوردایەتی دا بگرێ.

**بزووتنەوەی کوردایەتی لە سەردەمی سەرکردە هوردە بۆرژواکاندا کە دەسەلآتیان لە پاش جەنگی جیهانیی دووەمەوە دەستی پێ کرد تا گەیشتە ئەوڕۆ، لە پێشدا زۆر بە کزی و لاوازی و، لە پەنای نێو و نێوبانگی سەرکردە کلاسیکی یەکاندا وەك مەلا مستەفای بارزانی و پێشەوای شەهید قازی محەممەد دەستی پێ کرد،** تا گەیشتە پلەی خۆ سەربەخۆ کردن. **بزووتنەوەکانی هوردەبۆرژوازیی کورد و ڕاپەڕینی چەکدارانەیان ناتوانرێ بە شۆڕش بدرێتە قەڵەم.** جارێ لەباری ناسیۆناڵەوە داخوازیی ئەم بزووتنەوانە لە پێشدا ئۆتۆنۆمی بوو و، ئێستە داخوازی هێندێك لایەنیان لە هێندێك شوێن، بووە بە فیدراڵیتی، کە دیارە **ئۆتۆنۆمی و فیدراڵی هیچیان نابنە هۆی گۆڕینی سنووری دەوڵەتە داگیرکراوەکانی کوردستان لە بنچینەوە؛ بە پێچەوانەی سەربەخۆیی یەوە.** لەباری کۆمەلآیەتیشەوە هیچ گۆڕانێکی ئەرێتی (ایجابی) ئابووری لە پێوەندیی نێوان چین و توێکەکانی کۆمەڵگەدا بەدی ناکرێ.

بۆیە ئەم بزووتنەوانە **بزووتنەوەی ریفۆرمیستانەن** کە بۆ گەیشتنە هێندێك مافی سەرەتایی ی مرۆڤی کورد هەوڵ دەدەن لە سنووری دەستکردی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرپوەبەران و کادیرانی ئەم رێکخراوانە، زۆربەی زۆریان پەروەردەی قوتابخانەکانی داگیرکەرانی عەرەب و ترك و فارسن کە هەموو تۆتالیتێر و میلیتاریست و دیکتاتۆرن، دیارە کارکردی پەروەردەی بیروبۆچوون و ئیدیۆلۆژیای نامرۆڤدۆستانەی ئەم داگیرکەرانە، زۆر بە تایبەتی لەم سەدەیەدا؛ تەزوو و شۆتێکی توندی گەیاندووە بە چینی خوێندەواری کورد و تووشی گەلێك نەخۆشیی دەروونی ی کردووە وەك: **باوەڕ بە خۆ نەکردن و پشتبەستن بە بیانی، بە تایبەتی بە داگیرکەران، شەڕی خۆکوژی لەسەر دەسەڵاتی کاتی و شەیدا بوونی خەیاڵی ستالینیستانەی "حیزبی پێشڕەو" و"تاکە حیزب" و "تاکە سەرکردە" و جیانەکردنەوەی درۆ و دەلەسە و خۆ هەلخلەتاندن لە دیپلۆماسێتی و، خۆ بەکەم و بچووك زانین بەرامبەر دەرەوە و خۆ بە زلگرتن لە نێوەوە و دان نەنان بە هەڵەدا و پاساودانی گوناه بە ئۆباڵ خستنە سەر ئەم و ئەو و ئیمپریالیزمی جیهانی و هەڵگرتنی درۆشمی خاپێنەری برایەتیی درۆزنانەی کورد و عەرەب و کورد ترك و کورد و فارس.** بە بیروڕای من، کە ئەم سەرنجەشم زۆر دەمێکە بڵاو کردووەتەوە، بزووتنەوەی کوردایەتیی بەسەر کردەیەتیی هوردەبۆرژوازیی کورد، بە تایبەتی لە رۆژی ئەمڕۆدا؛ **نە ستراتیژی هەیە و نە تاکتیك.** واتە نازانێ چی دەوێ، لەبەر ئەوە هەر هەنگاوێك کە دەنێ وەك لیسی کوێرانە هاویشتن وایە. چونکە لەسەر هەموو بزووتنەوەیەك پێویستە هەر لەسەرەتاوە بزانێ چی دەوێ و ئامانجی دوور و نێزیکی چی یە، ئەگە نا ناتوانێ تاکتیکێکی راست بەرەو ئەو ئامانجە بخاتە کار. **دووا بزووتنەوەی چەکدارانەی کورد کە لە ٩ یان ١١ی ١٩٦١دا دەستی پێ کرد، پاش ماوەیەك لە باری ناسیۆنالەوە بوو بە شۆرش بە تایبەتی هەتا کۆتایی شەستەکان،** هەرچەندە سەرکردەکانی شۆرش باسی ئۆتۆنۆمی یان دەکرد، **بەڵام پێشمەرگەی کورد بۆ سەربەخۆیی ی کوردستان شەڕی دەکرد.** گوێ بگرن لە بەشێك لە سروودی **پێشمەرگە** کە **خالید دلێر** لە وێستگەی رادیۆی ئەو سەردەمەی کوردستانەوە بڵاوی دەکردەوە:

**پێشمەرگین، بە هەڵمەتین شێری رۆژی زیللەتین**

**لە پێناوی سەربەخۆیی ی کوردستان بەخت دەکەین ژیانمان و ماڵ و گیان**
**لە پێناوی سەربەخۆیی ی کوردستان، کوردستان**
**پێ بنێتە خاکمان دوژمنی کافر دار و بەرد و خۆلی لی دەکەین بە ئاگر**
**هەڵگڕاوە لەم کێوانە بوونەتە پەندی زەمانە**
**ئەم وڵاتە گۆڕستانی دوژمنانە**

کورت و کرمانجی **پێشمەرگەی ئەو سەردەمە دەیویست سنووری دەوڵەتی داگیرکەری عێراق بگۆڕێ. ئا لەم رووەوە بزووتنەوەی ئەیلوول شۆرش بوو**، بەڵام بزووتنەوەی کوردایەتیی ئەورۆ، ئەوەتە لە هەموو بۆنە (مناسبە) و نابۆنەیەکدا دەبێژێ "**ئیمە لەگەڵ جیابوونەوەی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دا نین**" راستە، ئەم بزووتنەوانە کە لە هێندەك لایەنەوە بە راپەڕینێك دەژمێردرێن بە رووی زۆرداری بێگانەدا دیارە دەورێکی سەرلێشواندنی داگیرکەرەکانی کوردستان دەگێڕن، نەك خستنی ئەو داگیرکەرانە، بەڵام ئەگەر بێتو تەماشایەکی بەرنامەی ئەو حیزبانە بکەین کە هێندێك چەکداریان هەیە و بۆ راگرتنی چەکدارەکانیان پێویستی یان بە "یارمەتی"ی داگیرکەرەکانی کوردستانە، دەبینین هیچیان لە **پرۆگرامەکەیاندا سەربەخۆیی ی کوردستانیان نەکردووە بە ئامانج**. بەڵکو لە هەموو نووسینەکانیاندا سۆرن لەسەر ئەوەی کە نایانەوێ سنووری ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان داگیرکردووە تێك بدەن. تەنانەت **پی کی کی** کە پاش دامەزراندنی لە ١٩٧٨/١١/٢٧دا و هەتا ئەم یەك دوو ساڵەی دوایی **باسی سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد**، وازی لەو ستراتیژە هانی و گۆڕی بە فیدراسیۆن لە سنووری دەوڵەتی ترکدا(**٧**). **بە کورتی حیزبە گەورە چەکدارەکانی کوردستان لە باری ناسیۆنالەوە "شۆرشگێڕ" نین و بزووتنەوەکەیان "شۆرش" نی یە بەڵکوو "ریفۆرمە". ئەوجا کە کورد هەروا لە سنووری دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا بمێنێتەوە، ئەوا ناتوانن بەتەنێ پێوەندی یە ئابووری و کۆمەڵایەتی یەکانیش لە بنچینەوە بگۆڕن، چونکە سەربەخۆ نین. واتە ئەم بزووتنەوانە لە باری ئابووری و کۆمەڵایەتیشەوە ئەوپەڕەکەی جۆرە دەست پێداهێنانێك دەتوانن بە ئەنجام بگەیەنن، نەك شۆرشێك و گۆڕینی بنەڕەتی.**

**هاووڵاتە بەرێزەکان:**

بۆ چارەسەرکردنی ئەو رێڕێیی و سەرلێشیواوی یە؛ بە بڕوای من، پێویستە بەر لە

هەموو شتێك هەموو حیزب و کۆمەڵە کوردی یەکان، چ ئەوانەی چەکداریان هەیە و چ ئەوانەی بێ چەکن، بە یارمەتیی شارەزایان و رۆشنبیرانی کورد لە کۆنگرەیەکی نەتەوەیی دا کە لە شوێنێك بیەستریّ و دەستی داگیرکەرانی نەگاتیّ، لەوە بکۆڵنەوە بزانن ئامانجی بزووتنەوەی کوردایەتی چی یە. ئەگەر ئامانجی بزووتنەوەی کوردایەتی بەلای وانەوە مانەوەیە لە سنووری ئەو دەوڵەتانەدا کە کوردستانیان داگیر کردووە و مەبەستیان دەستکەوتنی هێندەك مافی دێمۆکراتانە و مرۆڤ دۆستانەیە بۆ کورد، وەك **ئۆتۆنۆمی یان فیدرالی، یان مافی کولتووری** و "**بەرزکردنەوەی پلەی ئابووریی نێوچە کوردی یەکان**"ە، ئەوا ئەوە پێویستی بە راگرتنی چەکدار و ئەم هەموو قوربانیی ژیان و ماڵوێرانی و دەربەدەری و کاول بوونی هەزاران گوند و کۆچپێدانی ملیۆنان کورد و لە نێوچوونی سەت هەزاران کورد نی یە و ئەو ئامانجە تەسکو وتروسکە ئەم قوربانی یە گەورەیە ناهێنیّ. لە سەمینارێکدا کە لە رۆژی شەممەی ١٩٨٥/٥/١١دا لە ستۆکهۆلم بە نێوی "**دۆزی ناسیۆنالی کورد، ئۆتۆنۆمی یان کوردستانێکی سەربەخۆ، یان بڕیاری چارەنووس لە ئازادی دا و بۆ ئازادی**" وە پێشکێشم کرد بە بەشداربوونی چەند سەت کەسێك و وتووێژێکی چەند سەعاتی، رەپوراست گوتم: ئەو مافە ئەم قوربانییە ناهێنیّ و تەنانەت ئەو مافەش کاتێك دەست دەکەویّ کە ئەم دەوڵەتە داگیرکەرانە ببنە دەوڵەتی دێمۆکراتیی راستەقینە، ئەوەش پێویستیی بە پشوویەکی درێژ و پێکەوە خەباتی کورد و ئەو هێزە دێمۆکراتی یانە هەیە کە سەر بە گەلانی عەرەب و ترك و فارسن و ئەوەش خەباتێکی درێژخایەنی گەرەکە، ئەوەش هەیە کە جاریّ ئەو هێزە دێمۆکراتانە، لە نێو عەرەب و ترك و فارس دا نین.

ئەمەیان وا! خۆ ئەگەر کۆنگرەکە بڕیاری دا کە کورد دەبیّ بۆ سەربەخۆیی ی کوردستان هەوڵ بدەن وەك نەتەوەیەك کە خاوەنی خاکی خۆی و تایبەتکاری نەتەوەیی ی خۆی و مافی بڕیاری چارەنووسی خۆیەتی؛ ئەوا دیارە دەبیّ ئەو کاتە چاوێك بەو سەنگ و تەرازووانەدا بگێڕدرێتەوە کە تا ئێستە بۆ کێشان و پێوانی بزووتنەوەی کوردایەتی بەکار هاتوون، ئەوەش بە پێرەویی کردنی ئەم پنتانەی خوارەوە:

١) ــ یەکەمین سەرتا لەمەدا ئەوەیە کە بەرژەوەندیی گشتی (نەتەوە) بخرێتە

پێش بەرژەوەندیی تاکەکەس و بنەماڵەیی و حیزبایەتی و هۆزایەتی و نێوچەیی، واتە دەبێ لە بەرژەوەندیی گشتیی دا؛ بەرژەوەندیی تاك و بنەماڵە و حیزب و هۆز و نێوچە ببینرێ، نەك لە بەرژەوەندیی خۆ و بنەماڵە و حیزب و هۆز و نێوچەدا؛ بەرژەوەندیی گشتیی ببینرێ.

**۲)**ـــ دەبێ لەو باوەڕەوە بچین بۆ کێشەکە کە هەموو جۆرە ئارەزوو و خەونێکی مرۆڤ کە ژیربێژی (منطق) پشتی بگرێ، هەرچەندە سەخت و گرانیش بێ دێتە دی، بە مەرجێ کەسی وا هەبن کە لێوەشاوەی ئەو کارە بن و، بێ کۆڵدان و پشت سارد بوونەوە و دوودڵی هەوڵ بدەن بۆی و کات و مەرج و دەستاوێژی لەبار و پێویست ئامادە بووبێ بۆ کارەکەیان و، ئەوجا هیچ هەلێکیش لەدەست نەدەن و، خەڵکیش پشتگیری یان بکەن، یان هیچ نەبێ بەربەرەکانێ یان نەکەن. ئەوەش پێویستی بەوە هەیە **کە گیانی خۆویستی و خۆپەرستی و بە دەوری خۆدا خولانەوە و خۆ تەوەرەیی لە ڕێی پەروەردەی نەتەوەیی یەوە کز بکرێ و خەڵکەکە فێری ئەوە بکرێن کە فێری بەخشین بن و بێژن "هانێ" نەك ئەوەی هەر داوا بکەن و بێژن "کوانێ"؟.**

**۳)**ـــ دەبێ ئەوە بخرێتە بەرچاو کە هەموو دەستکەوتێك لە بوونی سەرمایەوە پەیدا دەبێ. ئەگەر سەرمایە نەبێ دەسکەوتیش نابێ. مروڤی بێ سەرمایە مرۆڤی بێ دەسکەوتە. ئەوجا سەرمایەش هەر پارە نی یە، بەڵکو گەلەك جۆری هەیە. جارێك پارەیە، جارێکی دی مرۆڤی لێوەشاوە و رۆشنبیر و کادری ژیهاتی یە. جارێکی دی زانست و هونەرە. جارێکی دی دەسەڵاتی لەش و وزەی کارکردنە. جارێکی دی شوێن و جێ یە (جیوپۆلیتیك). بۆ گەیشتنە ئامانج دەبێ هەموو جۆرە سەرمایەیەك بەشێوەیەکی هاوئاهەنگانە بخرێتە خزمەتی ئامانجەوە. دەبێ ئەوەش بزانین کە سەرمایەی تەکنۆلۆژی هێدی هێدی لە هەموو جیهاندا لە سەرمایەکانی دیکە دەسەلاتی خورتتر دەبێ. جا ئەگەر سەتەی بیستەم بەراست سەتەی هێزی کارەبا (ئەلەکتریك) بووبێ، ئەوا سەتەی بیستوویەکەمین سەتەی ئەلەکترۆنیك دەبێ. لە سەتەی بیستویەکەمدا هێندە شتی نوێ و تازە بابەت دێتە گۆڕێ و پێ بە پێی ئەوەش گەلەك سەنگ و تەرازوو کە ئێستە بۆ کێشان و دەستنیشانکردنی نرخ و نەرێت بەکار دەبرێن، دێنە گۆڕان. بەڵام **شەڕ لەسەر دەسەڵات، واتە شەڕ لەسەر ئازادی (بوون و نەبوون) درێژ دەکێشێ و توندوتیژتر دەبێ.** ئەگەرچی بەشێوەیەکی دیکە دەبێ لەوەی

پێشتر. ئەمەش هەر وا دەڕوا هەتا دەسەڵاتی وەك یەك جێی دەسەڵاتی ناوەك یەك دەگرێتەوە، واتە **کۆمەڵگەی یەکسان** دروست دەبێ. کەینێ کۆمەڵگەی یەکسان دروست دەبێ، ئەوە مرۆڤ ناتوانێ هەر لە ئێستەوە رمڵ لێ بدا بۆی. بەڵام ئەوەی بە دڵنیاییی یەوە پێشبینی دەکرێ، ئەوەیە ئەوانەی لە مەیدانی تەکنۆلۆژیای ئەلەکترۆنیکدا دوواکەوتوو بمێننەوە، جێ یان لەم خڕەی زەوی یەدا نابێتەوە. لەبەر ئەوە کورد دەبێ هەر لە ئێستەوە **بناخەی شۆرشێکی تەکنۆلۆژی لەسەر بنچینەی رۆشنبیریی نەتەوەیی و ئامانجی نەتەوەیی بنیات بنێ و خۆی ئامادە بکا تاکو لە کاروان بەجێ نەمێنێ.** دوژمنانی نەتەوەی کورد و داگیرکەرانی کوردستان چاوچنۆکانە خەریکی کارن لەم رووەوە. ئەوەتە دەوڵەتێکی وەك **هیندستان و پاکستان** کە گەلەکانیان لە برساندا دەمرن، چەکی ئەتۆم دروست دەکەن. نموونەیەکی دی ئێرانە کە مانگانەی کاربەدەستەکانی پێ نادرێ، بەڵام مووشەکی دوورهاوێژ (١٥٠٠) کیلۆمەتری"**شیهاب**" دروست دەکا. **سەددام چەکی کیمیایی و میکرۆبیۆلۆژی دروست دەکا.** دەوڵەتی رووسیا لە باتی پارە ویسکی دەبەشێتەوە بەسەر کاربەدەستەکانی دا و خەڵکەکەی لە ئەورووپایی یەکان درۆزە دەکەن، کە چی راکێت دەنێرێ بۆ ئاسمان. کورد نابێ چاو لەم کەرێتی یەی ئەمانە و خۆ بەزلگرتنی فیشاڵکەرانە بکا، بەڵکو دەبێ لە مەیدانی تەکنۆلۆژی دا هەنگاوی ژیرانە بنێ. کورد دەبێ بزانێ کە **شۆرش نە تەقوتۆقی تفەنگە و نە قسەی زلی نێو کتێبە. شۆرش کردن هەوڵدانێکی ژیرانەی شێلگیرانەیە بۆ هێنانە دەستی گۆڕینێکی بنچینەیی ی پێوەندیی یەکانی نێو کۆمەڵگە لەباری نرخ و نەرێتەوە و، پڕکردنەوەی جێگەکەیان بەنرخ و نەرێتیکی دی.** ئەوجا ئەگەر کورد دەیانەوێ **شۆرشێکی پێشکەوتنخوازانە** هەڵگیرسێنن، ئەوا پێویستە **ئازادی** بکەنە **تەوەرە** (محور)ی بزووتنەوەکەیان. هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش بکەونە گۆڕینی سەنگ و تەرازوو و نرخ و نەرێت لە کۆمەڵگەی کوردەواری دا.

٤)ـــ کوردستان ماڵی نەتەوەی کوردە (واتە ماڵی کوردە جا ئەو کوردە لە کوردستان دا بێ، یان لە دەرەوەی کوردستان بێ، لە کوردستان لە دایك بووبێ، یان لە جێ یەکی دی). چونکە هەموو کوردێك پێوەندارێتیی کولتووری و هەستی دەروونی بە کوردستانەوە هەیە. هەروەها کوردستان ماڵی هەموو ئەو ناکوردانەیە کە

لە بەرەبەیانی مێژووەوە لە کوردستاندا دەژین و خۆیان بە کوردستانی دەزانن. کوردستان پێویستی بە هەموو کوردستانی یەکە، ژن بێ یان پیاو بێ، کارکەر بێ یان جوتکار بێ، مامۆستا بێ یان خوێندکار بێ، شاری بێ یان گوندی بێ، سەر بە هەر ئاین و هۆز و تیرەیەك دەبێ با ببێ؛ کوردستان پێویستی پێیەتی و، کوردستانیش بە تێکۆشین و تەقەلادانی یەکگرتووی کوردستانییان رزگار دەبێ و سەربەخۆ دەبێ. لەبەر ئەوە خەباتی هەر حیزب و کۆمەڵە و هۆز و بنەماڵە و ئاین و تاکێکی کورد بۆ لەنێوبردنی حیزب و کۆمەڵە و هۆز و بنەماڵە و ئاین و تاکێکی دیکەی کورد، کارێکی بێ مێشکانە و گەوجانەیە و رۆژی رزگاریی کوردستان دوورتر دەخاتەوە.

٥) ــ گورز و خەنجەر وەشاندن لە یەکدی و بەکارهێنانی زۆر و چاوترساندن و تۆقاندن و خەو و خەڵك خاپاندن رێی راست نین بۆ چارەسەرکردنی هیچ جۆرە کێشەیەك، بە تایبەتی کێشەیەکی ئاڵۆزی وەك کێشەی کورد.

٦) ــ سەربەرزیی هەموو ئەندامێکی نەتەوەی کورد و هەموو کوردستانییەك هەر لە سەربەرزیی نەتەوەی کورد و خەڵکی کوردستاندا جێی راستەقینەی خۆیان دەگرن. هیچ کوردێك و هیچ کوردستانییەك سەربەرز و بە رۆمەت نییە و نابێ هەتا کوردستان سەربەخۆ نەبێ و نەتەوەی کورد و خەڵکی کوردستان نەگەنە پلەی ئازادی و یەکسانی. سەرکوتکردنی هاوولاتانی کوردستان لەلایەن هاوولاتانی دیکەی کوردستانەوە و کوێخایەتی کردن بۆ داگیرکەرانی کوردستان و خۆهەڵکێشان بە پێوەندیی توندوتۆڵەوە لەگەڵ داگیرکەراندا، بەڕاستی سەربەرزی نییە، ...کو سەرشۆڕییە. ■

# پەراوێزەکانی سەمیناری
# «کورد و شۆرش»

**(١)** ــ دانانی گەلی ئەڵمان بە گەلێکی **«ئاری»** هەڵەیەکی گەورە و ساختەکارێتییەکی بێ وێنە بوو لە مێژوودا کە لە پەنای ئەوەدا تاوانی قەلاچۆکردنی جووەکان و تاوانی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانیی دووەم لە لایەن **حیزبی نازی** یەوە سازکران. راستییەکەی گەلی ئەڵمان لە باری سەرنجی زانستەوە، هەرچەندە گەلێکی هێندوئەوروپاییە، بەڵام لە خێزانی **«گەلانی ئاری»** نییە، بەڵکو لە خێزانی **«گەلە جەرمەنی یەکان»**ە. **«ئاری»** نێوێکە بۆ کۆمەڵە زمان و فەرهەنگی ئێرانی یە کۆنەکان و هێندییە کۆنەکان و، **«ئاری»** پێناسەیەکی زمانی و فەرهەنگییە، نەك پێناسەیەکی رەگەزی.

**(٢) ــ (ئەم ژێدەرە رۆژی ٢٠٠١/١/٢٩ نووسراوە!)**

ــ لە رۆژی ١٩٩٨/١/٩ دا و، بەبۆنەی یادی هونەر و نووسەر و سیاسەتکار و خەباتکاری کۆڵنەدەری کورد **ئاپۆ عوسمان سەبری** (١٩٠٥/١/٧ ــ ١٩٩٣/١١/١٠) یەوە، نێزیکەی شەست نووسەر و هونەر و رۆژنامەنووس و رۆشنبیری کورد لە شاری **دیمەشق** کۆبوونەوە و، لە ئەنجامی ئەوەدا بڕیاریان دا خەلاتێك بەنێوی **خەلاتی عوسمان سەبری** یەوە لە شێوەی نیشانێکدا دروست بکرێ و، هەر چەند ساڵێك جارێ بدرێ بە بێگانەیەك کە لە مەیدانێکدا خزمەتی نەتەوەی کوردی کردبێ. ئەو بەرێزانە روویان لە من نا کە سەرپەرشتی ئەو کارە بگرمە دەست خۆ. جا لەبەر ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٦ەوە ئاپۆ عوسمان وەك تێکۆشەرێکی رەوشت بەرزی نەگۆڕ دەناسم، تکاکەیانم نەدایە دوواوە. بەڵام ئەوەم کرد بە مەرج بەسەریانەوە کە دەبێ لە کۆمیتەکەدا **(کۆمیتەی خەلاتی عوسمان سەبری)** چەند ژنێکی رۆشنبیری تێدابێ. ئەوانیش گوتیان **«باشە»**. پاش پێوەندیکردن بە بەرێز **دایکی جوان (ام جوان)** کە یەکێکە لە نووسەر و هونەر و رۆشنبیرانی رۆژئاوای کوردستان، هەروەها بە پێشمەرگەی ئازا و رۆشنبیری کورد **دوکتۆر خەجێ یەشار** ەوە و، رازی

بوونیـان بەوەی ببنە ئەندامی کۆمیتەکە، کۆمیتـەکەمان لە حەوت کەس پێکهات. ئەوجا کۆمیتەکەمان بڕیاری دا کە خەڵاتی یەکەم بدا بە زانا و مرۆڤدۆستی گەورەی ترك **پرۆفیسۆر ئیسماعیل بێشکچی**. هەڤالی بەڕێزمان نووسەر و چیرۆك نووس و وەرگێڕ (مترجم) **دلاوەری زەنگی** بە تایبەتی چووبۆ **ئەنقەرە** و خەڵاتەکەی بە دەستی خـۆی لە ڕۆژی ۲۰۰۰/۷/۱۲ پێـشکێش بە بەڕێز **ئیسماعیل بێشکچی** کـرد. بێشکچی تا ئەو ڕۆژە خەڵاتی هیچ لایەکی پەسند نەکردبوو و، ئەمە یەکەمین جارە کە خەڵات پەسند دەکات. هەر پاش ئەوە گەلێك کەسایەتی و نووسەر و ڕۆژنامـەوانی کـورد پیـرۆزبایی یان لە **بەڕێز بێشکچی** کـرد بەو بۆنەیەوە. ڕۆژنامــەی **Yeni Gündem** کە لە **ئەنقەرە** بە ترکی دەردەچیّ لە ڕۆژی ۲۰۰۰ /۷/۱۷ دا وێنەی **بێـشکچی و دلاوەری زەنگی** بڵاو کـردبووەوە لە کـاتێکدا کـە **بەڕێز بێشکچی خەڵاتەکەی بەدەستەوە گرتبوو.**

شایانی باسە کە **کۆمیتەی خەڵاتی ئاپۆ عوسمان سەبری** لـە ڕۆژی ۲۰۰۱/۱/۱۳ دا لە شـاری **باد سالتزئوفلن** لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیا سەمینارێکی سازکرد بۆ وتار خـوێندنەوە و وتووێژکـردن لە بارەی ژیان و بەرهەمی ئاپۆ عـوسـمـانەوە. لەم سەمینارەدا نێزیکەی شەست کەسایەتی زانست و هونەر و نووسین و ڕۆژنامەوانی و هاوبیران و دۆستانی ئاپۆ عوسمان بەشداربیان کرد.

**(۳) ــ (ئەم ژێدەرەی خوارەوە لە مانگی یەکی ساڵی ۲۰۰۱ دا نووسراوە)**

ــ تەلەفزیۆنی **MED** کە لە ساڵی ۱۹۹۵ دا کەوتە کار، یەکەمین تەلەفزیۆنی سەتەلایتی کورد بوو. سـەرەڕای هەمـوو کـەموکورتی و ناتـەواوی و خۆبەستنێك بە ڕێبازی **PKK** وە، زۆر خزمـەتی بە زمان و هونـەری کـورد و هۆشیـاریی کورد کرد. بەڵام پاش گرتنی سەرکردەی PKK **بەڕێز عـەبدوڵا ئۆجەلان (ئاپۆ)** تەلەفزیۆنەکەش بەداخەوە پلەی نرخی هاتە خوارەوە و بوو بە داردەستی سەرکردەکانی PKK.

**(٤)** ــ **خولە پیزە** کوڕی بنـەماڵەیەکی جۆتکاری دانیشتووی گوندێکی سەر بە ستانی سلێمانی بوو. **دایکی خولە نێـوی پیـزە بوو کـە کـورتەی «پیرۆز»**ە. خولە گەنجێك بوو کە هەر لە منداڵی یەوە بە ئازایەتی و جوامێری لە نێو خەڵکی گوندەکەدا ناسرابوو. ڕۆژێکیان بەردەستی دەزگەیەکی میری یان پۆلیسێك دێ بۆ ماڵی **خولە** و دەیەوێ خولە ببا لە گەڵ خۆی بۆ ئەو دەزگەیە (لەبیرم نەماوە بۆ چ مەبەستێك دەبێ)،

بەڵام **خولە** لەوکاتەدا نەخۆش و لەنێو جێگەدا دەبێ. پیزەی دایکی خولە بە **بەردەستەکە** یان **پۆلیسەکە** دەبێژێ: **«خولە نەخۆشە ناتوانێ لە گەڵت بێ»**، بەڵام کابراکە زۆر بەشێوەیەکی ناشیرین بەرەورووی پیزە دەبێتەوە و کە **پیزە** دەیەوێ رێ لە کابرا بگرێ کە نەیەتە ژوورێ، بەشەق بەردەبێتە **پیزە**. **خولەش** لەو کاتەدا لە جێگە راست دەبێتەوە و هێندە لە کابرا دەدا برینداری دەکا و ناچاری دەکا بە پەلەپرووسکێ خۆی بگەیەنێتەوە دەزگەکە، ئەوجا چەند پۆلیسێك دەچنە سەرماڵی خولە و لەبەر دەرگەوە هاوار دەکەن لێی کە خۆی بدات بەدەستەوە ئەگەنا **دەکوژرێ**. لەمەوە دەبێتە شەڕە تفەنگ لەنێوان خولە و پۆلیسەکاندا و پۆلیسەکان دەکوژرێن و خولە رادەکا و دەداتە کەژوکێو. کورت و کرمانجی **خولە** لە ماوەی ساڵێکدا توانی ژمارەیەکی یەکجار زۆر پۆلیس کە چووبوونە سەر خولە بۆ گرتن یان کوشتنی، لەنێو ببا. ئەز ئەوکاتە لە دووایۆلی قوتابخانە بووم، کە هەموو رۆژێ لە قوتابخانە باس هەر باسی **خولە پیزە** بوو. ئەوەی کە هەمووکەس باوەڕیان پێ هێنابوو ئەوە بوو کە خولە پیزە هەر پۆلیس و کاربەدەستی میری دەکوشت، نەك هەژار و خەڵکی سادە. بگرە دەیانگوت کە کاربەدەستێکی دەکوشت پارە و شت و مەکەکانی دەدا بە گوندی یەکان. رۆژێکیان لە باوکم پرسی **«بابە ئەم خولە پیزەیە کێیە وا نێوی دەرکردووە؟»**، باوکم گوتی: **«رۆڵە خولە پیزە جەردەیەکی بەهەشتی یە، رووی حکوومەت رەش بێ»**. راستییەکەی حکوومەت دامابوو بەدەست **خولە پیزەوە** تا بە هۆی فێڵ و تەڵەکەوە و حیزانە بەدەستی یەکێك لەوانەی بەدرۆ خۆیان کردبوو بەهاوکاری **خولە**، خولە لەنێو برا. باش لەبیرمە کە خەڵکەکە هەموو خەفەتبار بوون بۆ نەمانی **خولە پیزە**.

ژیان و بەسەرهاتی خولە پیزە نموونەیەکە بۆ درندەیەتیی داگیرکەرانی کوردستان و شەڕفرۆشتنیان بەخەڵك و ناچارکردنی مرۆڤی دڵپاك و ئاشتیخواز بەدەست وەشاندن لێیان. **خولە پیزە** دەهێنێ چیرۆکێکی شانۆیی لەسەر بنووسرێتەوە و بکرێتە فیلمێکی سینەمایی.

**(٥) ــ (ئەم ژێدەرە لە مانگی یەکی ساڵی ٢٠٠١ دا نووسراوە)**

ــ **محەمەد لەیلا** لە رۆژی ١٩٣١/٣/٩ دا لە **تاخی کوردان (حی الاکراد)** لە شاری **دیمەشق (دمشق)** لە **سووریا** لە دایك بووە. خوێندنی

ســەرەتایی و نێـوەندیی و دووانێــوەندیی و خـوێندنگەی پەروەردەی هەرلەوێ تەواو کـردووە و لـە ئەزمــوونی بەکــەلۆریای دووانێــوەندیی دا بەرزتـرین نمرەی لە هەمــوو سووریادا هێناوە. لە مـاوەی سالآنی خوێندن و ژیانی دا لـە سووریا وەك کـرێکار و دارتاش و مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کاری کردووە. بەهۆی کوردایەتی یەوە لە لایەن کاربەدەستانی سووریاوە راوەدوو نراوە و ناچار کراوە کە برەڤێ بۆ دەرەوە و لە ســاڵی ١٩٦٥ دا وەك **پەنابەری رامیاری** لە ئەڵمانیا وەرگیراوە. ئەوجا خەریکی خـوێندنی هەندازیاری بووە و لە **زانستگەی تەکنۆلۆژیی براون شڤایك** دیپلۆمی هەندازیاریی وەرگرتووە. پاش دامەزراندنی **ئەکادێمیای کوردی بۆ زانست و هونەر** لە ساڵی ١٩٨٥ دا بووە بە ئەندامی ئەکادێمیا و لە کۆنگرەی یەکەمی ئەکادێمیادا کە لە شاری **ڤیەننا** بەسترا باسێکی خەستی لەبارەی **بارستایی** یەوە پێشکێش کرد. شایانی باسە کە **پرۆفیسۆر بارام رەسووڵ**، کە ئەندامێکی دیکەی ئەکادێمیایە و داهێنەری دەرمـانی **(Xalatan)** ە بۆ چارەسـەرکردنی نەخۆشی ئاوی رەشی چاو کە دەبێتە هۆی کۆربوون، ئەویش هەرلەو کۆنگرەیەدا وتارێکی زۆر بەنرخی بەزمانی ئینگلیزی پێشکێش کرد.

**محەممەد لەیلا** بلیمەتێك بوو لە **ماتماتیك و فیزیکدا** و، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە بارەی رەوشی **بارستایی (Massismus)**یەوە کە لە ١٩٥٧ ەوە **تا کۆچی** دوایی پێوەی خەریك بوو، لە چەند بەرگێکدا بەزمانی ئەڵمانی بڵاوی کردووەتەوە. **تیۆری محەممەد لەیلا ئەمەیە کە بنەماکانی نیوتن و ئاینشتاین لەبارەی راکێشانی بارســتــایی یەوە لە بنچــینەوە هەڵەن.** مـحـەمـەد لەیلا مـاوەی بیـست سـاڵ پتـر بیروبۆچوونەکانی خۆی چەندین جار خستە بەردەمی زاناکانی ئەورووپا، بەڵام هیچ کامێکیان **نەگوتیان راستە و نـەگوتیان ناڕاستە،** بەکورتی دامابوون بەدەست ئەوەوە کە بتوانن ئازایانە بیروڕایەك دەرببڕن. بەڕاستی ئەگەر **محەممەد لەیلا** کورد نەبووایە، چەند جارێك پێشنیاز دەکرا کە خەلآتی نۆبێلی بدرێتێ. **محەممەد لەیلا** لە رۆژی ٣٠/ ٩/ ٢٠٠٠ دا پاش ئەوەی مـاوەی دە رۆژ لە نەخـۆشـخـانە کـەوت، لە شـاری **براون شڤایك (ئەڵمانیا)** کۆچی دوایی کرد، گیانی پیرۆزی بەبەهەشت شادبێ.

**(٦) ــ سـەعی گـەوهەر** کوڕی خێزانێکی نیشتمـانپەروەری کوردستان بوو. **دایکی سەعی، گەوهەر خان** ژنێك بوو بە ئازایی و ژیرەکی نێوی دەرکردبوو. **سەعی**

هەر لە منداڵییەوە بە چاونەترسی و سەربەرزی و لە سەرکردنەوەی مرۆڤی لێقەوماو ناسرابوو. **سەعی** خاوەنی چایخانەیەك بوو لە **سلێمانی** کە بووبووە مەڵبەندی نیشتمانپەروەران. **سەعی گەوهەر** لە کۆتایی پەنجاکاندا بوو بە هاوبیری **کاژیك** و هەتا کۆچی دوایی هەر لەسەر ئەو رێیە مایەوە. **سەعی گەوهەر** لەماوەی ژیاندا و لەسەر کوردایەتی **هەژدەجار** خراوەتە زیندانەوە. **هەرسهێنانی شۆرشی ئەیلوول** و پاش ئەوەش کارەساتەکانی **هەڵەبجە و ئەنفال و ئەوجا گەلرەوەکەی بەهاری ۱۹۹۱** و **پەرەوازەبوونی منداڵەکانی** هەریەکە بۆ لایەك کارێکی گەورەیان کردەسەر هەستی نازك و دەروونی زیندووی سەعی و لە شەوی ۲۲ ـ ۲۳/۲/۱۹۹۲ دا بەدەستی خۆی کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا. هەزاران چرا لەسەر گۆری پیرۆزی بێ.

**(۷) ـ (ئەم ژێدەرەی خوارەوە لە مانگی یەکی ۲۰۰۱ دا نووسراوە)**

ـ ئەوکاتەی کە ئەم سەمینارە پێشکێش کرا هێشتا **بەرێز ئۆجەلان** لە **سووریا** دەرنەکرابوو و نەهاتبووە **ئەورووپا**. کە هاتە ئەورووپا لەبارەی مافی کوردەوە پرۆژەیەکی پێشنیاز کرد وەك **ئۆتۆنۆمی کولتووری** وابوو. دوواییەکە گیرا و خرایە زیندانی **ئیمرالی** یەوە، وازی لە ئۆتۆنۆمیش هێنا و داوای **«مافی خوێندن و نووسینی کوردی کرد لە سنووری کۆماری دێمۆکراتی ترك دا»**.

جەمال نەبەز

# بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کورد وپێشبینییەکی دوارۆژی

وتارێکی سەمینارییە لە رۆژی یەک شەممەی ١١/ ١٠/ ١٩٩٨دا لە لەندەن پێشکێش کرا بە بۆنەی کۆتایی هاتنی جوارەمین کۆنگرەی نیشتمانی کوردستانەوە کە لە ١٠-١١/ ١٠/ ١٩٩٨ لە لەندەن بەسترا. تەواوی ئەم سەمینارە لە سەر ڤیدیۆ ولە مەڵبەندی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە لەندەن دەست دەکەوێ.

# بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کورد و پێشبینی یەکی دووارۆژی!

**وتارێکی سەمیناری یە لە رۆژی یەك شەممەی ١١/١٠/١٩٩٨ دا لە لەندەن پێشکێش کرا بە بۆنەی کۆتایی هاتنی چوارەمین کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانەوە کە لە ١٠-١١/١٩٩٨ لە لەندەن بەسترا. تەواوی ئەم سەمینارە لە سەر ڤیدیۆ و لە مەڵبەندی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە لەندەن دەست دەکەوێ.**

- - -

**هاووڵاتە خۆشەویستەکان**

زۆرم پێ خۆشە کە وا ئەم ئێوارەیە لە خزمەت ئێوەی بەڕێزدام. سوپاسێکی گەرم بۆ بەشداریتان لەم سەمینارەدا، کە پاش تەواوبوونی سەرکەوتووانەی کۆڕەکانی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان پێشکێش دەکرێ. بەڕاستی چوارەمین کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان جێژنێکی خۆش بوو، هیوام وایە ئەم سەمینارەش جێی پاشەلەقەی ئەو جێژنە خۆشە بگرێتەوە. سوپاسێکی شیرینیش بۆ هەموو ئەو هاوبیر و دۆست و هاوڕێیانەی کە بەدەست رێکخستنی ئەم جێژنە و ئەم بەیەك گەیشتنەوە ماندوو بوون. هەموو لایەك بەخێرهاتن و سەرچاوان.

**هاووڵاتە بەڕێزەکان**

بەرلەوەی بچینە نێو کرۆکی باسەکەوە، دەخوازم بێژم کە مەبەستم لە گرتنی ئەم سەمینارە جۆرجۆرانە کە سەر بە فەرهەنگ و کێشەی رامیاریی کوردن، چ لە ئەڵمانیا و چ لە وڵاتەکانی دیکەی ئەورووپادا و، بەدرێژایی سالآنی سالْ، ئەوەیە، کەش و هەوایەکی ئازاد بۆ هاووڵاتە بەڕێزەکان بهێنمەدی، بێ گوێدانە هەڵوێستی تایبەتی و رامیاری و پێوەندیی حیزبایەتی یان، تاکو بتوانن لەبەر رۆشنایی ئەو بابەتانەدا کە دەیخەمە بەردەستیان، بیروڕای خۆیان بەسەربەستی دەرببڕن و بەیەکی بگەیەنن، بەنیازی ئەوەی هەموو بەهەڤڕا هەوڵی لەیەك گەیشتن و لەیەك نێزیکبوونەوە بدەین

و، ئەگەر پێمان کرا، ئەوا بەشداری یەکیش بکەین لە دۆزینەوەی چارەسەرێکی ژیرانە بۆ دۆزی ئاڵۆزی کورد. رێی راستیش ئەوەیە کە بێ سڵەمینەوە پەنجە بخەینە سەر کەموکورتی و ناتەواوی و هەڵەکانمان، بەڵام بەنیازی پڕکردنەوەی کون و کەلەبەری هەڵوێست و کردار و راستکردنەوەی باری لاسەنگ و چاکەخوازی، نەك بەنیازی ملشکاندنی یەکدی.

**هاوولاتە خۆشەویستەکان!**

وەك دەزانن، ئەوا خەریکە سەتەی بیستەم بەرەو تەواوبوون دەچێ. پێم وایە سەتەی بیستەم گرنگترین سەتەی ئەم دووهەزار ساڵەی ساڵژمێری فەرەنگی بووە. سەتەی بیستەم سەتەی داهێنانی مەزن بوو لە دەڤەری زانست و تەکنۆلۆژی و پیشەسازی دا. سەتەی بیستەم سەتەی شەڕە زرتانێی سارد و گەرمی گەلان و نەتەوەکانی جیهان بوو بۆ سەروەرێتیی ناسیونالّ و، وەدەسهێنانی دەسەلاتی ئابووری و ستراتیژی، لە پاڵ خۆشاردنەوەدا لە پشت پەردەی ئیدیۆلۆژیای رەنگاورەنگەوە. سەتەی بیستەم سەتەی هەڵگیرسانی دوو جەنگی جیهانیی تەفروتووناکەر و چەند جەنگێکی سەختی نێوچەیی بوو، کە جەنگی جیهانیی یەکەم، بەنەمانی ئیمپراتۆرێتیی حەوت سەت ساڵەی عوسمانی و دروستبوونی ئیمپراتۆرێتیی سۆڤیێت و، دووەمین جەنگیش بەفراوان بوونی ئیمپراتۆریی سۆڤیێت کۆتایی هات، کە ئەورووپای رۆژهەلاتیشی گرتەوە. سەتەی بیستەم سەتەی سەرکەوتن و ژێرکەوتنی ئیدیۆلۆژیای کۆمۆنیستێتی و نازێتی و بەهێزبوونی ئیدیۆلۆژیای ئیسلامەتی بوو. سەتەی بیستەم ئەو سەتەیە بوو کە عەرەب و ترك و فارس توانیان بەیارمەتی بەرەی رۆژاوا و رۆژهەلات، دەوڵەتی ناسیونالّی خۆیان دروست بکەن و کوردستان لە نێوخۆیاندا زۆرکارانە و داگیرکەرانە دابەش بکەن. جا هەتا ئەو هەندازەیەی کێشەکە پێوەندیی بە کوردەوە هەبێ، دەتوانین بێژین کە سەتەی بیستەم، سەتەی دامەزراندن و رووخاندنەوەی سێ کیانی کوردیی کەم خایەن بوو. هەر لەم بوارەدا دەتوانین بێژین کە دامەزراندنی هەرێمێك بە نێوی **«هەرێمی ئاسایش»** ەوە بۆ پاراستنی بەشێك لە کوردی باشووری کوردستان، پاش پەلاماردانی **عێراقی سەددام** بۆ سەر **کوێت** و دەرپەڕاندنی لە لایەن **ئەمریکا** و هاوپەیمانەکانییەوە، گرنگترین و تاك هەڵکەوتووترین رووداوی ئەم سەتەیە بوو لە

کوردستان و لە خۆرهەڵاتی ناڤین و بگرە لە جیهانیشدا، پاش دروستبوونی[9] دەوڵەتی **ئیسرائیل لە ١٩٤٨**دا. لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە ئیسرائیل لە کوردستان بچوێنم. نەئ. بەهیچ جۆر. مەبەستم لەم بەراوردە تەنیٚ خستنە بەرچاوی سەختی و زەحمەتی لەدایکبوونی دەوڵەتێکە بە نێوی ئیسرائیلەوە لە نێو زەریایەك دوژمن و ناحەزدا. ئەگەر لەوەش بگەڕێین کە ئیسرائیل یەکان بەر لە هەموو شتێك خاکێکیان پەیدا کرد لەسەری بژین و، زمانێکی مردوویان زیندوو کردەوە قسە بکەن پێی. هەمووشیان چەند ملیۆنێکی کەم بوون و، بەتەواوی جیهاندا پەرشوبڵاو. ئەمە لە کاتێکدا کە کورد خاکێکی پان و فراوان و بەپیتی خۆی هەیە لەسەری دەژی و، زمانێکی زیندووی هەیە بەکاری دەهێنیٚ و، بە ژمارەش دەهێندەی خەڵکی دەوڵەتی ئیسرائیلە. کە واتە لێرەدا مەبەستم بەراوردکردن نییە بۆ وەك یەکی، بەڵکوو بۆ نیشاندانی سەختیی هاتنە کایەی دەوڵەتی ئیسرائیلە.

شایانی باس ئەوەیە، چ فەرمانداریٚتیی باشووری کوردستان کە دوایی بوو بە شانشین بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموودی بەرزنجی (حەفید)، کە ئەویش یەکەمین کیانی ناسیونالٚ بوو لە هەموو رۆژهەڵاتی ناڤین دا و، چ حکوومەتی رۆژهەڵاتی کوردستان بە سەرۆکایەتیی پێشەوای شەهید قازی محەممەد، چ حکوومەتی کوردستانی سۆر (١) بە سەرۆکایەتیی کوردی سەر بە پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێت، هەروەها حکوومەتی **«هەرێمی ئاسایش»** بە سەرۆکایەتیی پارتی دێمۆکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، **هەرچواریان پاش جەنگ و لە ئەنجامی جەنگەوە هاتنە کایە.** فەرمانداریٚتیی باشووری کوردستان و حکوومەتی ئۆتۆنۆمی کوردستانی سۆر پاش جەنگی جیهانیی یەکەم، ئەمیان بە پشتگیریی بەریتانیا و ئەوی دیکەشیان لە لایەن سۆڤێتەوە بوو. حکوومەتی کۆماری کوردستان پاش جەنگی جیهانیی دووەم، بەچاوپۆشیی سۆڤێتەکان و، **«هەرێمی ئاسایش»** یش راستەوخۆ لە لایەن هێزەکانی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، بە تایبەتی بەریتانیا و فەرەنسا و، بە یارمەتی ئەمریکا و دەوڵەتی ترکی تورگوت ئوزال، هاتنە دامەزراندن. بەکورتی: **سازبوونی ئەم کیانانە بەهۆی هەل و مەرجی دەرەکییەوە بوو، نەك لە رێی سەرکەوتنی شۆرشێکی کوردیی گەلێر، یان دیپلۆماسێتیی کورد، یان لە ئەنجامی دەنگ وەرگرتنێکی**

**دێموکراتییەوە لە نێو ئەو دەوڵەتانەدا کە کوردستانیان دابەشکردووە.**

لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە، خودێ نەخوازە، بێژم نەتەوەی کورد خەباتی نەکردووە و تێ نەکۆشاوە. نە . مەبەستم ئەوە نییە. بێ گوێدانە شێوە و کاکڵی خەباتی کۆمەڵ و حیزبە سیاسییەکانی کوردستان و پێشمەرگە و گێریلا و راستی و ناڕاستیی کار و کردایان، ئاشکرایە کە رەشوڕووت و هەژاری کورد، بەتایبەتی لەم سەتەیەی دووایی‌دا، قوربانی زۆر گەورە و گرانیان داوە، بەڵام ئەوەی کە ئەورۆ دەستکەوتووە بەرویووی راستەوخۆی ئەو قوربانییە نییە و، بە هیچ جۆرێکیش لە گەڵ چەندایەتیی ئەو قوربانییە هاوسەنگ نییە. **«هەرێمێکی ئاسایش»** بەبێ کەرکووک و دیالە و مووسل و کووت، کە تەنێ ٤٠٪ی سەرزەوی باشووری کوردستان دەگرێتەوە، **بەرامبەر بە دوو ملیۆن شەهید لەم سەتەیەدا: شەهیدی «ئەنفال» و گازی ژەهراوی و گەلکوژی لە دەرسیم و هەڵەبجە و زەردیئاوا (قەراخ) و بادینان و سەردەشت و کەرکووک و خانەقین و مەهاباد و ئامووده و سنە و قامیشلی و ئامەد (دیاربەکر) و شرناخ و لجێ و لاچین و، ماڵکاولی جەنگی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران و، وێرانکردنی نێزیکەی دەهەزار گوند و، بە عەرەب و ترك و فارس کردنی گەلێ نێوچەی کوردستان لە باکوور و لە باشوور و لە رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی کوردستاندا و، دەرپەڕاندنی چەند ملیۆنێك کورد لە وڵاتەکەی و، هاڤیکردن و ناچارکردنیان بەژیانی دەربەدەری و کوڵەمەرگی و سووکایەتی، دیارە «هەرێمیکی ئاسایش» پاداشی ئەم هەموو قوربانییە گەورە و گرانە نییە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا دیارییەکی چاوەڕوان نەکراوی یەکجار بەنرخ و هەڵکەوتووە و، برشتی بەپێزی هەل و مەرجی دەرەکی کوردستانە، کە دەبێ بەهای بەتەواوی بزانرێ و، سووت وەربگیرێ لێی! ئەگەرنا ئەویش لە دەست دەچێ و «سێمینەی حەدیس» روو دەدا لێمان (٢).**

**هاووڵاتە بەڕێزەکان!**

کورد لەم سەتەیەدا سێ جار هەل هەڵکەوت بۆی کە خۆی سەربەخۆ بکا، بەڵام هەلی یەکەم و دووەمیانی بەتەواوی دۆڕاند. **سەردەمی بیستەکان، سەردەمی رووخانی ئیمپراتۆرێتی ی عوسمانی، سەردەمی شێخ مەحموودی نەمر و سەید رەزا و قۆچگیری و شێخ سەعیدی پیران و شێخ قادری مەزن، سەردەمی پەیمانی سێڤر، لە دەست چوو.** هەروەها سەردەمی نیوەی یەکەمی چلەکان، واتە سەردەمی داگیرکردنی

ئێران لە لایەن سوێندخۆران (بەریتانیا و سۆڤێت) و دەرفەتی دامەزراندنی **کۆماری کوردستان، سەردەمی پێشەوا قازی محەممەد** ... ئەمانە تێ پەڕین. واخەریکە هەلی سێیەمیش لە دەست دەچێ، بەهۆی ناکۆکی ی حیزبەکانی کوردستان و کەمی هەستی بەرپرسیاری و کورت بینی دەسەڵاتدارانی کورد.

ئەم نابەرپرسیارێتییە، ناکۆکی و دوژمنایەتییەکی شێتگیرانەی لە نێوانیاندا پەیدا کردووە و، گەیشتووەتە بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکی لەدەستدا بوو لە دژی یەك و، ڕەوابینیی ناشیرینترین نێو و نەتۆرە و جنێوی سارد و سووك بەرامبەر یەك و، پەنا بردنە بەر هەزاران بوختان و درۆ و دەلەسە، هەر یەکە بۆ نزمکردنەوە و ریسواکردنی براکەی خۆی.

ئەز لە کاتێکدا دڵخۆشی خۆم بەرامبەر بەم ڕێککەوتنەی دوایی پارتی و یەکێتی لە واشنتۆن لە ١٧ی ئەیلوولی ئەمساڵدا دەربڕیوە و دەردەبڕم، خەفەت و دڵە ڕاوکە و پەژارەی خۆشم ناشارمەوە، چونکە دەزانم هەموو کاتێك فریشتەی بەخت یاری کورد نابێ، تاکو زلهێزێکی وەك دەوڵەتی ئەمریکا بکەوێتە نێوان سەرکردەکانی کوردەوە و ئاشتیان بکاتەوە لە گەڵ یەك و پێیان بێژێ **«یەك بگرن، بۆئەوەی بتوانین پتان پارێزین»!** ئایە ئەم قسەیە مانای ئەوە نییە ئەگەر بێتوو شەڕ و بشێوی هەڵگیرسێتەوە، مانی **«هەرێمی ئاسایش»** و لە گەڵ ئەویشدا ئەو پزیسکە هیوایەش دەکوژێتەوە کە ئەورۆ کەوتووەتە گیانمان؟ ئایە پێویست نییە جەماوەری کورد ئامادە بکرێ بۆ ئەوەی تفێك لە نێوچەوانی هەموو شەڕخوازێك بکەن و، ڕێ لە هەموو تێکرژان و ئاژاوەیەکی نێوخۆیی بگرن، تا ئەمجارەش مایەمان نەبێتە مایەی پیڤاز فرۆش؟

## هاوولاتە بەرێزەکان

ئێمە ئەورۆ لەم سەمینارەدا ـ وەك پێویستی یەکی سەرشانمان ـ خۆمان بە ڕۆنکردنەوەی بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کوردەوە خەریك دەکەین، تا بزانین ئێمە لە نێوخۆماندا لە چ ئاستێکدا وەستاوین و، شان بە شانی ئەوەش بزانین هەڵوێستی هێزە دەرەکی یەکان بەرامبەرمان چییە، تا لەو گۆشەیەوە تەماشایەکی دوارۆژی خۆمان بکەین.

بەر لە هەموو شتێك دەبێ بزانین، کاتێك گەلێك یان نەتەوەیەکی ژێردەستەی

وەك کورد، دەیەوێ خۆی لە بندەستی رابسکێنێ، پێویستە جارێ بزانێ چ دەخوازێ، ئەوجا بەدووای رێیەکدا بگەرێ بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجە. راستە، **نەتەوەی کورد بە گشتی، وەك هەموو نەتەوەیەکی رووی زەوی، دەیەوێ بە ئازادی بژی و سەربەخۆ بێ و هیچی لە خەڵکی دیکە کەمتر نەبێ. ئەمەش ئاواتی راستە خەڵکەکەیە.** بەلاّم نەتەوەی کورد، وەك کۆمەڵگە، خاوەنی ڤین «ارادە» ی خۆی نی یە و رێکخراوەکانی کوردستانن کە دەسەلاّتی جێبەجێکردنیان گرتووەتە دەست و، بە نێوی نەتەوەی کوردەوە قسە دەکەن و، خۆیان بە نوێنەرانی نەتەوەی کورد دەژمێرن. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە رێکخراوەکانی کوردستان تا ئێستە رێك نەکەوتوون لەسەر ئەوەی بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد چی باشە و چی لە دەست دێ و چ دەبێ بکرێ و کەینێ بکرێ و چ رێ یەك دەبێ بگیرێتە بەر.

**هاوولاتە بەرێزەکان!**

ئەم بارە نالەبارەی ئەورۆی کورد، لە لایەکەوە پێوەندیی یەکی راستەوخۆی بە رەوشی دەروونی ی کۆمەڵگەی کوردەوە هەیە، کە رێ رێ یی و دوودڵی و باوەڕ بەخۆنەکردن و خۆ بەکەم زانینی لای کورد بە گشتی و، لای سەرکردەکانی بەتایبەتی، دروستکردووە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئاسنامەی ئاست و جۆری رۆشنبیری ئەوانە پێشان دەدا کە رێکخراوەکانی کورد دەبەن بەرێوە. چونکە هەر رۆشنبیری یە، کە شێوەی هەڵسووکەوتی تاك و کۆمەڵگە و، دان و ستاندنیان لە گەڵ رووداوەکانی ژیاندا دیاری دەکا.

ئەگەر سەرنجێکی رابردوو بدەین، کە ناچارین بیدەین، دەبینین سیاسەتکارانی کورد و رێکخراوەکانی لە باشوور و لە باکوور و لە رۆژهەلاّت و لە رۆژئاوا دا، لە کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەمەوە تا پەنجا ساڵ دووای ئەوەش، ئەگەر باسێکی مافی کورد کرابێ، پێیان لە ئۆتۆنۆمی بەولاوە رانەکێشاوە و، زۆر بە توند و تیژی و بێ ویژدانانە بەربەرەکانێی هەموو ئەوانەیان کردووە، کە وێراویانە دەم لە سەربەخۆیی کوردستان بدەن. جا ئەم رێکخراوانە هەر چەندە بە نێوی کوردستانەوە نێو نراون، بەلاّم هێندێك لە کاربەدەستەکانیان لە داگیرکەرانی ترك و عەرەب و فارس توند و تیژتر و بە پەرۆشتر بوون بۆ پاراستنی سنوورە دەستکردەکانی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان داگیر کردووە. **ئەگەرچی هەر خۆشیان ئەو سنوورانەیان بەکار و کرداری**

**نارەوای ئیمپریالیستەکان داوەتە قەڵەم. لە گەڵ ئەوەشدا چەپڵەیان بۆ برایەتیی ئاغا و نۆکەرانەی کورد و داگیرکەرانی وڵاتەکەی لێ داوە.** هەر لە ئەنجامی ئەو رۆشنبیری یە نابابەتانە و نارەسەن و خواستراوەشەوە، پشت بەخۆ نەبەستووانە، وەك دەروێشی حاڵ لێهاتوو، سلاوتیان لە دیاری رژێمی تێرۆریست و دوژمن بە ئازادی و دوژمن بە کوردی سۆڤیێت و هاودەستەکانی داوە و، مرۆڤ خۆر و کورد کوژێکی وەك **ستالین ـیان بە رێبەر و پێشرەوی گەلان و رزگارکەری کورد داوەتە قەڵەم.** فەرموو، وەرن گوێ بگرین بزانین دوو هۆنەری ناسراوی کورد **هەژار** و **دلزار**، کە هەردووکیان تەمەنێکیان لە سیاسەتکاری دا بردووەتە سەر، لە بارەی ستالین و رژێمی سۆڤیێتەوە چی یان گوتووە:

**هـەژار** دەفەرمێ:

**کـــوردە! دەتـــەوێ ببـی ســـەربـەخـــۆ؟**
**هـــەســـتـــە، راپـەڕە، رووکـەرە مـۆسـکـۆ،**
**درۆ و هـــەلاتـــە ســـانـفـرانـسـیسکـــۆ،**
**بـژی ستالیـن، خـۆش بێ چـەکـوش و داس،**
**لە ژێـر ئیـستبداد کـوردی کـرد خـەلاس (۳)**

**دلـــزاریش** فەرموویەتی:

**ئـەرێ ئـای ستـالیـن، ستـالیـن، ستـالینی بـەرز**
**پـێشڕەو و رێـبـــەری گـەلانـی رووی ئـــەرز**

هەروەها فەرموویەتی:

**ستـالیـن پـێشـەوایـە، بـــۆ کـــورد وەك قــەلایـە**
**دەســا هـەڵکـەن ئـالایـــە، ئـەورۆ بـەرلیـن گیـرایە**

سیـاسـەتکاران و خـوێندەوارانی خۆ بە رۆشنبـیـرزانی کـورد، هەڵگری ئەم بیروبۆچوونە بوون. واتە بە پیرۆزدانان و بردنە ئاسمانی رێبازی مارکسیتی. ئەوجا چ مـارکـسـێتی یەك؟ ئەمـانە وەنەبێ چووبن مـارکـسـێتی یان لە سەرچاوەکـەیەوە وەرگـرتبێ، واتە لە ئەورووپاوە، **چونکە سەرچاوەی مـارکـسـیزم ئەورووپایە، نەك ئەنقـەرە و بەغـدا و تاران و دیمـەشق و باکـۆ.** ئەمـانە لە باتی ئەوەی بچن، لە

بارودۆخی کۆمەڵگەی ئەورووپایی ئەو سەردەمە بکۆڵنەوە کە **مارکس و ئەنگلز** تێیدا ژیاون و، **ئەوجا ئەو مارکسێتی یە بە بیری کورد و بە پێی کۆمەڵگەی کورد چەکوشکاری بکەن و بیگونجێنن لە گەڵ بارودۆخی کوردستان** و، بەو پێیە **«حیزبێکی کۆمۆنیستی کوردستانی»** دروست بکەن، چوون لە باتی ئەمە بیری مارکسیزمی ساختەی سۆڤێتی یان لە دەسکەلا عەرەب و ترك و فارسەکانی مۆسکۆوە وەرگرت، کە ئەمانەش بەدەم مارکسیست و بەکردەوە ئیمپریالیست و شۆڤێنیست و دوژمنی کورد بوون. ئەرێ، ئاوا ئەم مارکسێتی یە زرکە زڕەیان کرد بە بەر بزووتنەوەی کوردایەتی دا و، ئەوە بوو پەنجا ساڵ ئەم بیرە تاریکە پووچەڵە، بوو بە قورئانە ڕەشەی بن هەنگلی چینی خوێندەوار و سیاسەتکاری کورد و بنەمای ڕۆشنبیری یان و، ئەمەش ڕاستینەیەکی ڕۆنە و زۆر شەرم و شوورەیی یە کە ئێمە چاوپۆشین لێی و، ئازایانە دانی پێدا نەنێین. **چاوپۆشین لە ڕاستینەی ڕووداو، خەیانەتە لە مێژوو.**

ئێستە تکایە گوێ بگرن بزانن **پارتی دێمۆکراتی کورد** (ئەو دەم هێشتا پارتی دێمۆکراتی کوردستان دانەمەزرابوو)، چۆن دەوڵەتی سۆڤێتی بە ئاڵاهەڵگری سۆسیالیزم دادەنا و، بەرژەوەندیی کوردی دەکرد بە قوربانی بەرژەوەندیی سۆڤێت، ئەوەش بە شایەتیی یەکێك لە دامەزرێنەران و سەرکردە ناسراوەکانی پارتی، بەڕێز **عەلی عەبدولا** کە دەبێژێ:

**«سێ یەمین کۆنگرەی پارتی دێمۆکراتی کورد کە لە ١٩٥٣/١/٢٦ دا لە کەرکووك بەسترا، بڕیاری دا بیری «مارکسیزم لێنینیزم» بکاتە ئیدیۆلۆژی خۆی و، دانی نا بەوەدا کە هەر کاتێك (بەرژەوەندیی) بزووتنەوەی کوردایەتی لە گەڵ بەرژەوەندیی بزووتنەوەی سۆسیالیزم و نێونەتەوەیی جیهان (واتە بەرژەوەندیی دەوڵەتی سۆڤێت! ج. ن) پێچەوانەی یەك وەستان، ئەوا پێویستە واز لە بەرژەوەندیی بزووتنەوەی کوردایەتی بهێنرێ»** (عەلی عەبدولا: **مێژووی پارتی دێمۆکراتی کوردستان**، لە لایەن ڕێکخراوی پارتی دێمۆکراتی کوردستان لە ئەورووپا بلاو کرایەوە، مارتی ١٩٧١، ل ٤٩).

ئەز کە ئەم ڕاستی یانە وا بێ پەردە دەخەمە بەرچاو، مەبەستم ئەوە نییە سەر و گوێلاکی کەس بکوتم، یان پاشقول لە کەس بگرم. ئەم قسانە بۆ ئەوە ناکەم کە کای کۆن بەبا بدەم، بەڵکوو دەمەوێ گزی و فزی لە مێژوو نەکەم. ئەو شتانەی ڕوویان

داوە، چاك بن یان خراپ بن، هەموو بەشێکن لە مێژووی نەتەوەکەمان و، ئەزژی بە فەرمانی ویژدان و هەستی زیندووی خۆم تۆماریان دەکەم، ئەگەرنا مەبەستم ئەوە نییە بێژم سەرکردەکانی کورد و خوێندەوارانی کورد هەموو ناپاك و خاین و خۆفرۆشن. نەخێر. سەرکردەکانی کورد، ئەگەرچی هێندێکیان دەوری هەلپەرستانەیان نواندووە و دەینوێنن، بەڵام ناپاك و سیخوڕ و خۆفرۆش نەبوون و نین. ئەمانە پێیان وابووە و پێیان وایە، ئەو رێیەی ئەوان گرتوویانە راستە و، لەم رێ یەشدا گەلێك زەحمەتیان کێشاوە. زانا و دیپلۆمات و سەرکردەی کورد، **ئەوڕەحمانی قاسملوو**، لە پێناوی کورد دا شەهید کرا. هەزاران چەپکە گوڵی گەش پێشکێش بە گیانی پیرۆزی بێ. ئەز لە کاتێکدا کە بیری ئەو رۆژانە دەکەمەوە کە لە **قوتابخانەی دووانێوەندیی موسەللای کەرکووك مامۆستا بووم و شەهید ئەوڕەحمانی قاسملوو** بە دەستێ جلکی چلکن و جووتێ کلاشی شڕەوە، بە پێ، رێی دوور و درێژی ترسناکی بڕی بوو، هاتبووە لام بۆ باسی یارمەتیدانی حیزبی دێموکرات، بە مەبەستی دەرخستنەوەی رۆژنامەی **«کوردستان»** کە بە پشتگیریی ئێمەی کوردی نەتەوەیی ی ئەو رۆژە، جارێکی دی ژیایەوە (٤)، قەدری خەباتی ئەم کوردە هەڵکەوتووە بەرز رادەگرم، بەڵام کە باسی لایەنی باش و کردەوەی چاکی شەهید قاسملوو دەکەم، نابێ چاو لەوە بپۆشم کە **شەهید قاسملوو** ماوەیەکی ژیانی خۆی وەك ئەندامی حیزبی توودەی ئێرانی سەربە سۆڤێت و دژ بە کورد بردە سەر و، هەتا دواڕۆژی ژیانی لە مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد، پتر نەچوو بەولاوە. بێجگە لەوەش، چۆن دەبێ چاو لەوە بپۆشم کە سەرکردەیەکی زانا و ناسراو و جیهان دیتووی وەك **قاسملوو**، هێندە خۆی سووك بکا، لە گەڵ سیخوڕێکی گچکەی رژێمی داگیرکەر بکەوێتە وتووێژ، ئەویش بێ پاسەوان و لە کۆنە خانوویەکی ڤیەننادا، تا نامەردانە بیکوژن و خوێنی ون بکەن. هۆنراوەیەکی فۆلکلۆری کوردی هەیە بە سەر قاسملوودا دەچەسپێ:

**نە شێرێ کوشتی و نە شێرەوانێ هەتیوێك کوشتی، لە لا کوڵانێ**

جا ئێستە ئەگەر ئەمە خۆکەم بینین و خۆ بە بچووك زانین نەبێ و، بەرەی بەرامبەر بە گەورە و زل دانان نەبێ، چی یە؟

**مام جەلال و کاك مەسعوود** هەر دووکیان دوو سەرکردەی سادە و بێ فیز و بێ

هەوا و خاکین، لە گەڵ هەموو کەسێك ئامادەی هەڵسوکەوتن. خۆ ئەگەر کاربەدەستێکی بیانی گچکە بێتە لایان، ئەوا رێزێکی زۆری لێ دەنێن. بەلاّم دەبێ **دەوڵەتێکی زلهێزی وەك ئەمریکا** تکایان لێ بکا، ئەوجا بچن بۆ **واشەنتن** و، لەوێ دەست بدەنە دەستی یەك و پێکەوە دابنیشن. بەڕاستی جێی داخە کە کورد براکەی خۆی بە هیچ نازانێ، با براکەشی زانا و ئازا و کار لەدەستهاتووش بێ، چونکە کورد خۆی بە کەمتر دەزانێ لە بێگانە و بە بچووکتر لە داگیرکەرانی ولاّتەکەی.

ئەرێ، ئەنجامی ئەم خۆکەم بینیە بوو کە سەرکردەیەتیی هوردەبۆرژوای کورد کەوتە وەرگرتنی ئەم بیروبۆچوونە خواستراوە و، لەوەشەوە **فەریکە مارکسیێتی** بوو بە بەرگی بەلەشەوە چەسپیوی بزووتنەوەی کوردایەتی بۆ ماوەی نیو سەتە و، **بیری سەربەخۆیی ی کوردستان** کە تا کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم درۆشمی سەرکردەیەتیی کلاسیکی کورد بوو، هاتە گۆڕان و بوو بە ئۆتۆنۆمی، کە ئەمەش مانای وایە کە سەرکردەیەتیی هوردەبۆرژوای کورد دەستی لەو مافە هەڵگرت کە کورد نەتەوەیەکی بەزۆر دیلکراوە و ولاّتەکەشی بەزۆر دابەشکراوە و کراوەتە کۆلۆنی یەکی ئینتەرناسیونالی و، کوردی کرد بە **«کەمایەتییەك» و «براپچووکێکی» داگیرکەرانی خاکەکەی و، دۆزەکەشی کرد بە دۆزی «نێوخۆیی ی» دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، نەك دۆزێکی کۆلۆنیالیستی ئینتەرناسیۆناڵ و داخوازیی مافی بڕیاری چارەنووس.** لێرەدا ببوورن کە ئەم باسە درێژە پێ نادەم، چونکە لە گەلێك شوێنی دیکەدا بەدووروردرێژی بە رەچەڵەکیدا چوومەتە خوارێ. گوێگری بەڕێز دەتوانێ تەماشای ئەو باسە بکا کە بە کوردی و ئەڵمانی لە بارەی **«گۆڤاری نیشتمان» و کۆمەڵەی «ژێکاف»** ـەوە لە سالی ١٩٨٥ دا بلاّوم کردووەتەوە، هەروەها ئەو باسەی لە سەر **«گۆڤاری یەکێتیی تێکۆشین»** و بیروبۆچوونی هوردەبۆرژوای مارکسیستی کورددەوە لە سالی ١٩٨٨ دا بلاّو کراوەتەوە.

بەڵێ ... ئەم بارە نالەبارە درێژەی کێشا هەتا دەوڵەتی سۆڤیێت، پاش حەفتا سالّ درۆ و دەلەسە و خاپاندنی ملیۆنان خەڵك، لە پڕ تلیسایەوە و، وەك شێرە بەفرینە توایەوە و، بەناخی زەوی دا چووە خوارەوە. ئەوەش چارەنووسی هەموو دەوڵەتێکی دەستکردە و، نوخشەش بێ لەوانی دیکە، بەتایبەتی دەوڵەتە دەستکردە داگیرکەرەکانی کوردستان. **ئەوجا لە ورگی ئەو سۆڤیێتە زلهێزە، ئەم رووسیایەی ئەورۆ**

**دەرفرتا، کە خەڵکەکەی خەریکە لە برساندا دەمرن. بۆریس یەلتسین** یش هەر ڕۆژە نارۆژێك سەرۆك وەزیرێك دەردەکا و یەکێکی دیکە دێنێ و هیچیشیان باری کەوتووی دەوڵەتیان پێ هەڵناگیرێتەوە.

خوێندەوارە، گوایە مارکسیستەکان و سیاسەتکارانی کورد، پاش هەرەسهێنانی کەڵەکەترەی سۆڤێت و دەسکەلاکانی لە ڕۆژهەلاتی ئەورووپادا، سەری لووتیان دای لە بەردی ڕۆژگار و ئەوجا هەلپەرستانە بایان دایەوە و کەوتنە ڕەخنەگرتن لە یەکێتی سۆڤێت و ڕژێمی سۆڤێتی و روویان کردە **بەرەی ڕۆژئاوا، ئەو بەرەیەی کە تا دوێنێ بە ئیمپریالیست و سەرمایەداری خوێنمژ و بەرەی شەڕ هەڵگیرسێن دایان دەنا**. هێندێکیان زۆر بێ شەرمانە هەموو گۆتارۆی کەوتنی سۆڤێتیان خستەملی **گۆرباچۆفی گوایە «خاین»**، بێ ئەوەی بەدوو ووشە ڕەخنە لە خۆیان و لە پێکهاتەی بیروڕای زرك و زۆڵەکەی خۆیان بگرن کە سالانی سالْ نێوی **کوردستانی سۆریان نەدەهێنا**، نەوەك دەوڵەتی سۆڤیەت، خودێ نەکا، بەداگیرکەر بدرێتە قەڵەم. ئەوەتە زۆربەی گەلانی سۆڤێت گەیشتنە دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیان، کورد نەبێ، کە **خاکەکەی ئازەریەکان و ئەرمەنیەکان لرفیان دا**. پاش ئەوەش، پتر لە جاران، خۆیان بەستەوە بە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە و، هەر لایەکیان بەلایەکەوە گیرسانەوە، وەك ئەوەی رزگاری ی کورد بەلای داگیرکەرانی کوردستانەوە بێ و، ئێستەش پاش پەنجا سالْ و پاش ئەم هەموو تاقیکردنەوە و ئەزموونە چرووپرانە، بە بۆنە و بێ بۆنە ئاشکرا دەبێژن کە داوای دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان ناکەن، چونکە دامەزراندنی کوردستان بەلای ئەوانەوە خەیاڵە و هەموو باسێکیان باسی **«یەکێتیی خاك»** ـی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانە. هەر با بە نموونە گوێ رابگرین لە بەرێزێك کە نێوی **«شەمێران عێزەت»** ە و ئەوەی لە ڕۆژنامەی **«کوردستانی نوێ»** (چاپی دەرەوە، ژمارە ٥٦ی ڕۆژی ١٩٩٨/٩/١١) دا فەرموویەتی:

**«شەمێران عێزەت» پاش باسکردنی پیلان و نەخشەی بەعەرەبکردنی کورد لە دەوڵەتی عێراقدا، دەنووسێ: «... ئەمەش سووربوونی عێراق دەگەیەنێ لە سەر ئەوەی کە لە ڕاستیدا و بە پێی تێڕوانینی ڕەگەزپەرستانەی، کورد بە میوان دەزانێ لە عێراقدا و پێویستە لەو ناوچانە نەمێنێ کە تێی دا دەژین. ئەم تێڕوانینەش دژی**

**بیروبۆچوونی برایەتی کورد و عەرەب و خزمەتی یەکپارچەیی خاکی عێراق ناکات کە مەبەستی هەموومانە».**

سەیرکەن، ئەم بەرێزە بۆ برایەتی یەك فرمێسك هەڵدەرێژێ کە هیچ کاتێك نەبووە و ئێستەش نییە و تا عێراقیش وا بەم شێوەی ئەورۆ بمێنێ ناتوانێ ببێ. ئەم بەرێزە خەفەت بۆ یەکپارچەیی خاکی عێراقێك دەخوا، کە ئەوەتە بەعس بە هەموو هێزێکی یەوە هەوڵ دەدا بۆی ... **ئەو یەکپارچەیی یەی عێراق، کە ئەگەر نەبوایە نە «ئەنفال» دەبوو و نە هەڵەبجە و زەردیشاوا و بادینان و سەردەشت و گەلێك شوێنی دیکەی کوردستان دەکەوتنە بەر پەلاماری چەکی کیمیایی و، نە شەنگار و کەرکووك و مووسل و مەخموور و خانەقین و کووت دەکران بە عەرەب.** سەرەڕای ئەمەش ئەم بەرێزە هێندە زات دەداتە بەرخۆی کە بێژێ **«یەکپارچەیی خاکی عێراق ئاواتی هەموانە»** واتە، هێشتا هەر بە بیروبۆچوونی **«حیزبی پێشرەو»**، بە نێوی هەموانەوە قسە دەکا، بێ پرس و را بەکەس.

شایانی باسە کە لەم پەنجا ساڵەی دوایی پڕ لە خاپاندن و سەرلێشێواندن و رێ پێهەڵە کردنی جەماوەری کورددا، حیزبەکانی کوردستان جاروبار لە بلاڤۆکەکانیاندا باسی **«بڕیاری چارەنووسی کورد»** یان کردووە، بەڵام بەکارهێنانی ئەم مافەشیان هەر بە سنووری ئەو دەوڵەتەوە بەستووەتەوە کە بەشە کوردستانەکەی داگیر کردووە. واتە مافی بڕیاری چارەنووس لە سنووری عێراق، یان دەوڵەتێکی دیکەدا. کە ئەمەش، خۆی لە خۆیدا، گاڵتە کردنێکە بە مافی بڕیاری چارەنووس کە دەبێ بۆ ویستەی گەلی کورد خۆی بە جێ بهێڵرێ. بێجگە لەوەش هەر لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵەدا دوو رێباز خۆیان لە هێزەکانی دیکەی کوردستان جیا کردەوە، یەکێکیان **رێبازی کاژیك** بوو، ئەوی دیکە **رێبازی پێ کێ کێ.**

**کاژیك** هەر چەندە وەك رێکخراو لە ١٩٥٩/٤/١٤ دا بڕیاری دامەزراندنی درا، بەڵام وەك بیروبۆچوون و فەلسەفەیەکی رامیاریی و رێبازێکی رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی لەم کاتە کۆنترە و دەگەڕێتەوە بۆ نێوەڕاستی پەنجاکان و، بنەماکەی لە سەر بنچینەی قوتابخانەیەکی رۆشنبیریی کوردی دامەزرا کە لە نێو خەڵکدا بە **«هێزی سێ یەم» (واتە نە پارتی و نە کۆمۆنیست)** و لە نێو هاوبیرەکانی خۆیدا بە **«قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم»** نێو دەبرا. ئەم قوتابخانەیە لە پرۆسەی

توێژینەوەی بیروبۆچوونی سۆسیالیستانە و رەخنەگرتن لە رژێمی سۆڤێت و هاودەستەکانی هاتە کایە. **بە پێی ئەم قوتابخانەیە تاکە تایبەتکار و سروشتێکی مرۆڤ کە نەمر و جیهانی و گشتگر بێ، تەنێ ئازادییە. جا چونکە ئازادی وەك تەندروستی وایە، دیارە پلە پلە ناکرێ و زۆر و کەمی هەڵناگرێ.** واتە کاتێك ئازادی بوونی هەیە، کە لە شێوەی تەواوەتی دابێ، وەك تەندروستی. **بۆوێنە هەر کەسێك کەمێك ناتەندروست بێ، نەخۆشە. ئەو کەسەی کەمێکیش نائازاد بێ، دیلە.** کە واتە: ئازادی کاتێك بوونی دەبێ کە لە دۆخی یەکسانی دا بێ. بە کورتی: ئازادی و یەکسانی لە یەك جیا ناکرێنەوە و، هەردووکیان تەواوکەری یەکن، وەك پارچە پارەیەك کە هەر دوو دیوەکەی پێویستی یەك و تەواوکەری یەکن. جا ئەگەر ئەم بیروبۆچوونە لە بارەی نەتەوەکانی جیهانەوە بخرێتە کار، مانای وایە نەتەوەکانی جیهان کە هەموویان مافی ئازادییان هەیە، دەبێ لە بارەی دەسەڵاتەوە وەك یەك بن، واتە یەکسان بن، تا ئازادی مانای هەبێ. چونکە ئازادی کەم و زۆری هەڵناگرێ، بۆ وێنە: **تۆ ناتوانی بێژێت ژنەکەت کەمێ زگی پڕە، چونکە زگ پڕی شتێکە یان هەیە یان نییە، کەموزۆری تێدا نییە. هەروەها ناتوانیت بێژیت باوکم کەمێك مردووە، چونکە مردن شتێکە یان هەیە یان نییە، کەموزۆری تێدا نییە. کورت و کرمانجی: کاتێك کورد دەتوانێ دەست لە سەربەخۆیی و دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆی هەڵبگرێ و، بە ئۆتۆنۆمی رازی بێ، کە عەرەب و ترك و فارسیش بە "ئۆتۆنۆمی" ئەو نیوچانە رازی بن کە خۆیان لە سەری دەژین. ئەگەر وانەبێ، مانای پلە پلەکردنی ئازادییە، چونکە "سەربەخۆیی" بۆ وان(ترك و فارس و عەرەب) و "ئۆتۆنۆمی" بۆ کورد، مانای نایەکسانییە، واتە نەبوونی ئازادی بۆ کورد و بوونی ئازادییە بۆ وان (ترك و عەرەب و فارس) و، کوردیش دیارە بۆ دیلێتی مل نادا. ئەمەش پوختەی بیری کاژیکە لە بارەی بابەتی نەتەوەوە.**

جا لە بەر ئەوە، کاتێك کاژیك باسی بڕیاری چارەنووسی دەکرد، لە ئازادییەوە دەستی پێدەکرد، واتە دەنگدانی نەتەوەی کورد بۆ بڕیاردان لەسەر دیاریکردنی دوارۆژی خۆی، کە ئەو بڕیارەش دەبێ لە ئازادیدا بێ و بۆ ئازادی بێ. مەبەست لە دەنگدان لە ئازدی دا ئەوەیە کە جەماوەری کورد نەکەونە ژێر شەوت (تاثیر) و کارکردی هیچ جۆرە گوشارێکی دەروونی، یان تەنی، وەك ترسی تۆڵە لێسەندنەوە،

هەروەها فریودان و ڕێ پێ هەڵەکردن. بێجگە لەوەش ئەو بڕیارەی کە دەدرێ دەبێ هەر بۆ ئازادی بدرێ. جا چونکە ئازادی ناتوانێ دژی ئازادی بێ، واتە دژی خۆی بێ، دیارە مرۆڤی ئازاد بۆی نییە دژی ئازادی خۆی بێ، یان دژی ئازادی کۆمەڵگەکەی خۆی دەنگ بدا. بە کورتی، دەبێ بڕیاری چارەنووس لە لایەن کوردەوە لە دژی ئازادی نەبێ، واتە بۆ یەکسانی بێ. دیارە بە پێی ئەم ڕێبازە هەر بڕیارێك کە لە لایەن کوردەوە بدرێ بۆ نایەکسانیی نێوان کورد و گەلانی دەوروبەری، یان هێنانە پێشەوەی سیستەمێکی دیکتاتۆری و ملهوڕی دژ بە ئازادی، **"ڕەوایەتی"** نابێ. **ڕەوایەتیش بنچینەی هەموو جۆرە مافێکە.**

جا هەتا ئەوهەندازەیەی کە باسەکەی ئێمە پێوەندیی بە بۆچوونی ئەم ڕێبازەوە هەیە لە بارەی چینەکانی کۆمەڵگەوە، ئەوا کاژێك جیاوازیی چینایەتی بە نیشانەی نەخۆشی کۆمەڵگە و نایەکسانیی کۆمەڵگە دادەنا. بەڵام پێی وابوو کە جیاوازی چینایەتی لە ڕێی دیکتاتۆرێتی یەوە، وەك **«دیکتاتۆرێتی پرۆلیتاریا» یان «دیکتاتۆرێتی ئایینی»** لاناچێ، بەڵکوو لە ڕێی دێمۆکراتی و سەربەستیی رادەربڕین و بەرزکردنەوەی پلەی ڕۆشنبیریی یەوە بەرەو نەمان دەچێ. هەر بەلای کاژێکەوە ـ بەپێچەوانەی مارکسیستەکانەوە کە تەنێ جیاوازیی دەسەڵاتی ئابووری، جیاوازیی چینایەتی دروست دەکا ـ جیاوازیی پلەی خوێندەواری و بنەماڵەیی و زانستیش جیاوازیی چینایەتی دروست دەکا. واتە خوێندەواران و تەکنۆکراتان و بنەماڵە بەگزادە و ئاغاکانیش هەر یەکە چینێکی تایبەتن، وەك چینی سەرمایەدار و چینی هوردەبۆرژوا و چینی دەرەبەگ. هەر بۆ وێنە ئەو دیکتاتۆرانەی کە لە جیهانی سێیەمدا کاربەدەستن، زۆریان کوڕە هەژار و بەلەنگاز بوون و، پاش ئەوەی چوونە بەر خوێندن، توانیان دەسەڵاتی کۆمەلایەتی پەیدا بکەن و، هێندێکیشیان لە ڕێی کوودەتای سوپایی و هێندێکیشیان لە ڕێی حیزب حیزبێنەوە بوونە فەرمانڕەوا و میری سەربڕ. **سەددامی عێراق و عومەرولبەشیری سۆدان و مەلا عومەری ئەفغانستان و خامنەیی ئێران و دەمیرێلی ترك و زیائولحەقی پاکستان و ساداتی میسر،** چەند نموونەیەکی کەمن بۆ ئەمە.

ئەو نموونانە لە ئەورووپاش زۆرن. بۆ وێنە **گێرهارد شرۆیدەر** کە دەسنیشانکراوی کانسلەری ئەلمانیایە (٥) وەك کوڕی کرێکارێکی هەژار لە دایك بوو، باوکیشی لە

جەنگی جیهانیی دووەمدا کوژرا، دایکی گێرهارد کوڕەکەی بە کارەکەرێتیی مالاَن بەخێو دەکرد، گێرهارد چووە قوتابخانە و کەوتە خوێندنی زاگون «قانوون» و چووە نێو حیزبی سۆسیال دێموکراتەوە و پلە پلە لە حیزبدا سەرکەوت تا لە رێی حیزبەکەیەوە ئەورۆ بووە بە یەکەمین کەسایەتیی دەوڵەتی ئەلمانیا.

جا وەك دەزانن، **کاژێك وەك رێکخراوە**، لە پاش هەرەسهێنانی شۆرشی ئەیلوول نەما، بەلاَم **وەك رێباز**، کە بە رێبازی نەتەوەیی ناسراوە، جێی خۆی لە نێو فراوانترین جەماوەری کورددا کردووەتەوە و، ئەوەتە تەنانەت حیزبەکانیش باسی **رێبازی نەتەوەیی** دەکەن و، بە راستترین رێبازی دەزانن بۆ گەیاندنی کورد بە ئامانجەکانی، ئەگەرچی بەکردەوە نایخەنە کار. شایانی باسە مەبەست لە زاراوەی **«نەتەوەیی» ــ «قەومی یەت» ــ یان «ناسیۆنالیزم» ــ نییە، بەڵکوو نەتەوەیی مانای بیروبۆچوون و سیاسەتکردنێکە کە پڕ بە پڕی بەرژەوەندیی هەموو نەتەوە بێ، نەك بۆ بەرژەوەندیی یەك کەس، یان یەك بنەماڵە، یان یەك حیزب، یان یەك هۆز، یان یەك نێوچە. بیری نەتەوەیی بیرێکی گشتگرە و دژی تیرەگەری و نێوچەپەرستی و رەگەزپەرستی و حیزب حیزبێنە و بنەماڵە پەرستییە.**

ئەمە کاژێك بوو، هەرچی پێ کێ کێ یشە، ئەوا لە سەرەتای دامەزراندنییەوە (لە ١٩٧٧/١١/٢٧ دا) بیست ساڵێك لەمەوبەر و، هەتا دوو سێ ساڵی پێش ئەورۆ، هەر باسی سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد و، زورتریش بۆ کوردستانێکی کۆمۆنیستی هەوڵی دەدا، بێ ئەوەی خۆی بە یەکێتیی سۆڤێت یان چین یان مەڵبەندێکی دیکەی کۆمۆنیستییەوە ببەستێتەوە و پرۆپاگەندە بکا بۆی.

**پێ کێ کێ بە هۆی هەڵگرتنی دروشمی سەربەخۆیی بۆ کوردستان و خەباتی سەخت و قوربانیدەرانەی لە پێناوی بەرزکردنەوەی رادەی هەستی خۆبەکورد زانین دا**، لە لایەن جەماوەری باکووری کوردستان و کوردی ئەورووپاوە، بەتایبەتی ئەلمانیا رێز و قەدرێکی زۆری بۆ خۆی پەیدا کرد. هێندێك هەڵەی گچکە و هێندێك هەڵەی زلی پێ کێ کێ بوونە هۆی بیانوودان بە دوژمنانی و گەلێك زیانیان پێگەیاند. لە گەڵ ئەوەشدا پێ کێ کێ وەك بەهێزترین و دەسترۆشتووترین حیزبی کوردستانی هەرما و توانی خۆی لە هێندێك کەسایەتیی و هێندێك سیاسەتکارانی دەوڵەتانی رۆژهەلاَتی و رۆژئاوایی نێزیك بکاتەوە، بەلاَم گۆڕینی ستراتیژی حیزبەکە لە

سەربەخۆیی کوردستانەوە بۆ فیدەرالی و لە فیدەرالیشەوە بۆ ئۆتۆنۆمی و، ئەوجا بۆ مافی ناسیۆناڵ لە سنووری دەوڵەتی ترکدا و، گۆڕینی پارلەمانەکەی لە برۆکسل **لە "پارلەمانی هەمموو کوردستان لە دەرەوەی وڵات"ەوە بۆ "پارلەمانی باکووری کوردستان"** هەروەها توند و تێژی نواندن بەرامبەر هەمموو بەرهەڵستکەرێك و رەخنەگرێك و تەنانەت دەستوەشاندن لێیان، ئەمانە هەمموو بەبارێکی زۆر خراپەدا بۆ پیێ کیێ کیێ شکاونەتەوە.

جا ئەگەر پەیمانی واشەنتن سەربگریێ و پارتی و یەکێتیی پێکەوە حکوومەتی هەرێمی کوردستان دروست بکەن و پیێ کیێ کیێ و پارتی و یەکێتیی هەوڵی رێککەوتن لە گەڵ یەك نەدەن و، شەڕ و بەیەکدادان دەست پیێ بکاتەوە، ئەوا پیێ کیێ کیێ زەربەی توندی بەردەکەویێ و بەرژەوەندیی کوردیش بەجاریێ دەکەوێتە مەترسییەوە. (٦)

دەمێنێتەوە ئەو بڕیارەی کە پارلەمانی هەڵبژێردراو لە لایەن ٢ ملیۆن کوردی هەرێمی ئاسایش ەوە لە رۆژی ١٩٩٢/٥/١٩ دا، دای بۆ چارەسەرکردنی کێشەی رامیاریی کورد لە عێراقدا لە سەر بنچینەی فیدەرالی. ئاشکرایە کە بڕیاردان بۆ فیدەرالیزم لە دەسەلاتی خەلکی بەشێکی دەوڵەتێکدا نییە. چونکە فیدەرالیزم کاتێك دادەمەزریێ کە هەمموو خەلکی نێو دەوڵەتەکە دەنگی بۆ بدەن و، دەوڵەتەکە ئەو سیستەمە پەسند بکا. بێگومان هەر وەك لە ئێستەوە دیارە، عەرەبەکانی عێراق بە فیدەرالیزم رازی نابن و، ئەمەش بە ئاشکرا و بە دەنگی بەرز دەبێژن و نایشارنەوە. لە بەر ئەوە بڕیاردانی پارلەمانی کوردستان بۆ فیدەرالیزم بیێ ئەنجامە. ئەمە بێجگە لەوەی کە فیدەرالیزم، ئەگەر لە سنووری دەوڵەتێکدا بخرێتە کار، شتێکی هەروەك ئۆتۆنۆمی وایە. تەماشەی ئەڵمانیا بکەن وەك نموونە، ئەوسا تێدەگەن کە ئەم جورە فیدەرالیزمە لە سنووری دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستاندا لە خەون و خەیاڵ بەولاوە هیچی دی نییە. جا ئێستا یەك ریێ دەمێنێتەوە بۆ رێزگرتن لە بڕیاری پارلەمانی کوردستان لە هەرێمی ئاسایشدا، ئەویش ئەوەیە کە پارلەمانی نویێ کاتیێ هەڵبژێردرایەوە لە ساڵی ١٩٩٩دا ـ وەك پێشبینی کراوە ـ **داخۆیانی سەربەخۆیی هەرێم بکا، لە کاتێکدا کە عێراق نەیەویێ بێتە «دوو کۆماری فیدرالی»، هەریەك خاوەنی نوێنەری خۆی لە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا و،**

**هەریەك خاوەنی سوپای خۆی.** خۆ ئەگەر ئەمەش نەکرا، ئەوا با پارلەمانی کوردستان بڕیار بدا کە **«هەرێمی ئاسایش» ببێتە پرۆتێکتۆراتێکی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان.** ئەمەیان هەزار جار باشترە لەوەی کورد بچێتەوە ژێردەستی **سەددام،** یان عێراق، ئەوجا هەر عێراقێك دەبێ با ببێ.

بە سەرنجدانی ئەم باسەی تا ئێستا پێشکێش کرا، دەردەکەوێ بۆمان کە کورد خۆی ئەورۆ لە بەردەم بارودۆخێکدا دەبینێ کە دۆزەکەی هاتووەتە سەر دۆزی ئۆتۆنۆمی، یان شتێکی وەك ئۆتۆنۆمی، واتە کێشەیەکی نێوخۆیی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، نەك کێشەیەکی ئینتەرناسیۆناڵی نەتەوەیەکی چل میلۆنی نیشتمان داگیرکراوی ماف پێشێلکراو. بەکورتی: دروشمی راستەقینەی حیزبەکانی کوردستان لە گەڵ گۆڕەپانی رامیاری لەم پەنجا ساڵەی دووایی دا بە موو نەهاتووەتە گۆڕان، ئەگەرچی جیهان بەنێزیکە لە هەموو لایەکەوە گۆڕاوە، بەڵام کورد بەدەست سەرلێشێوان و دوودڵی و خۆکەم بینینەوە دۆشی داماوە.

**بەرێزینە**

ئەوانەی نووسینەکانی منیان خوێندووەتەوە و شارەزای بیروبۆچوونی منن، دەزانن کە ئەز لەم ٢٥ ـ ٣٠ ساڵەی دووایی‌دا زۆرتر هەوڵمداوە رۆنی بکەمەوە کە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد خەون و خەیاڵە. نەك هەر لە بەر ئەوەی دەسکەوتنی زۆر زەحمەتە، چونکە ئۆتۆنۆمی بەرهەمی سیستەمی دەوڵەتێکی دێموکراتی ئازادیخوازە کە بەشێك لە دەسەڵاتی نێوەندیی (مرکزی) خۆی دەداتە دەست پارچەیەك لەو دەوڵەتە، بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان دابەشکردووە هەموو رژێمی دیکتاتۆرین و هیچ رژێمێکی دیکتاتۆریش ئامادە نابێ دەست لە هیچ بەشێك لە دەسەڵاتی خۆی هەڵبگرێ، جا ئەو دەسەڵاتە دەرەکی بێ یان نێوخۆیی بێ، ئەوە هەر یەکە، مەگەر لە ژێرباری زۆری گوشاردا. بەڵام مەسەلەکە هەر لێرەدا ناوەستێ، **چونکە لەوانەیە داگیرکەرێکی کوردستان لە بارودۆخێکی تایبەتیدا دان بە «ئۆتۆنۆمی» دا بنێ، بەڵام هەرکاتێك هەل هەڵکەوت بۆی، دەیسێنێتەوە. تاقیکردنەوەی فەرمانداریتیی کوردستان بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود کە جۆرە دەوڵەتێکی ئۆتۆنۆمی دار بوو،** کۆلۆنیالیستەکانی بریتانیا دابوویان، ئەوە بوو هەر لە لایەن بریتانیاوە وەرگیرایەوە. **کوردستانی سوور کە دەوڵەتی دیکتاتۆری سۆڤێت**

دابووی، لە لایەن ستالینی تێرۆریستەوە هەڵوەشێنرایەوە و بەخشرا بە ئازەرییە فاشیستەکان. ئۆتۆنۆمی باشووری کوردستان، کە بەپێی رێککەوتننامەی ۱۱ی مارتی ۱۹۷۰ بەعسیە عەرەبەکان دابوویان، هەر لە لایەن بەعسیەکان خۆیانەوە هەنگاو بە هەنگاو وەرگیرایەوە و دەفن کرا. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە **ئۆتۆنۆمی لەوانەیە دەست بکەوێ، بەڵام لە سنووری دەوڵەتێکی ملهوڕ و دیکتاتۆردا ناپارێزرێ و راناگیرێ.** چونکە کورد دەسەڵاتی سوپایی و هێزێکی دەستوەشێنی وای نییە کە ئەو ئۆتۆنۆمییە بپارێزێ. کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی داریش مافی ئەوەی نییە، وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ ببێتە ئەندامی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، تاکوو بتوانێ داوا لە ئەنجومەنی زێرەوانی نێونەتەوەیی بکا بیپارێزێ. ئەمە بێجگە لەوەی کە هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی داری کوردستان، لە سنووری دەوڵەتانی عەرەب و ترك و فارس دا، تەنانەت ئەگەر ئەو دەوڵەتانە دێموکراتیش بن، کە نابن، ئەوا هەرێمە ئۆتۆنۆمی دارەکە بەرە بەرە پڕ دەبێ لە عەرەب و ترك و فارس و لە سەرخۆ و، بە پێی پێویستی یە ئابوورییەکان، دێمۆگرافی نێوچە کوردییەکە دەگۆڕدرێ و، ئەو دەمە جیابوونەوەی زۆر زەحمەت دەبێ.

**کە واتە یەکەمین هەنگاو بەرەو ئامانج ئەوەیە، کورد جارێ لە سەر ئەوە رێکبکەون کە چییان دەوێ.** خۆ ئەگەر مەبەست ئۆتۆنۆمییە، ئەوا هەرکەس بچێتەوە ماڵی خۆی و، چاوەڕوانی ئەوە بکا تا ئەم دەوڵەتانە دەبنە دەوڵەتی دێموکراتی، ئەوجا هەوڵی ئۆتۆنۆمی بدرێ. بەڕاستی نەك هەر حەیف و مخابنە کە بۆ ئۆتۆنۆمی ئەم هەموو قوربانییە بدرێ، بەڵکوو نابەرپرسیاری و بگرە تاوانباریشە بەرامبەر جەماوەری کورد کە نابێ درێژەی پێ بدرێ.

لەوانەیە هەبن بێژن کە حیزبەکانی کوردستان ناتوانن باسی سەربەخۆیی بکەن، چونکە هیچ لایەك لە نێوچەکە و لە جیهاندا بە سەربەخۆیی کوردستان رازی نابێ. ئەم بیانووە هەتا هەندازەیەك ژیربێژانە دیارە، بەڵام ئەو پرسیارەی لێرەدا دێتە گۆڕێ ئەوەیە، ئایە ئێمە دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە خەڵك، بە تایبەتی داگیرکەرانی کوردستان، بێن باسی سەربەخۆیی وڵاتەکەمان بکەن و، هەوڵ بدەن بۆی، ئەوجا ئێمە زات بکەین باسی بکەین؟ یان ئەوەی ئێمە خۆمان داوای سەربەخۆیی وولاتەکەمان بکەین و تێبکۆشین بۆی و بیکەین بە ماڵ بەسەر خۆمانەوە و بیبەینە

مێشکی خەڵکەوە کە ئەم داخوازییە شتێکی ئاسایی و ڕەوایە؟ لە گەڵ ئەمەشدا ئەگەر بێژین حیزبەکانی کوردستان لەبەر هەر هۆیەك هەیە با ببێ، ناتوانن، **ئەی خۆ دەتوانن باسی بڕیاری چارەنووس بکەن، بێ ئەوەی مەرج دابنێن بۆی**، یان بیبەستنەوە بە سنووری دەوڵەتێکەوە لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان. بڕیاری چارەنووس پرنسیپێکی نێونەتەوەییە و کەس ناتوانێ بە ئاشکرا لاری هەبێ لێی. کە ئەمان باسی بڕیاری چارەنووسیان کرد، ئەوجا هەر لایەنە دەتوانێ بەجۆرێك لێکی بداتەوە وەك خۆی دەیەوێ. خۆ حیزبەکان ئەمەیان لە دەست دێ و دەشبێ بیکەن. چونکە ئەگەر نەیکەن، ئەوا دیارە ڕەنجی کورد و ڕەنجی چەند ساڵەی خۆشیان بەفیڕۆ دەدەن. شتێکی دیکەش هەیە پێویستە بێژم، باشە، وا ئەوان ناتوانن باسی سەربەخۆیی کوردستان بکەن، خۆ ئەوەیان لە دەست دێ کە **«پاکانە»** بۆ خۆیان نەکەن کە داوای دەوڵەتی کوردستان ناکەن، وەك دەوڵەت دروستکردن بۆ کوردی خاوەن مێژووی چەند هەزار ساڵە و لە سەر خاکی خۆی ژیاو تاوان بێ و ئەمان «بێز» بکەنەوە لێی. پێ دەچێ بێژن، باشە ئەگەر هاتوو پرسیار کرا لێمان لە بارەی «دەوڵەت» دروستکردنەوە، ئەوسا چی؟ باشە ئەگەر هاتوو یەکێك پرسیاری کرد لێیان، ئایە حیزبەکەیان داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکا یان نا، پێی بێژن کە سەربەخۆیی کوردستان بڕیارێکی چارەنووسانەیە و ئەوەش بە دەست نەتەوەی کوردە، نەك بەدەست یەك حیزب و ئەم بڕیارە دەبێ دابنرێ بۆ نەتەوەی کورد. ڕاستییەکەشی هەر وایە. حیزبێك هەر چەندە جەماوەری زۆر بێ و پان و پۆڕ بێ، ناتوانێ ببێ بە نوێنەری چل ملیۆن کورد و بە نێوی کوردەوە بڕیاربدا.

**لەبەر ئەوە دەبێ حیزبەکان و کۆمەڵەکان و ڕێبازەکانی کوردستان بە زووترین کات لە کۆنگرەیەکی نەتەوەییدا ساخی بکەنەوە چییان دەوێ و بە تەمای چین، تا ئەوەش ساخ نەکرێتەوە، قسە لە ڕێ و شوێن ناگرێ بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجە.**

**ئەمە یەکەمین هەنگاوە کە دەبێ حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان و کورد بینێن. دووەمین هەنگاویش کە تەواوکەری هەنگاوی یەکەمە، ئەوەیە کە حیزبەکان و ڕێبازەکان هەموویان خەریکی کاری ڕامیاریی بن. واتە دەست لە کاری سوپایی و پێشمەرگەیەتی و گێریلایەتی بکێشنەوە.**

کۆتایی سەتەی بیست، وەك ساڵەکانی پەنجاکان و شەستەکان و تەنانەت حەفتاکانیش نییە. لەو سەردەمانەدا دەتوانرا بە **هێزی پێشمەرگەیەتی (لێدە و ڕاکە)** گەلێك دەسکەوتی سوپایی بهێنرێتە دەست. ئەوڕۆ تەکنیکی سوپایی زۆر پێشکەوتووە و، شەڕ شەڕی ئازایەتی و ڕۆستەمی نییە، بەڵکوو شەڕی تەکنیکە. ئەوی ئەو تەکنیکەی نەبێ و پێی هەڵ نەسووڕێ، ئەوا شەڕ دەدۆڕێنێ. لە شەستەکاندا کە سوپای ڕزگاری کوردستان بە ڕێبەری **بەهەشتی سەرۆك بارزانی** کەوتبووە کار، لەوانە بوو گەلێك سەرکەوتن بهێنێتە دەست، ئەگەر هێزە ڕامیارییەکانی کوردستان لە نێوخۆیاندا یەکگرتوو بوونایە و، هێندێکیان بە فەرفێڵی دوژمنی داگیرکەر هەڵنەخلەتانایە و نەچوونایەتە پاڵی و، هەروەها لە سەرکردایەتیی بارزانی دا مرۆڤی خراپ و دووڕوو و دووزمان و هەڵمەتە کاسە و ئاژاوەگێڕ و برا لە برا هاندەر نەبوونایە و، شۆڕشیش هەموو گیانێکی بە یارمەتیی دەرەوە نەبووایە و، پشتی بە خۆی و بە دەسەڵاتی ماکی و میناکی خۆی ببەستایە. بەلاّم ئێستە ئەوە بووە بە مێژوو و، لێرە جێی ئەو باسە نییە. ئەوەی پێویستی بە گوتنە لێرەدا ئەوەیە، تاقیکردنەوەی ئەم چل ساڵەی دوایی کە شەڕی پێشمەرگەیەتی لە گەلێك لای کوردستاندا هەڵگیرساوە و درێژەشی هەیە، دەری خست کە کورد لە باری سوپاییەوە زۆر دوواکەوتووە، وێنەیەکی ئەم دوواکەوتنەش ئەمەیە، ئەوەتە کورد لەم ماوە دوور و درێژەدا کە حیزبەکان سەریان کردووە بە کۆشی گەلێك دەوڵەت و ڕژێمدا، کەچی تا ئەوڕۆ نەیانتوانیوە نەك هەر تاکە یەك فڕۆکەوان، یان بەکارهێنەری چەکی قورس پەروەردە بکەن، بەڵکوو فیشەکێکیشیان پێ دروست ناکرێ. **لە کاتی پەلاماردانی هێزەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران بۆسەر پێگە (پادگان)ی مەهاباد و دەست گرتن بەسەر گەلێك چەکی قورس دا، دەرکەوت کە کادری سوپایی نەبوو ئەو چەکانە بەکار بهێنێ. ئەم داماوییە لە بەهاری ساڵی ۱۹۹۱ دا جارێکی دی ڕووی دایەوە، بەلاّم ئەمجارە لە باشووری کوردستاندا دووپارە بووەوە، کاتێ کە ڕاپەڕینی خەڵکی باشوور** ڕێی کردەوە بۆ دەستگرتنی جەماوەر بەسەر چەکی قورسدا، وەك تۆپی دوورهاوێژ و تەنانەت فڕۆکەی جەنگی لە کەرکووك و سلێمانی و هەولێر. ئەوەبوو لە بەر بێ کادری هێندێك لەو چەکانە سووتێنران و شکێنران و هێندێکیشی لە کاتی گەڵڕەوەکەی خەڵکی باشووردا بە جێمان و جارێکی دی کەوتنەوە دەست لەشکری

عێراق. لێرەدا شتێکم دێتەوە بیر کە لەو کتێبەدا خوێندمەوە کە بە نێوی **"مۆساد لە عێراق و دەوڵەتەکانی دراوسێیدا، هەرسهێنانی ئاواتەکانی کورد و ئیسرائیل"** باسکراوە. ئەم کتێبە لەلایەن **«شلێمۆ نەکدیمۆن»**ەوە نووسراوە کە یەکێکە لە شیکەرەوە سیاسیە یەکانی ئیسرائیل و یەکێکە لە بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەی **"یەدیعوت ئەهارۆنۆت"**. کتێبەکە بە زمانی عیبری نووسراوە و لە لایەن **بەدر عەقیلی** (بدر عقيلی) یەوە کراوە بە عەرەبی و لە **عەممان (ئەردەن)** لە لایەن **"دارالجليل"**ەوە لە ١٩٩٧ دا چاپکراوە. نووسەر دەبێژێ: **«کوردەکان نەیاندەتوانی نەخشەی سوپایی بخوێننەوە. لە نێو سوپای پێشمەرگەیەتی سەرۆك بارزانی دا تاکە یەك ئەفسەر هەبوو کە بتوانێ نەخشەی جەنگی بخوێنێتەوە، ئەویش عەقید روکن ئەزیز ڕەشید ئەکرەیی (عزیز عقراوی) بوو. هەروەها دەبێژێ «کورد ئازا و شەڕکەرن بەڵام لە تەکنیکی شەڕ بێ ئاگان.»**

ئەرێ ... زۆری و بۆری چەکدارانی کورد هەر لە سەرەتای شۆرشی ئەیلوولەوە کە لە ٩ یان ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ەوە دەستی پێکرد و هەتا ئەوڕۆ درێژەی هەیە، گەلێك گێرە و کێشەی بۆ حیزبەکانی کوردستان دروستکردووە. ڕاکردنی زۆرکەس بۆ نێو پێشمەرگە، نەك هەر خزم و کەس و کارەکانی ڕاکردووەکانی تووشی گرتن و شکەنجە و کۆچ پێدان و نان بڕین و ڕاگواستنەوە کردووە، بەڵکوو حیزبەکانی کوردستانیشی ناچار کردووە کە پتر چاوەڕوانی دەستی داگیرکەرانی کوردستان بن بۆ مسۆگەرکردنی نان و جلك و چەك و تەقەمەنی و خزمەتی بژیشکی بۆ پێشمەرگەکانیان. **لە بەر ئەوە هەتا هێزی چەکداری کورد بەو شێوەیەی ئێستەی بێ و، جیا نەکرێتەوە لە حیزبەکان و نەکرێتە هێزێکی سەربەخۆی ڕێك و پێکی نەختوپوخت، بە سەرکردەیەتی ئەفسەر و فەرمانداری سوپایی ڕاستەقینە کە تەکنیکی سوپایی یان خوێندبێ و، بە بیروبۆچوونێکی نەتەوەییەوە بجووڵێنەوە، ئەوا هێزی چەکداری کورد هیچ سوودێکی نابێ، بەڵکوو زیانیشی دەبێ. بەتایبەتی هەر کۆمەڵە پێشمەرگەیەکی سەر بە حیزبێك دێتە بەکارهێنان و دەخرێتە دەستوەشاندن لە دژی پێشمەرگەی حیزبێکی دیکە و دەکرێتە تەڵاشی خۆشکردنی ئاگری شەڕی براکوژی.**

هەر لەم بوارەشدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ڕاستییەك بکەم، ئەمەش

ئەوەیە کە **کێشەی کورد راستە لە بنەڕەتدا کێشەیەکی رامیارییە و کورد خۆشیان هەروای تێدەگەن و تێی گەیشتوون، بەڵام داگیرکەرانی کوردستان بە کێشەیەکی رامیاری نازانن، بەڵکوو بە کێشەی یاخی بوون و هەڵگەڕانەوە لە رووی دەوڵەت و بە جەردەیی دەدەنە قەڵەم و، زۆر بێشەرمانە بە «تیرۆریزم» ـی دادەنێن و، لە رێی بەکارهێنانی زۆرەوە چارسەری دەکەن، واتە کردوویانەتە کێشەیەکی سوپایی.** لێرەدا دەمەوێ بەرپەرچێکی ئەو قسەیەش بدەمەوە کە لە نێو کورددا باوە کە گوایە **«کورد هیچ کاتێك بەشەڕ نەیدۆڕاندووە و، هەر لە گۆڕەپانی رامیاری دا دۆڕاندوویەتی.»** ئەم قسەیە درۆ و پووچەڵ و چەواشە کەرانەیە، کورد بە زۆری لە مەیدانی شەڕدا دۆڕاندوویەتی، هەر کاتێکیش لە مەیدانی جەنگدا پێشڕەوی کردبێ، ئەوا دوژمنەکانی ناچاربوون بە راست بێ یان بە درۆ، سەر بۆ هێندێك لە داخوازییەکانی شۆڕ بکەن. سەرکەوتنی کورد لە شەڕی چیای هەندرێن و کۆرەك دا لە مانگی گولانی سالی ١٩٦٦ دا ـ ئەو شەڕەی کە سوپای عێراق هەر لە باپشتیان(بافستیان) ی نێزیك دیانە ١٩٩٦ لاشەی سەربازەکانی ناشت و لە ١٩٦٥/٤/٤ ەوە تا ١٩٦٦/١/١٧ شەش هەزار سەربازی عێراق لەوانە ١١٥ ئەفسەر کوژران، وای لە حکوومەتی عێراق کرد بە سەرۆکایەتی **مامۆستا ئەورەحمان بەزاز (عبدالرحمان البزاز) کە لە ١٩٦٦/٦/١٥ دا کۆنفرانسێکی رۆژنامەیی بگرێ و بەزاز بە دەمی خۆی بێژێ: «عێراق هەر وڵاتی عەرەب نییە، وڵاتی عەرەب و کوردە» (رۆژنامەی «العرب» ژمارە ٦٠١، بەغدا ١٩٦٦/٦/١٦**، بەڵام هەر ئەو بەزازە بەرێزە پاش چەند مانگێك دووای ئەوە، پاش ئەوەی شەڕ وەستێنرا و رژێمی عێراق تیشکی کەسکی لە مۆسکۆوە بۆ هات، بۆ یارمەتیدانی عێراق بە چەك و، بەزازیش لە سەر کار لابرا لە لایەن ئەفسەرە ناسیۆنالیستە عەرەبەکانەوە، هەر ئەو بەزازە گوتی: **«ئەو مافانەی ئەو بەڵێنی دانی بە کورد داوە، پرۆگرامی حکوومەتەکەی وی بوون، حکوومەتێکی دی کە پاش ئەو هاتووەتە سەرکار، دەروێستی (ملتزم) ئەوە نییە ئەو پرۆگرامە جێ بە جێ بکا» (التاخي)** ژمارە ٦٢ سالی (١) بەغدا ١٩٦٧/٧/٢).
**هەروەها سەرکەوتنی پێشمەرگەی کورد بە سەر لەشکری تاوانباری عێراقدا لە زستانی ١٩٦٩/١٩٧٠ دا، رژێمی بەعسی عێراقی ناچار کرد، دان بە «مافی ئۆتۆنۆمی کوردستانی عێراق» دا بنێ کە تا ئەو دەمە بەعس وشەی کوردستانی بە**

**سەردەمدا نەدەهات.** هەر دووای ئەو ڕێککەوتنە بەعسی یەکان کەوتنە وەرگرتنەوەی ئەو مافانە. **جارێك بە هەوڵدان بۆ کوشتنی سەرۆك بارزانی و جارێك بە چوونە مەکۆوە بۆ ئیدریسی کوڕی** و، هەتا ئەوەی لە بەهاری ١٩٧٤ دا شەڕیان تازە کردەوە و، بە هەرەسهێنانی شۆڕش لە بەهاری ١٩٧٥ دا، ئۆتۆنۆمیش هێدی هێدی وەك ڕێککەوتننامەکە گۆڕی ون بوو.

جا وەك لەمەو بەر گوتم، **حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**، پاش شۆڕشی ئیسلامی دەستی گرت بە سەر **پێگەی مەهاباد** دا و گەلێك چەکی قورسی دەستکەوت و ژمارەیەکی زۆر شەڕکەری لە دەور کۆبووەوە و، بۆ ماوەیەك تەنگیان بە ڕژێمی خومەینی هەڵچنی. ڕژێمی خومەینی ناچار بوو بکەوێتە باسی **«خودگەردانی» واتە (خۆگێڕان)**، بەڵام کە حیزبی دێموکرات لە ئەنجامی شەڕی نێوخۆیی نێوان دێموکرات و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان و پارتی دێموکراتی کوردستانی عێراق و هەڵوێستی دوژمنانەی حیزبی توودە و دەستێوەردانی دووزمانانەی **«فەدای یانی خەلك» (فدائیان خلق)**، حیزبی دێموکراتی کوردستان لە باری سوپایی یەوە بێ هێز بوو، ئەوسا باسی **«خۆگێڕان»**یش پێچرایەوە. لێرەدا دەبێ ئەو ڕاستییەش بخەینە بەرچاو کە سەرکەوتن لە مەیدانی چەکداری دا پارمەتییەکی گەورەیە بۆ سەرکەوتن لە مەیدانی رامیاری و دیپلۆماسێتی دا. چونکە بەرەی سەرکەوتوو پتر قسەی دەڕوا لە بەرەی ژێرکەوتوو. هەر لەبەر ئەوەشە داگیرکەرانی کوردستان دەیانەوێ **بەهێزی چەك** بزووتنەوەی کوردایەتی سەرکوت بکەن و ناچنە ژێرباری دیالۆگ (وتوویژ)ـەوە، چونکە دەزانن بەشەر هەموو کاتێ دەرەقەتی کورد دێن. **ئەوەش دەزانن کە رازی بوون بە وتوویژ لە گەڵ کورد، بەمانای داننانە بە بوونی دژی کورددا وەك هێزێکی لە وتووێژدا بەشداربوو بەرامبەر بە خۆیان.** دیارە کە وابوو، ئەوڕۆش نەبێ، سبەینێ ناچار دەبن مافێك بۆ کورد دەسنیشان بکەن. شەهیدکردنی زانا و سیاسەتکاری کورد **ئەوڕەحمانی قاسملوو** لە سەر مێزی وتووێژ، بەڵگەیەکی گەشە بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونە. **کە واتە داگیرکەرانی کوردستان وتووێژیان ناوێ، تا ناچار نەکرێن بە وتووێژ کردن. لەبەر ئەوە پێویستە کورد هەوڵی ئەوە بدا ئەم دەوڵەتانە ناچار بێن بە وتووێژ کردن لە گەڵ کورد وەك لایەنێك لە کێشەکەدا.** بەڵام وتووێژ نەك بە دژی و

فزی و لە چاوگە خانوویەکی شاری ڤیەننا، یان پێتەختەکانی داگیرکەراندا، ئەوەی سەرکردەیەکی کورد لە گەڵ سیخوڕێکی تاوانباری دەوڵەتێکی داگیرکەردا بکەوێتە چرپە چرپ، بەڵکوو وتووێژ دەبێ بە ئاشکرا لە نێوان سەرکردایەتیی هەردوو لادا بێ و بە بەشداربوونی چاودێرە ئینتەرناسیۆنالییەکان و گەرەنتی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و، بە نووسینی رەسمی بێ (٧). جا چونکە دەسەڵاتی سوپایی کورد ئەورۆ بایی ئەوە نییە بە زۆر داگیرکەرانی کوردستان ناچار بکا بکەونە وتووێژی لەم بابەتەی باسمان کرد، پێویستە بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کورد رێ یەکی دیکە بدۆزێتەوە و بیگرێتە بەر بۆ گەیشتنە ئەم ئەنجامە. ئەو رێیەش بە بیری من ئەوەیە کورد سووت لە هەل و مەرجی هەرێمی و نێوچەیی و جیهانی وەربگرێ کە ئەورۆ رەخساوە بۆی. بە تایبەتی بوونی **«هەرێمی ئاسایش»** وەك هەرێمێك بەدەست کوردەوە بە بڕیاری کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و، بە پارێزگاریی لەشکری ئەمریکا و بریتانیا، دەرفەتێکی باشە بۆ کەوتنە سەر رێی بەرەو ئەو ئامانجە. **بۆیە ئەو رێککەوتننامەیەی کە لە نێوان پارتی و یەکێتی دا لە واشنتن لە ١٧ی ئەیلوولی ئەمساڵدا ئیمزا کرا بە بەشداری رەسمیی دەوڵەتی ئەمریکا، هەنگاوێکی یەکجار گرنگە لەم رووەوە، کە دەبێ بپارێزرێ و بەهێز بکرێ و بکرێتە بناخەی گەلێك کاری مەزن.** جا بۆ ئەوەی ئێستا باشتر لەو دەرفەتانە بگەین کە دەتوانن لە دوارۆژ دا بڕەخسێن بۆمان، پێویستە لە سەرمان سەرنجێکی ئەو هەل و مەرجانەش بدەین کە هاتوونەتە گۆڕێ، واتە چاوێك بگێڕین بە بارودۆخی ئەو هێزە دەرەکییانەدا کە پێوەندییان بە دۆزی کوردەوە هەیە.

**دیارە نێزیکترین هێزی دەرەکی کە راستەوخۆ پێوەندیی بە بارودۆخی کوردەوە هەیە، داگیرکەرانی کوردستانن.** واتە: دەوڵەتی ترك، لە پشت ئەویشەوە، ترکە تۆرانییەکانی ئازەربایجانی ئێران و ئازەربایجانی کۆنە سۆڤێت و تۆرانییەکانی باشووری کوردستان و قوبرس. ئەوجا دەوڵەتی عێراق و سووریا و لە پشت وانیشەوە شۆڤێنییە عەرەبەکانی هەموو دەوڵەتە عەرەبەکان و، هەروەها رژێمی ئێران و لە پشت ویشەوە فارسە تەنگەتیلکە شۆڤێنییەکان کە سەری زمان و بنی زمانیان **«تمامیت ارضی»** (**تەواوێتیی خاك**) ە و، لەم دواییەشدا فارسە شۆڤێنییەکانی تاجیکستان و ئەفغانستان و شیعە تەنگە تیلکەکانی پاکستان و، ئەوجا هەموو ئەو موسوڵمانانەی

کە بە موسوڵمانی بنچینەگر (فوندامەنتالیست) ناویان رۆیوە و، هەوڵی دامەزرانی **رژێمێکی مەلا فەرمانی دەدەن.**

یەکێك لە تایبەتکارەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و، تەنانەت هێندێك لەو دەوڵەتانەش کە پشتگیریان دەکەن، وەك پاکستان و ئەفغانستان و ئازەربایجان، ئەوەیە کە هەموویان دەوڵەتی ناسیۆنالی گەلێکی بچووکن لەو گەلانەی لە سنووری ئەو دەوڵەتەدا دەژین و، هەمووش دەوڵەتی دەستکردن، واتە هیچیان بە شێوەیەکی خۆرسکی نەهاتوونەتە بوون. **کوردستان، بەپێچەوانەی ئەو دەوڵەتە دەستکردانەوە، مێژوویەکی چەند هەزار ساڵە و کولتوورێکی چەند هەزار ساڵەی هەیە و، بەشێوەیەکی خۆرسکی و لە سەرخۆ هاتووەتە بوون. کوردستان راستینەیەکی دیرۆکی و جوگرافیایی و فەرهەنگی یە، لە کاتێکدا ئەم دەوڵەتە ناسیۆناڵە دەستکردانە هیچیان تەمەنیان لە ٨٠ ساڵێك تێپەڕناکا و، هەموو بەشێوەیەکی ناخۆزا و لە ئەنجامی فرتوفێڵی کۆلۆنیالیستەکانی ئەورووپا و دەوڵەتە پیشەسازەکانەوە پاش جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەم تەپکە تەپکە سازدراون و لە هێندێ لاوە سنوورە ساختەکانیان بە راستە بۆ کێشراوە. تکایە تەماشایەکی سنووری عێراق و ئەردەن و سووریا و ... هتد بکەن. جا لەبەر ئەوەی ئەم سنوورانە دەستکرد و نائاساییین، ئەوا هەموو کاتێك مەترسیی هەڵوەشاندنەوە دەکرێ لێیان. ئاشکرایە تاکە رێیەك بۆ پاراستنی ئەم سنوورانە، بەکارهێنانی زۆر و لەشکرکێشی و خوێنڕێژییە. هەر سەبارەت بەوەشە کە لەم دەوڵەتە ناسیۆنالانەی عەرەب و ترك و فارس دا، سیستەمی دێموکراتی و پلۆرالیستی نایەنە سەرکار و ناشتوانن بێنە سەرکار. خۆ ئەگەر بێنە سەرکار، ئەوا ئەو دەوڵەتانە، وەك دەوڵەتی ناسیۆنالی عەرەب و ترك و فارس لە نێو دەچن. داگیرکەرانی کوردستان ئەوە باش دەزانن، بۆیە نەلە رابوردوودا و نەلە کاتی ئێستەدا، رێیان بە هیچ سیستەمێکی دێموکراتی نەداوە و نایدەن و لەمەو بەدوواش هەر نایدەن. ئەوە باش دەزانن کە تەنانەت ئەگەر دێموکراتیش نەبێ و، کورد بەم جۆرەی ئێستەی لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە، ئەوا رۆژێك دێ کە ژمارەی کورد لە ژمارەی گەلە داگیرکەرە سەردەستەکانی پتر دەبێ. بۆوێنە، بەپێی سەرژمێرێك کە کراوە، لە ساڵی ٢٠٢٠ دا ژمارەی کورد لە نێو دەوڵەتی ترك دا لە ژمارەی ترك پتر دەبێ. لەبەر ئەوە ئەم دەوڵەتە داگیرکەرانە تاکە**

**چارەیەك بۆ مان و راگرتنی دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان لە تەفر و تووناکردنی کورددا، واتە لە گەلکوژی دا دەبینن. کورت و کرمانجی: کێشەی کورد بووەتە کێشەیەکی سوپایی کە هەوڵدەدرێ لە رێی بەکارهێنانی چەکی کۆکوژەوە، وەك گازی ژەهراوی و چەکی میکرۆبی و تیشکی لێزەر و کۆچ پێکردن و زەوی سووتاو و کانی بە ئاوی بە چیمەنتۆ داخراوەوە لە رەگوڕیشەوە بنبڕبکرێ.**

داگیرکەرانی کوردستان لە پاڵ بەکارهێنانی چەکی کۆکوژ و تووناکەردا، رێیەکی رامیاریش بەکار دەبەن، بەوەی هەر دەوڵەتە لە گەڵ کوردی بەشێك، یان چەند بەشێکی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستاندا، پێوەندی دەبەستێ. ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەوە هاتووە کە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بە پێی پێکهاتەی دەستکردانە و رژێمی دیکتاتۆرانە و سروشتی شۆڤێنیستانەیان، لە نێوخویاندا دوژمن بەیەکن، دوژمنایەتییەکی وا کە تاکە نموونەیەکی لە جەنگی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران و لە ئاشتوماشتی (٢٥) ساڵەی دەوڵەتی سووریا و عێراق و هەڕەشە و گوڕەشەی دەوڵەتی ترك لە دەوڵەتی سووریا بەدی دەکرێ. جا پێوەندی هەر دەوڵەتێك لەم دەوڵەتانە بەکوردی ژێردەستەی دەوڵەتەکانی دیکەوە، بەلای دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە، تاکتیکێکی کاتییە و ئامانجی ئەوەیە کورد بکا بەگژ دەوڵەتی دراوسێ نەیارەکەیدا و، کوردی دەوڵەتی دراوسێش بکا بەگژ کوردی ژێردەستەی خۆیدا. خۆ ئەگەر ئەمەشی پێنەکرا، ئەوا بیکا بە سیخوڕ (جاسووس) بەسەریانەوە، یان هەر نەبێ بیانکا بە گژ یەکدیدا. ئەم تاکتیکە شەیتانانەیەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بەلای سیاسەتکاران و حیزبەکانی کوردستانەوە لەسەر بناخەی رفۆکی ئەو بیرۆکە قرچۆکە پووچەڵە دامەزراوە کە دەبێژێ **«دوژمنی دوژمنم دۆستمە»** بۆیە کەوتوونەتە پێشبڕکێ بۆ خزنێزیك کردنەوە لەم دەوڵەتانە. **راستی ـ یەکەی جارێ هیچ مەرج نییە دوژمنی دوژمنەکەی تۆ دۆستی تۆ بێ. دوایی دوژمنایەتی ئەم دەوڵەتانە لە نێوخۆیاندا هەرچەندێك بەتین بێ، بەلای وانەوە هێندە زیانبار نییە وەك ئەوەی دەوڵەتێکی کوردی دروست ببێ،** ئەوجا ئەو دەوڵەتە لە هەر کوێیەك دەبێ با ببێ. ئەم سیاسەتەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان پاش دامەزراندنی **«هەرێمی ئاسایش»** رۆنتر کەوتە ڕوو. هەر چەندە ئێستە دەوڵەتی ترك لە گەڵ پارتی دێمۆکراتی کوردستانی عێراق و، دەوڵەتی ئێران لە گەڵ یەکێتی

نیشتمانیی کوردستان و پی کی کی و، دەوڵەتی سووریا لە گەڵ پی کی کی و یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دێموکراتی کوردستانی عێراق و، دەوڵەتی عێراق لە گەڵ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران و پی کی کی پێوەندییان هەیە، **بەڵام ئاشکراتر لە جاران دەریدەبڕن کە دژی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردن،** ئەوە بوو هەر سێ دەوڵەتەکە **(ترک و ئێران و سووریا)** کە هەرسێکیان بەقسە گوایە دەیانویست پارتی و یەکێتی ئاشت بکەنەوە، کەچی وەزیرەکانی دەرەوەیان، هەرسێکیان لە ١٩٩٤/٨/٢١ دا لە دیمەشق نارەزایی و ناپەسەندی خۆیان بەرامبەر بە **ڕێککەوتنی پاریس لە نێوان پارتی و یەکێتی** دا بە ئاشکرا دەربڕی. ئەوەتە لەم ڕۆژانەدا و پاش ڕێککەوتنی پارتی و یەکێتی و بەستنی **پەیمانی واشەنتن،** دەوڵەتی ترک بەجارێ حاڵی لێهاتووە و دیسانەوە لەشکری کشاندووەتەوە **«هەرێمی ئاسایش»** تەنانەت دەوڵەتی ترک لە داخی ئەوەی کە پارتی و یەکێتی لە واشەنتن ڕێککەوتوون، بێ بەشداربوونی ترک، نوێنەری خۆی ناردووەتە لای سەددام و دەیەوێ سەفیر بنێرێ بۆ بەغدا و پشی پشی بۆ سەددام دەکا، هەرچەندە سەددام بە ترک باوەڕ ناکا و دەست دەنێ بەڕوویانەوە. بێگومان دەوڵەتی ترک بەم کردەوە گەوجانەیەی وا بە ئەمریکا رادەگەیەنێ کە پشت بە ڕژێمی ترک نابەسترێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کێشەی کورد بەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە لە هەموو کێشەیەکی دی گرنگترە و هەموو بەرژەوەندییەکانی دیکە دەکرێنە قوربانی. لە هەمان کاتیشدا مانای وایە کە ڕژێمی ترک دەسکەلای دەستی ئەمریکا نییە، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە کۆمۆنیستەکان و هوردەبۆرژوا مارکسی یەکان پەنجا ساڵ دەیانڕست، بەڵکوو ڕژێمی ترک دادۆشەری ئەمریکایە بۆ بەرژەوەندیی شۆڤێنیستانە و کۆلۆنیالیستانەی خۆی.

**بەرێزینە!**

**یەکێك لە تایبەتکارەکانی ئەم جۆرە پێوەندییە لە نێوان کورد و داگیرکەرانی وڵاتەکەیدا ئەوەیە کە «هەڤاڵبەندی» یەکی کاتییە لە نێوان دەسەڵاتدارێکی داگیرکەر و کەم دەسەڵاتێکی ژێردەستەدا، بەنیازی خاپاندن لە لایەن داگیرکەری دەسەڵاتدارەوە و، بەهیوای دۆستایەتییەکی ئاسەر لە لایەن کەم دەسەڵاتەوە. داگیرکەران ئەم «هەڤاڵبەندی» یە وەك پێوەندییەکی کەم خایەن تەماشا دەکەن،**

**بەڵام هێزە کوردستانییەکان ئەم جۆرە هەڤاڵبەندییە وەك داگیرکەران نابینن، بەڵکوو وەك یەککگرتنێکی ستراتیژانە تێی دەڕوانن. لەبەر ئەوە ئامادەی هەموو جۆرە قوربانی - یەکن لە پێناوی راگرتنیدا**، زۆر جاریش لەسەر حسێبی شکاندن و کەرتکردنی ریزەکانی گەلی کورد، کە بێگومان کەرتوپەرتبوونی ئەو ریزانە یەکێکە لە ئامانجە بنچینەیی یەکانی داگیرکەرانی کوردستان کە بەدەستی کورد خۆی بەئەنجامی دەگەیەنن، بێ ئەوەی هیچ جۆرە داکەوتن (تنازل) ێکی بنچینەیی بۆ کورد بکەن. بۆ وێنە: لە کاتێکدا کە پارتی دێمۆکراتی کوردستان و پێ کێ کێ لە شەڕێکی خوێناویدان لە دژی یەك و **بەڕێز مەسعوود بارزانی** سەرۆکی پارتی لە لای پەیامنێری رۆژنامەی **«تورکیش دێلی نیووز»** پەسنی هاوکاری خۆی دەدا لە گەڵ لەشکری ترك و دەبێژێ "**بەختیارم بەهاوکاری کردن لە گەڵ لەشکری ترك دژی پێ کێ کێ"**، دەوڵەتی ترك دان بە حکوومەتی باشووری کوردستاندا نانێ و حکوومەتی ترك وەزیرەکانی پارتی بە وەزیر ناناسێ و، پاش رێککەوتنی پارتی و یەکێتی لە واشەنتن، بە رەسمی بلاوی دەکاتەوە کە "**ئەم رێککەوتنەی بەدڵ نییە و دانی پێدا نانێ و رێ نادا حکوومەتێکی کوردی لە باکووری عێراقدا تاسەر بچەسپێ و ببێتە هۆی پارچە پارچەکردنی عێراق"**. ئەمەش **ئیسماعیل جەم** وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی ترك هەر پاش رێککەوتنی واشەنتن دەستبەجێ بەرەسمی بلاوی کردەوە. ئەوەش لە بیرنەچێ ئەوەتی **«هەرێمی ئاسایش»** دامەزراوە، دەوڵەتی ترك تا ئێستە هەر رۆژە نارۆژێ هەڵیکوتاوەتە سەر هەرێم و کوردی باشووری قەلاچۆ کردووە و، لە نێو ئەوانەدا نێزیکەی هەشت سەت پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کە یەکێتی بەرەسمی بیرۆی هەیە لە ئەنقەرە و هیچ خراپەیەکیشی دژی دەوڵەتی ترك نەکردووە. هەروەها لەشکری ترك تەنێ لە مانگی تەمووزی ئەمساڵدا (١٩٩٨) ٢٧ چەکداری پارتی کوشتووە (گوایە بە هەڵە). کە ئاشکرایە پارتی خزمەتی زۆری دەوڵەتی ترکی کردووە و دەکا و خراپەی نەبووە بۆی (٨).

**هاووڵاتانی بەڕێز!**

تایبەتکارێکی دیکەی ئەم هەڤاڵبەندییە کورت خایەنەی نێوان کورد و داگیرکەرانی وڵاتەکەی ئەوەیە کە هێزە کوردستانییەکان لە هیچ لایەکی کوردستاندا زاتی ئەوە ناکەن باسی سەربەخۆیی کوردستان بکەن و هەوڵ بدەن بۆی. چونکە

داگیرکەرانی کوردستان هەموو لە سەر ئەوە یەکن کە نابێ لە هیچ جێیەکی کوردستاندا سەربەخۆیی هەبێ. **دەمیرێل**، کۆنە سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی ترك و سەرکۆماری ئێستەی دەوڵەتی ترك هەر لە ساڵی ١٩٩٤دا گوتی **«دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کۆرەوەرییەکی هەرێم گیرە»**. ئاشکرایە هەر پاش دامەزراندنی **«هەرێمی ئاسایش»** هەرسێ دەوڵەتی داگیرکەر، ترك و سووریا و ئێران، سەرەڕای هەموو دوژمنایەتییەکی نێوانیان، ناوبەناو کۆدەبنەوە بۆ باسی ئەوەی کە نێویان ناوە **«مەترسی کورد لە باکووری عێراقدا»** و گوایە بۆ **«پاراستنی یەکێتیی خاکی عێراق»**. وادیارە میراتگرەکانی **«ئەتاترك»** لەم دووایی یەدا بوونەتە **«ئەتا عێراق»**. شایانی باسە، کاتێك کە پارتی و یەکێتی بەربوونە گیانی یەك، ئەو کۆبوونەوانەی سێ دەوڵەتەکە دوواخران، چونکە شەڕی خۆکوژی کورد مەترسیی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دوور دەخاتەوە. بەڵام پاش رێککەوتنی واشەنتن بێگومان ئەو سێ دەوڵەتە و بەتایبەتی دەوڵەتی ترك زۆر هەوڵی خۆنێزیك کردنەوە لە ئێران و عێراق و تەنانەت لە سووریاش دەدا، **خۆ ئەگەر سووریا ئامادەی هاوکاری نەبوو لە گەلی بەو نرخەی کە دەوڵەتی ترك دەیەوێ، ئەوا دەکەوێتە شەڕ پێ فرۆشتنی**. جا دەوڵەتی ترك تا چ هەندازەیەك لەو هەوڵە دیپلۆماسییە، یان لەو دەستدرێژیکەریی یەی دا سەردەکەوێ، ئەوە پێوەندی بەبارودۆخی رۆژهەڵاتی ناڤین و خۆنێزیك کردنەوەی حکومەتی **خاتەمی** ئێران لە ئەورووپا و ئەمریکا و سەرکەوتن یان ژێرکەوتنی دیپلۆماسێتیی کورد و، یەکگرتنی ریزەکانی گەلی کورد، بەتایبەت حیزبەکانی کوردستانەوە هەیە. ئەمەش دەبێ بزانین کە **خاتەمی و داروودەستەکەی، وەك، عەتائوڵڵای موهاجرانی و عەبدوڵڵای نووری و خولام حسەینی کەرباسی، دەستەیەك فارسی شۆڤێنیستی فێڵبازن**. ئەمانە هۆقەبازانە هەوڵ دەدەن بۆ پاکژکردنەوەی پاشڵی پیسی رژێمی ئێران بەرامبەر ئەورووپا و ئەمریکا. بەڵام لە هەمانکاتدا دژی دەوڵەتی ترك و هەڤاڵبەندیی ئیسرائیل و ترکن. **راستییەکەی ئەز کە کردەوەکانی خاتەمی دەبینم، ئەو رۆژانە دەهێنمە بەرچاو کە رێوییەکی وەك رەزمارا سەرۆك وەزیرانی ئێران لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا گاڵتەی بە ریشی ستالین کرد و کۆماری کوردستان و ئازەربایجانی فت کرد و ئێرانی لە سەرەنگریێ بوون رزگار کرد. خاتەمی بوو بەهۆی پاراستنی ئێران لە**

**دەستوەشاندنی ئەمریکا لە دژی. هەمووشی بە قسەی زلی پف هەڵدراوی درۆ (٩).**

لە بەر رۆشنایی ئەمانەی کە باسمان کردن دەردەکەوێ بۆمان کە ئەو **«هەڤاڵبەندی»** یەی لە نێوان کورد و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دا هەبووە هەتا ئەورۆ و بەو شێوەیەی کە هەیە، هیچ سووتێکی بە کورد نەگەیاندووە لە زیان پتر. لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە بێژم کوردستان، کە وەك دوورگە (جزیرە) یەك وایە لە نێو زەریایەکی پڕ لە دوژمندا، نابێ هیچ جۆرە پێوەندییەکی تاکتیکانەی لە گەڵ ئەم داگیرکەرانەدا هەبێ و، هەوڵ نەدا سووت لە ناکۆکیی نێوان بەرژەوەندییەکانیان وەربگرێ. مەبەستم ئەوەیە ئەگەر ئەو پێوەندییە هەبوو، دەبێ بۆ سووتی کورد بێ. بەڵام سووت وەرگرتنێکی لەو جۆرە پێوەندییانە، زانایی یەکی پلەبەرز و وەستایی ـ یەکی تەواو لە دیپلۆماسێتی و سیاسەتکاری دا دەخوازێ، کە وەك دەردەکەوێ تا ئێستە هێزە کوردستانییەکان لە باریاندا نەبووە و نییە، ئەو دەورە بگێرن. بێجگە لەوەش، سووت وەرگرتن لەو جۆرە پێوەندییانە پێویستی بە هاوئاهەنگییە لە نێوان هەموو هێزە کوردستانییەکانی گشت لایەکی وڵاتدا و، رێککەوتنیانە لە نێو خۆیاندا لە سەر دابەشکردنی رۆڵی تاکتیکانە. **ئەم هاوئاهەنگییەش کاتێك دروست دەبێ کە هەموو هێزە کوردستانییەکان لە بەر رۆشنایی بیروبۆچوونی نەتەوەیی دا کێشەی کورد لە هەموو لایەك بە یەك کێشەی لە یەك دانەبڕاو و کەرت کەرت نەکراو بزانن و، هەر بەشێکی هێزە کوردستانییەکان بە بەشێك لە سەرجەمی هێزی یەککگرتووی کوردستان بزانن. هێزێکی رامیاری، با نێوی خۆشی بنێ کوردستانی، کاتێك باوەڕی بە بەرژەوەندیی وەك یەك و دوواڕۆژی وەك یەك و چارەنووسی وەك یەك و هاوسەنگەریی وەك یەك نەبێ و، خۆی بە بەشێك لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بزانێ، نەك بە بەشێك لە سەرجەمی خاك و نەتەوەی خۆی، ناتوانێ خۆی لە گەڵ هێزێکی دیکەی کوردستانیدا هاوئاهەنگ بکا، کە ئەویش خۆی بە بەشێك لە دەوڵەتێکی داگیرکەری دیکە بزانێ. بۆ گەیشتنە ئەم هاوئاهەنگییە، پەروەردەیەکی نەتەوەیی لە سەر دەستی کادری نەتەوەیی دا پێویستترین شتە لەم رۆژەدا. ئەوەش دەبێ بزانین کە کادری نەتەوەییمان زۆر کەمە.**

جا لە بەر ئەوەی خستنە گەڕی بیروبۆچوونی نەتەوەیی بەکردەوە لە سیاسەتدا، لە لایەن هێزە کوردستانییەکانەوە نییە، یان زۆر کزە ، ئەوا دیارە ئەم هێزانە بەرامبەر بە

داگیرکەرانی کوردستان سیاسەتێکی چەوت و چەوێڵیان گرتووە. ئاشکراترین دەرهاوێشتەی ئەو سیاسەتە چەوێڵە ئەوەیە کە تا ئێستە نەیانتوانیوە لە هیچ سەردەمێکدا دوژمنی سەرەکی کورد و نەیار و بەرهەڵستکەری سەرەکی کورد و بزووتنەوەی کوردایەتی دەسنیشان بکەن، تاکوو هەموو پێکەوە وزەی خۆیان بۆ بەربەرەکانی تەرخان بکەن. **مەبەستم لە دوژمن و نەیار و بەرهەڵستکەری سەرەکی لێرەدا دوژمن و نەیار و بەرهەڵستکەرێکە کە لە هەموو دوژمنان و نەیاران و بەرهەڵستکەرانی دیکە بەهێزتر و کارامەتر و پڕچەکتر و، لە سنووری ئینتەرناسیۆناڵیدا پشتووپەنا دارتر بێ.** لە کۆتایی حەفتاکان و هەشتاکاندا، ئەو دوژمنە سەرەکییە رژێمی عێراقی سەددام بوو. ئەورۆ ئەو دوژمنە سەرەکییە رژێمی سەددام نییە، کە لە لایەن کۆمەڵی نەتەوە یەککگرتووەکانەوە کەوتووەتە ژێرباری سزادان و گەمارۆدانی ئابووری و سنوور بۆدانانی بزووتنەوەی سوپایی. ئەوەتە کۆنگرەی ئەمریکا بە ئاشکرا و بەرەسمی چەند سەت ملیۆنێك دولاڕ تەرخان دەکا بۆ پشتگیریی **"بەرهەڵستکەرانی عێراقی"** و بەربەرەکانێی سەددام بەنیازی رووخاندنی. هەروەها رژێمی مەلاکانی ئێرانیش دوژمنی سەرەکی کورد نییە، ئەو رژێمەی کە لە جیهاندا بە تێرۆریست ناوی رۆیوە و، دوژمنی گەورە گەورەی وەك ئەمریکا و ئیسرائیل و ئەفغانستان و گەلێك لایەنی دیکەی هەیە و، حکوومەتەکەی ئێران لە باری ئابوورییەوە لە تەنگانەیەکی وادایە کە مانگانەی کاربەدەستەکانی پێ نادرێ. ئەگەرچی هاتنی خاتەمی فێڵزان و زمانلووس بۆ سەرکار ـ وەك لەمەو بەر باسکرا ـ ئەو مەترسییەی ئەمریکا و ئەورووپای تا هەندازەیەکی زۆر لە سەر ئێران خاو کردووەتەوە. **خاتەمی شۆڤێنیستێکی زۆرزانی فارسە کە خۆی لە پاڵ قسەی مرۆڤدۆستانەی بێ ئێوەرۆکی بێ گوومرگدا شاردووەتەوە، بەپێچەوانەی خامنەیی ـ یەوە کە شۆڤێنیستێکی ترکە (١٠) و، خۆی لە پاڵ ئیسلامی شیعە گەریی خومەینی یانەدا شاردووەتەوە و بە ئاشکرا دوژمنایەتی ئەمریکا و ئیسرائیل دەکا. بەڵام وەك دەردەکەوێ لە ژێرەوە لە گەلێك شتدا لە گەڵ خامنەیی هاودەنگە. کێشەی سەلمان روشدی کە خاتەمی هەر بە قسە لێفەیەکی پێدا دا، نموونەیەکی ئەمەیە.**

هەروەها رژێمی سووریا، هەر چەندە رژێمی بەعسیی عەرەبی شۆڤێنیستانە و

دژ بە کوردە، بەلاَم بە دوژمن و نەیاری سەرەکی دانانرێ. چونکە دەوڵەتی سووریا لە باری ئابوورییەوە زۆر دەستکورت و، لە باری نێونەتەوەییەوە دوژمندار و، لە تەنیشتییەوە بە دوو دوژمنی بەهێزی وەك **ئیسرائیل و ترك** گەمارۆ دراوە و، لە سنوورێکی ئینتەرناسیۆنالیشدا بە رژێمێکی تێرۆریست ناسراوە و، سۆڤیێتەکەی جارانیش نەماوە بکەوێتە فریای.

**بەبیروباوەڕی من، دەوڵەتی ترك، هەر چەندە لە باری ئابوورییەوە لە پلەیەکی نزمدایە و دوژمنانێکی دەرەکی زۆری هەیە، بەلاَم لە باری نێوخۆیی یەوە حیزبەکانی ترك و دەسەلاَتدارانی ترك، هەر چەندێکیش لە نێو خۆیاندا ناڕێك بن، ئەوا بەرامبەر بە دەرەوە هەموو یەکن، بەتایبەتی بەرامبەر بە کێشەی کورد. ئەوەتە نەجمەدین ئەربەکانی موسوڵمان سەرەڕای دەرکردنی لە سەرۆك وەزیری و داخستنی حیزبەکەی و گەڕ و گێچەڵ پێکردنی لە لایەن لەشکری ترك و دەوڵەتی ترکەوە، کەچی پشتی دەوڵەتی ترکی گرت و هەروەك دەوڵەتی ترك کەوتە هەڕەشە کردن لە سووریا بە بۆنەی دالدەدانی ئۆجەلانەوە. بێجگە لەوەش دەوڵەتی ترك لە باری سوپاییەوە لەشکرێکی مەشق پێکراوی بەهێز و مودێرنترین چەکی قورس و کۆکوژی هەیە و، نێزیکەی پەنجا ساڵە لە لایەن ئەمریکا و دەوڵەتانی ناتۆوە یارمەتیی ئابووری و سوپایی دەدرێ. لەم دواییەشدا ئیسرائیلیش چووەتە بنە و پاڵی و، لە باری سوپایی و هەواڵ چینییەوە یارمەتی یەکی زۆری دەدا. ئیسرائیل گەلێك پەیماننامەی ئابووری و بازرگانی و فەرهەنگی لە گەڵ دەوڵەتی ترك بەستووە کە هەمووی دژ بە کوردن.**
شایانی باسە کە ئەم یەکگرتنی ترك و ئیسرائیلە دوژمنایەتییەکی توند و تیژی لە جیهانی عەرەب و ئیسلامدا بەرامبەر ترك دروستکردووە. بێجگە لەوەش زۆر لە جووەکانی ئەمریکا دژی ئەم یەکگرتنی ترك و ئیسرائیلەن و، بەزیانی ئیسرائیلی لە قەڵەم دەدەن. هەر چۆنێك بێ، دەوڵەتی ترك ئەوڕۆ بەهێزترین و سەختترین رێگرە لە بەردەم ئەوەدا کە **«هەرێمی ئاسایش»** لە باشووری کوردستان ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، یان کۆمارێکی فیدەراڵی. چونکە دەوڵەتی ترك تاکە دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستانە کە لە ئەورووپا و ئەمریکا و سنوورێکی جیهانیدا قسەی دەڕوا و هەڤاڵبەندی بەهێزی هەیە. لەمەش بترازێ، پاش رووخانی یەکێتیی سۆڤیێت، چەند دەوڵەتێکی ترکزمان هاتوونەتە کایە کە هێندێکیان زۆر چالاکانە بۆ ئامانجی

تورانێتی تێدەکوشن، بەتایبەتی ئازەربایجان. تورانییەکانی ئازەربایجان دەیانەوێ سووت لە ڕێبازی ئیسلامەتیی شیعەگەریی دەوڵەتی ئێران و بوونی **ترکزمانێکی وەك حەسەین عەلی خامنەیی، ڕێبەری ڕژێمی ئێران ببینن، بۆ ئەوەی جۆرە «فیدراسیۆن» یك لە نێوان «کۆماری ئازەربایجان» و دەوڵەتی ئێراندا ڕێك بخەن و، ئەوجا نەك هەردوو پارچە ئازەربایجانەکە لە یەك بدەن، بەڵکوو بەشێکی کوردستانیش لرف بدەن کە بە نێوی «ئازەربایجانی ڕۆژئاوا» وە نێونراوە. دەمێکە هێندێك لە ئەندامە ئازەرییەکانی «پەرلەمانی ئیسلامی ئێران» داوای ئەم یەکگرتنە دەکەن و دەبێژن ئەم یەکگرتنە زەحمەت نییە، چونکە «ڕێبەری ئیسلامیی» خامنەیی زمانی ترکی دەزانێ.** بێجگە لەمەش **مەلا حەسەنی** کە بە **«ژەنەراڵ حەسەنی»** ناسراوە و، دەستێکی درێژی هەبوو لە کوشتاری کورددا لە شاری **ورمێ** و گوندی **قارنا** (١١)، کەوتووەتە پڕۆپاگەندە کردن بۆ گوایە **«ڕێبەری موسوڵمانان» خامنەیی**، چونکە هەردووکیان، ئەمیان، واتە **خامنەیی** بەخشکەیی و، ئەویان، واتە **مەلا حەسەنی** بە ئاشکرا بۆ ئامانجی تورانێتی هەوڵ دەدەن. دیارە ئەمە نەك هەر بە زیانی کوردە، بەڵکوو بە زیانی فارسیشە، بەڵام فارسەکان لەبەر هەستی شیعەگەرێتی، خۆیان کەڕ کردووە لێی. **لە گەڵ ئەمەشدا لەیەکدانێك لە نێوان فارس و ترك (ئازەری) دا لەوانەیە هەڵبگیرسێ.**

تورانییەکانی ئازەربایجان کۆمەڵەیەکیان هەیە بە نێوی **«کۆمەڵەی ئینتەرناسیۆناڵی ئازەربایجان»** ەوە کە لەم دواییەدا کۆنگرەی دووەمیان لە واشەنتن بەست و چەند کاربەدەستێکی بەرزی ئەمریکایی و چەند سەناتۆرێك لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوون. لەو کۆنگرەیەدا داوای جیابوونەوەی ئازەربایجانی ئێران و یەکگرتنی لە گەڵ کۆماری ئازەربایجانیان دەکرد. (تەماشای ڕۆژنامەی **«کیهان»** چاپی لەندەن - ژمارە ٧٢٢، ١٩٩٨/٩/٣ بکە).

ئەوەتەی **«هەرێمی ئاسایش»** دامەزراوە لەشکری ترك بەبیانووی پەلاماردانی **پ ک ک** وە هەر ساتە ناساتێ پەلاماری **«هەرێمی ئاسایش»** دەدا و کوشتاری خەڵکی باشوور دەکا، ئەمەش بە سووت وەرگرتن لە شەڕە زرتانێی حیزبەکانی کوردستان و، **لە هەمانکاتدا خەریکە جۆرە تورانێتی یەکی دەستدرێژکەرانە لە هەرێمی ئاسایش دا دروست بکا بە نێوی «ترکمان» ەوە.** ڕاستی یەکەی پاش

دامەزرانی **«هەرێمی ئاسایش»** ژمارەیەکی زۆر لە ترکمانەکانی دەرەوەی هەرێم روویان کردە هەرێم و، بەتایبەتی هەولێر و، بە یارمەتیی رژێمی ترک و سووت وەرگرتن لە شەڕی براکوژی حیزبەکانی کوردستان، دەستیان کرد بە خۆ بەهێزکردن. حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەر لە سەرەتاوە هەموو مافێکی بە ترکمانەکان دا، وەك خوێندن بەزمانی خۆیان و دامەزراندنی کۆمەڵە و حیزب و تەلەفزیۆن و رادیۆ و دەرکردنی رۆژنامە، کە دیارە ئەمانە مافی رەوای هەموو کەمایەتی یەکن و قسەمان نییە لە سەری و شایانی خۆشبەختی یە کە ئەم مافانە بە **ئاشوورییەکانی «هەرێمی ئاسایش» یش دراوە.** بەڵام سەرگەورەکانی ترکمانەکان بە فیتی دەوڵەتی ترك و کورتبینی سیاسەتکارانی کورد، دەستیان کرد بە دروستکردنی **هێزی چەکدار و پڕۆپاگەندە کردنی ئاشکرا بۆ رژێمی ترك و سڵاواتدان لە ئەتاترکی کوردکوژ و،** چاپکردنی نەخشەی دامەزراندنی گوایە **«کۆماری کەرکووك» کە پێکهاتبێ لە هەموو کەرکووك و هەولێر و هەموو بادینان و هەموو مووسڵ و بەشێك لە سلێمانی و دیالە و، دەستدرێژی کردن بۆ سەر پێشمەرگەی پارتی و، کاربەدەستانی حکوومەتی کوردستان** لە هەولێر، تا خەڵکی هەولێر گەیشتە تینیان و هەوڵیان دا سنوورێك بۆ دەستدرێژیی ترکمانەکان دابنێن. ئەوجا ترکمانەکان کەوتنە بڵاقۆك دەرکردن لە دژی پارتی و قسەی سووك وناشیرین خستنە پاڵ **سەرۆکی پارتی بەڕێز مەسعوود بارزانی.** دەوڵەتی ترکی ئاغاشیان بێ شەرمانە کەوتە هەڕەشە کردن. ئەمە لە کاتێکدا کە ترکمانەکان لە هەرێمی ئاسایش دا مافیان لە مافی کورد گەلێك پترە. پتر لە ۲۰ ملیۆن کورد لە ژێر پۆستاڵی رژێمی ترکدا دەناڵێنن و تەنانەت ناوێرن بێژن **«کوردین»** کەچی رژێمی ترك لالە وێچێ ترکمان کە هەموو مافێکیان هەیە، دەکا بە بیانوو بۆ هەڕەشە و گوڕەشە لە کورد، دەزانێ کە کورد جارێ دەسەڵاتی سوپاییان نییە وەرامی دەسدرێژی و دەمدرێژییەکانی ملهوڕانی ترك بدەنەوە.

**لە بەر ئەم هۆیانەی سەرەوە دوژمنی سەرەکی کورد لە کاتی ئێستادا دەوڵەتی ترك و تۆرانێتی یە. بێگومان دیارە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی دیکەش هەر دوژمن و نەیار و بەرهەڵستکەرن، بەڵام بزووتنەوەی کوردایەتی دەبێ لیستەتێك بخاتە بەرچاوی خۆی بۆ ئەم دوژمنانە. لە هەرە مەترسی دارترەوە بۆ مەترسی دارتر و لە مەترسی دارترەوە بۆ مەترسی دار،** ئەمەش بە پێی هێزی ژەهری چزووەکەیان. پێڕەوی نەکردنی

ئەم لیستەیە وای لە کورد کردووە هەر حیزبە شەڕی دەوڵەتێکی داگیرکەر بکا و پاڵ بدا بە دەوڵەتێکی داگیرکەری دیکەوە، بێ گوێدانە پێشەمی دان بە دوژمنێکی سەرەکی. لە سەردەمی **جەنگی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران** دا، هێزەکانی باشووری کوردستان تێکڕا پشتی رژێمی ئێرانیان دەگرت دژی رژێمی سەددام و، حیزبەکانی رۆژهەلاتیش تێکڕا دژی رژێمی ئیسلامی بوون و پالیان دابوو بە رژێمی سەددامەوە و، لە هەمانکاتدا ئەم حیزبانە بە فرۆفێڵی رژێمەکانی ئێران و عێراق، بەگژ یەکدا دەچوون و خوێنی یەکدییان دەڕشت. جا ئەم هەڵوێستەی حیزبەکانی کوردستان، نە رژێمی ئیسلامی خست و نە رژێمی بەعس و، کوردیش لە هەر دوولا پتر زیانی لێکەوت. خۆ ئەگەر هاوئاهەنگییەك لە نێوان حیزبەکانی کوردستاندا ببوایە و، کوردی ئەم دیو و ئەودیو، بێ لایەنی خۆیان لە جەنگدا بپاراستایە، یان هەر دوولا پێکەوە بە گژ سەددام دا بچوونایە کە ئەو دەمە دوژمنی سەرەکی ی کورد بوو، نە کوردستان بەو شێوە کاول دەبوو و، نە ئەو هەموو کوردە دەکوژران و، لەوانەش بوو کورد بیانتوانیایە، ئەگەر بێ لایەنییان بکردایەتە هەڵوێستی خۆیان، وەك هێزێکی ئاشتیخواز و تەنانەت نێوبژیکەریش گەلێك دەسکەوتی دەسگیر ببوایە.

لەوانەیە یەکێك بێژێ، کورد ئەم لایەن و ئەو لایەنیان لە شەڕەکەدا گرتووە، تا هەر دوولای شەڕکەر، عێراق و ئێران، بێ هێز بکەن. لێرەدا بەدڵنیاییەوە دەبێژم لە بەر ئەوە نەبووە، بەڵکوو بە پێی پرنسیپی **«دوژمنی دوژمنم دۆستمە»** چوون بەڕێوە. هەر کوردەش بە تەنگ حیزبەکەی خۆیەوە بوو، نەك بە تەنگ نەتەوەی کوردەوە. پشتگیریی کورد بۆ رژێمی سەددام لە دژی رژێمی خومەینی و، پشتگیریی رژێمی خومەینی لە دژی سەددام، هیچ لایەکی لە داگیرکەران بێ هێز نەکرد، بەڵکوو لە زیانی کەم کردنەوە و، دوواییش ئەوە بوو **کە لە گەڵ یەك ئاشت بوونەوە، پرسە گورگانەیەکیشیان بە «هەڤاڵبەند» ە کوردەکەیان نەکرد. هەروەك چۆن کاتی خۆی، لە مارتی ١٩٧٥ دا، کە شای ئێران لە جەزایر لە گەڵ سەددام رێککەوت، پرسی بە بەهەشتی بارزانی «هەڤاڵبەند» ی نەکرد، خومەینیش کە پیاڵە ژەهرەکەی نابە سەریەوە و شەڕی دژی سەددام وەستاند (١٢)، پرسە گورگانەیەکیشی بە هەڤاڵبەندە کوردەکانی (پارتی و یەکێتی و پاسۆك و حسیك و ...هتد) نەکرد.** لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە رۆژنامەکانی سەردەمی خومەینی بە پارتیان دەگوت **«افراد**

**قیادە موقت»** ئەمەش بۆ سووکایەتی پێکردن. شایانی باسە کە حیزبەکانی دیکەی کوردستان (بێجگە لە پارتی) کە کاتی خۆی هەزار و یەك رەخنەیان لە **سەرۆك بارزانی** دەگرت بۆ ئەو هەڤاڵبەندی یەی لە گەڵ شای ئێران بەستبووی، خۆشیان هەر بەو رێیەدا چوون کە بارزانی پێی دا چوو و، بەدەستی ڤالاٚ (بەتاڵ) لێی گەڕایەوە.

**کە واتە هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوەچوون لە چارەسەرکردنی کێشەی کورددا ئەوەیە کە هەموو هێزەکانی کوردستان، لە هەر شوێنێکدا بن، کێشەی کوردستان و نەتەوەی کورد، وەك یەك کێشەی پارچە پارچە نەکراو و لە یەك نەپساو تێبگەن و، تەنێ لە باری ئەم سەرنجەوە تەماشای رووداوە نێوچەییەکان بکەن لە کەرتەکانی خۆیان و، چالاکییەکانی خۆیان هەمیشە لە گەڵ یەك هاوئاهەنگ بکەن.** هاوئاهەنگی Coordination لە بزووتنەوە و چالاکیدا مایەی سەرکەوتنی هەموو لایەکە. بۆ وێنە ئەم **«هەرێمی ئاسایش»** ە کە لە بەشێك لە باشووردا دامەزراوە، سووتەکەی هەر بۆ خەڵکی باشوور نییە، بەڵکوو بۆ تەواوی نەتەوەی کورد و هەموو خەڵکی کوردستانە. لە بەر ئەوە دەبێ هەموو کوردێك و هەموو کوردستانییەك ئەم کیانە بە هی خۆی بزانێ و بیپارێزێ. کاربەدەستانی کوردیش لە **«هەرێمی ئاسایش»** دا دەبێ هەرێمەکە بە مالی هەموو کوردێك بزانن، نەك هەر بە مالی دانیشتووانی بنەڕەتیی هەرێمەکە، یان بە مالی حیزبەکانیان. بەداخەوە ئەم پرنسیپە نەتەوەییە تا ئێستە رەچاو نەکراوە، واتە، نە کاربەدەستانی هەرێم کوردەکانی دەرەوەی هەرێمیان بە هاوولاٚتی خۆ زانیوە و، نە کوردەکانی دەرەوەی هەرێمیش هەرێمیان وەك مالی خۆیان تەماشا کردووە. **کوردەکانی دەرەوەی هەرێم دەبێ ئەو راستییە تالە بخەنە بەرچاویان کە هەرێمی ئاسایش دەوڵەتێکی سەربەخۆ نییە و، ئەو هێزە چەکدارەی لە هەرێمدا هەیە بەرگەی شالاٚوێکی بێهێزترین دەولەتی داگیرکەری کوردستان ناگرێ. هەموو کارو کردارێکی هۆشیارانە بە ئامانجی تێکدانی هەرێمی ئاسایش و مالۆچکەکەی کورد، بە هەر نیۆزێکەوە دەبێ با بێ، خیانەتێکی نەتەوەیی یە.** ئاشکرایە کە هەرێمی ئاسایش لەم بارودۆخەی ئەڕۆدا ناتوانێ ببێتە پێگەیەك بۆ حیزبێکی رۆژهەلاٚتی یان باکووری، یان رۆژئاوایی،کە لەو هەرێمەوە پەلاماری دەولەتە داگیرکەرەکانی ترك و عەرەب و فارس بدرێ. **کاربەدەستانی کوردیش پێویستە لە سەریان، دالدەی هەموو کوردێکی هەلاٚتوو بدەن و بیپارێزن و بە هیچ**

**جۆرێك نەیدەنەوە دەست داگیرکەران و، خۆ ئەگەر کوردێکی دەرەوەی هەرێم، تاوانێکی کردبوو، دەبێ بدرێتە دەست پۆلیس و دادپرس (حاکم)ی کورد، نەك رژێمە داگیرکەرەکانی کوردەستان. کورد دانە دەست داگیرکەرانی کوردستان لە لایەن دەسەڵاتدارانی کوردەوە، ئەوجا هۆیەکەی هەرچی یەك دەبێ با بێ، خیانەتێکی نەتەوەیی یە.**

**هاوولاتە بەرێزەکان!**

وەك لە مەوبەر باسمان کرد، هێزی سوپایی حیزبەکانی کوردستان بایی ئەوە نییە دەرەقەتی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بێ. تێکرژانی پێشمەرگە و گێریلای کورد لە گەڵ لەشکرەکانی داگیرکەرانی وڵاتەکەی، لە باشترین بارودۆخدا دەبێتە هۆی سەرلێشێواندنی داگیرکەر و، رەنگە بێ هێزکردنی رژێمە فەرمانڕەواکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و، لەوانەشە دەرفەتێك بدا بە هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئەو دەوڵەتانە کە بتوانن بێنە سەرکار. دیارە ئەنجامی ئەمەشیان هیچ سووتێکی کوردی تێدا نییە. چونکە حکوومەتەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان دەگۆرێن، بەلام دەوڵەتەکان وەك خۆیان دەمێننەوە. **ئەو راستینە زەقەش کە لێرەدا دەبێ بخرێتە بەرچاو ئەوەیە، کە لە هەموو ئەو دەوڵەتانەدا کە کوردستانیان داگیر کردووە، تاکە هێزێکی بەرهەڵستکەری عەرەب، ترك، فارس، کە دێمۆکراتیخوازو ئازادیخوازو ئاشتیخواز بێ نییە، تاکوو ئەگەر هاتوو بە یارمەتی هێزی** دەستوەشێنی کورد حکوومەتی گرتە دەست و چووە سەر کار، پشتی کێشەی کورد بگرێ و، لە بنەڕەتەوە چارەسەری بکا. بۆ وێنە: **لە ئێران «موجاهیدینی خەڵك» (مجاهدین خلق) و «شاپەرستەکان» (سلطنت طلبان) و «چریکەکانی فیدائیانی خەڵك» (فدائیان خلق)و داروودەستەی تیرۆرکراو شاپووری بەختیار و کۆنە توودەیی یەکان و لە عێراق «کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق» (المؤتمر الوطني العراقي) و «حیزبی دەعوەی ئیسلامی» و «حیزبی عێراقی سەربەست» (حزب العراق الحر) و بەعسی یەکانی دژ بە سەددام و سەر بە سووریا و ئەنجومەنی شۆرشی ئیسلامی لە عێراق و، لە دەوڵەتی ترکدا حیزبی ئەربەکان کە هەردەم بە ناوێکی دیکەوە دێتە پێشەوە و رێبازی ئیسلامی گرتووە، حیزبی تانسوو چیلەر، چەپەکانی ترك، و لە دەوڵەتی سووریادا، کۆمۆنیستەکانی سەر بە ریاز و لترك (رياض الترك) و**

**موسوڵمانانی سوننی سەربە کۆمەڵی برادەرانی موسوڵمان (الاخوان المسلمون) و دژ بە عەلەوییەکان.** ئەمانە بۆ دوژمنایەتی کردنی کورد هیچیان لە حکوومەتەکانی دەوڵەتەکانی خۆیان نەگەڕاوەتەوە. تەنانەت ئەوە بوو لە کاتی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١دا **لە** باشووری کوردستان، **(موجاهیدینی خەڵکی سەر بە ڕەجەوی** شان بە شانی لەشکری **سەددام** کەوتنە کورد کوشتن لە باشووری کوردستاندا. لە بەر ئەوە دەبێ بیرێکی ژیرانە لە شێوازی پێکهاتەی دووارۆژی پێشمەرگە و گێریلا بکرێتەوە و بخرێتە چوارچێوەی ڕاستەقینەی خۆیەوە، تاکوو خوێنی هەزاران کورد بە ناڕەوا نەڕژێ. بە بیروڕای من ـ وەك لە پێشەوە گوتم ـ **دەبێ هەموو حیزبەکانی کوردستان ڕوویکەنە سیاسەتکردن و وازهێنان لە ڕاگرتنی پێشمەرگە.** ئەو پێشمەرگە و گێریلایانەی کە بەڕاستی چاوەڕوانیی ئەوە دەکرێ لێیان ببنە سەرباز و، مەرجی سەربازییان تێدا هەیە، سەر بە هەر حیزب و کۆمەڵێك دەبن با ببن، **بکرێنە یەك و کرۆکی سوپایەکی کوردستانی مۆدێرنی لێ دروست بکرێ، و ئەوەش لە هەرێمی ئاسایشدا**، چونکە هەر لەوێ ماوەی ژیان و بەهێزبوونی دەبێ و، سەرکردەیەتیی سوپاکەش بدرێتە دەست مرۆڤی سەربەخۆ، لەو ئەفسەرانەی کە زانستی سوپاییان خوێندووە و، شارەزای تەکنیکی سوپایین و، بە فەرمانی ئەم حیزب و ئەو حیزب ناکەونە گیانی یەك. ئەمە ڕێی ڕاستە، نەك ئەوەی هەر **«گروبانێك» یان «ئۆن باشی یەك» یان «نائب عەریفێك» و کۆنە حەیتەیەك،** کێشەیەکی تایبەتی هەبوو لە گەڵ ڕژێمێکی داگیرکەردا و ڕای کردە نێو پێشمەرگەوە، بیکەنە کۆلۆنێل و ژەنەڕاڵ و **عەریف عەلی** ببێتە **«عەمید عەلی».** سوپایەکی کوردستانیی ڕێك و پێك و پەروەردەکراو بە گیانی نەتەوەیی، دەبێتە نێوەرۆکی لەشکری دووارۆژی دەوڵەتی کوردستان. ئەم لەشکرە بەهێزەی کە ئەورۆ ئیسرائیل هەیەتی، لە سەرەتاوە بە دەستوەشێنەکانی **«هەگانا»** دەستی پێکرد، کە ئەوانیش تاقمێك چەکدار بوون لە شێوەی پێشمەرگەدا.

پێویستە حیزبەکانی کوردستان ئەوە بزانن کە نەتەوەی کورد (مەبەستم لە نەتەوەی کورد هەموو نەتەوەی کورد و سەرپاکی خاکی کوردستانە) مافی کوێخایەتی نەداوە بە هیچ کەس و هیچ حیزبێك کە بچێ چەند چەکدارێك لە خۆی کۆبکاتەوە و بە چەك و کەلوپەلێکی جەنگیی سووکەڵەوە شەڕێکی نەکاو لە گەڵ

داگیرکەرێکی پڕ چەك و دڕندەدا دەست پێ بکا و، هەزاران کورد بدا بە کوشت و بەزۆریش لەوانەی کە هیچیان سەر بە حیزب نەبوون و، سەتان گوندی کورد کاول بکا و، ئەوجا رابکاتە نێو سنووری دەوڵەتێکی داگیرکەری دیکە و، شەڕ بوەستێنێ و دیسانەوە ـ بە زۆری بە پیلانی دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کە خۆی خستووەتە پەنایەوە ـ شەڕ دەست پێ بکاتەوە و تێك بشکێتەوە و، شەڕ بوەستێنێتەوە و، جارێکی دیکە شەڕ تازە بکاتەوە و، بەماڵکاولیی کورد درێژە بدا و، دەسکەوتیشی نەبێ، یان دەسکەوتێك کە ئەو قوربانییە زۆرە نەهێنێ. خۆ ئەگەر توانی وا لەو دەوڵەتە داگیرکەرە بکا بە فرتوفێڵ و بۆ کات بردنەوە بکەوێتە قسە کردن لە گەڵ ئەو حیزبەدا، ئەوا داگیرکەرەکە چەندین مەرجی گران و سەرپێ شۆڕکەر بەسەر حیزبە کوردییەکەدا بسەپێنێ و پێی ئیمزا بکا و ئاوڕووی ببا و، ئەوجا شەڕ دەست پێ بکاتەوە. ئەمەش هەمووی هەر بە نێوی نوێنەرێتی پێنەدراوی کوردەوە. **بۆیە پێویستە سنوورێك بۆ ئەم شەڕی خۆترێن و خۆ بە کوێخا زانینە دابنرێ. هەموو راپەڕینێکی چەکدارانەی حسێب بۆنەکراوی تاوتۆ نەکراوی ناکاو و، هەموو دەستوەشاندنێکی نەزانانەی ناشییانە و، هەموو رێککەوتنێك لە گەڵ داگیرکەرانی کوردستان، بێ پرس و رای نەتەوەی کورد، کارێکی نابەجێ و زیانبەخشە و لە باری زاگۆنیشەوە هیچ جۆرە رەوایەتییەکی نییە.**

جا لە بەر ئەوەی دەنگ وەرگرتن لە تەواوی کوردستاندا لە رۆژی ئەورۆدا کارێکە لە کردن نایێ، ئەوا دیارە، تاکە رەوایی یەك کە حیزبەکان و هێزەکانی کوردستان بتوانن پشتی پێ ببەستن، رێککەوتنی هەموویانە لە گەڵ کەسایەتیی زانستی و هونەری و بازاڕی و کرێکاری و جوتکاری و خوێندکاری و ئاینی و ژنانی کوردستان لە چوارچێوەی کۆنگرەیەکی نەتەوەیی دا. تا ئەوە نەبێ هەر کارێك هەر حیزبێك بەتەنێ بیکا بە نێوی نەتەوەی کوردەوە، رەوایەتی نابێ و، دژ بە مافی سەروەرێتیی نەتەوەی کورد و خەڵکی کوردستانە. بێجگە لەوەش هەموو جۆرە شەڕێکی نێوخۆیی لە نێوان کورد و کورددا، سا هۆیەکەی هەر چییەك هەیە با ببێ، خیانەتە بەرامبەر نەتەوەی کورد و، ئەوی لەو شەڕەشدا بێتە کوشتن بە ڕووی سوورەوە ماڵ ئاوایی لەم جیهانە ناکا.

لەوانەیە یەکێك بێژێ کورد لە باری دەوڵەتداری و تاکتیکی بەربەرەکانێی

داگیرکەرانەوە لە گاگۆلکێ دایە و، هەر هێندەی لە دەست هاتووە بیکا کە کردوویەتی. باشە. با ئەوەی تا ئێستا رووی داوە بەتاقیکردنەوەیەکی ناچاری بدرێتە قەڵەم. بەلاّم لێرەدا دەبێ بیوەستێنین و خەبات بە شێوەیەکی دی درێژە پێبدەین، بە جورێ بگونجێ لە گەڵ هەل و مەرجی نوێی کوردستان و خۆرهەلاّتی ناڤین و جیهان و گیانی شارستانێتی و رامیاری و تەکنیکی ئەورۆ. **پێویستە ئازایەتی و رۆستەمی لە شەڕی خۆترێن و، درۆ و دەلەسە لە دیپلۆماسێتی و فێڵەکەرانە و، هۆقەبازی لە رامیاری (سیاسەت) جیا بکەینەوە، تاکو بۆنی پیڤاز بە بۆنی گوڵ** نەزانین و دەنگی جرت و شڵپەی ماچمان لێ نەبێتە یەك شت.

**بەرێزینە!**

بەڵگە نەویستە کە هەموو کوردێك مافی ئەوەی هەیە خەریکی رامیاری بێ بەو شێوەیەی خۆی بە باشی دەزانێ، جا ئەو کوردە دێموکراتە، کۆمۆنیستە، سۆسیال دێموکراتە، سۆسیالیستە، موسوڵمانە، دیانە، جووە، ئێزدییە، کاکەیی یە، ئەلەوییە، شەبەکە، بەهایی یە، زەردەشتی یە، کرێکارە، جۆتکارە، کاسبکارە، خوێندەوارە، نەخوێندەوارە، مەلایە، فەقێ یە، وەستایە، شاگردە، ژنە، پیاوە، هەر کەسێك هەیە هەیە. مافی ئەوەشی هەیە خۆی لە سنوورێکی نەتەوەیی دا لە حیزبێکدا یان لە کۆمەڵێکدا رێك بخا، بەلاّم نەخۆی، نە حیزبەکەی مافی ئەوەیان نییە، خۆیان بکەنە پێشرەو و، خەڵکەکەی دیش بە پاشرەو و قرە دابنێن و ماف بدەن بە خۆیان کە بە نێوی نەتەوەی کوردەوە قسە بکەن. نەتەوەی کورد کەسی نەکردووە بە نوێنەری خۆی. حیزبەکانی کوردستان دەتوانن و دەبێ بیروبۆچوونی خۆیان بە شێوەیەکی دێموکراتانە و ئاشتیخوازانە دەربڕن و هەوڵ بدەن جەماوەری کورد بەلای خۆیاندا رابکێشن. هەموو جۆرە زۆر بەکارهێنانێك لە بلاّوکردنەوەی بیروبۆچوون دا، کارێکی تێرۆریستانەیە و دەبێ بە هیچ شێوەیەك بەلایدا نەچین. بێجگە لەوەش ئەگەر حیزبەکانی کوردستان، کە هەموویان بانگەشەی خزمەتی نەتەوەی کورد لێ دەدەن، نەیانەوێ، یان ئەوەیان لە باردا نەبێ، پێکەوە دانیشن و لەسەر بەرنامەیەك لە گەڵ یەك رێك بکەون و هەموو خەریکی پاشقول لە یەك گرتن و چاڵ بۆ یەك هەڵ کەندن بن، چۆن چاوەڕوانی ئەوە دەکرێ لێیان بتوانن رێبەرێتیی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی نەتەوەیەکی ژێردەستەی پێنج دەوڵەتی دەسەلاّتدار بکەن؟

**هاوولاّتە بەرێزەکان!**

بە پێی رێککەوتنی **واشنتن لە نێوان پارتی و یەکێتی** دا دەبێ لە هاوینی ١٩٩٩ دا هەڵبژاردنێك لە **هەرێمی ئاسایش** دا ساز بکرێ. هیوای من ئەوەیە ئەو هەڵبژاردنە نموونەی هەڵبژاردنێکی ئازاد بێ و رێژەی ٧٪ لابرێ و حکوومەتێکی نەتەوەیی دروست ببێ، واتە حکوومەتێك لە هەموو حیزب و کۆمەڵ و کەسایەتییەکانی باشووری کوردستان. حکوومەتی یەك حیزبی یان حکوومەتی دوو حیزبی، یان حیزبێك زۆرینە و حیزبێك کەمینە ـ بەبیرورای من ـ بۆ هەرێمی ئاسایش باش نابێ. باشترین حکوومەت ئەوەیە کە لە هەموو حیزب و کۆمەڵ و رێباز و کەسایەتییەکان پێکهاتبێ. بێجگە لەوەش، ئەگەر حیزبێك لە هەڵبژاردندا کەمتری هێنا، لە حیزبێکی دیکە، ئەوە نابێتە نیشانەی مالوێرانی ئەو حیزبە، یان خراپیی ئەو حیزبە، بەڵکوو پێویستە ئەو حیزبە بەبەرنامە و هەڵسوکەوتی خۆیدا چاویکێڕێتەوە و بیانگونجێنێ لە گەڵ بەرژەوەندی و ویستی جەماوەری خەڵکەکە. جارێکی دیکەش دووبارەی دەکەمەوە بۆ باری ئەورۆی کوردستان واباشە حکوومەتێکی نەتەوەیی گشتگر لە هەموو حیزب و کۆمەڵ و کەسایەتییەکان دروست ببێ و هەموو لایەك بەرپرسیاری بگرنە ئەستۆی خۆیان.

**هاوولاّتە بەرێزەکان!**

تا ئێرە باسی خۆمان و پێوەندییەکانی خۆمانمان بە داگیرکەرانەوە کرد، ئەوجا با ئێستە سەرنجێکی هەڤالبەندیی داگیرکەرانی کوردستان لە نێوخۆیاندا و، لە سنوورێکی ئینتەرناسیۆنالیدا بدەین! وەك گوتمان، داگیرکەرانی کوردستان لە نێوخۆیاندا دژ بە یەکن و بە خوێنی سەری یەك تینوون، بەلاّم بەرامبەر بە کورد هەموو لە گەڵ یەك رێکن. بێگومان داگیرکەرانی کوردستان دوژمنی دەرەکییان زۆرە، بەلاّم دوژمنە دەرەکییەکانیان وەك یەك نین تا هەموو پێکەوە یەك بەرە پێك بهێنن دژیان، بۆوێنە: کاتێك کە رژێمی سۆڤێت هەبوو، عێراق و سووریا هەڤالبەندی رژێمی سۆڤێت بوون. سووریا دژ بە دەوڵەتی ئەمریکا بوو. دەوڵەتی ئەمریکاش دژ بە دەوڵەتی سووریا بوو. ئێران لە سەردەمی شادا پێوەندیی باشی لە گەڵ ئەمریکا و سۆڤێت هەبوو، بەلاّم رژێمی ئیسلامی ئێران دوژمنی ئەمریکایە و رێکە لە گەڵ سۆڤێت و دەسکەلاکانی سۆڤێت. دەوڵەتی ترك لەوەتی دامەزراوە،

هەڤاڵبەندی دەوڵەتانی رۆژئاوایە و سووتێکی زۆریشی لە رژێمی سۆڤیێت وەرگرتووە. عێراق و سووریا و ئێران دوژمنی ئیسرائیلن، بەلاّم دەوڵەتی ترک هەڤاڵبەندی ئیسرائیلە. سووریا هەڤاڵبەندی یۆنانستانە، بەلاّم دەوڵەتی ترک هەرەشەی جەنگ لە یۆنانستان دەکا و، ٤٠٪ ی خاکی قوبرسی لە یۆنانییەکانی ئەوێ داگیرکردووە. دژایەتی ئەمریکا و ئیسرائیل بەرامبەر بە سووریا و عێراق و ئێران، وای لەم سێ دەوڵەتە کردووە، هەرچەندە سووریا و ئێران دژ بە عێراقیشن، جۆرە نێزیکی یەك لە نێوانیاندا دروست ببێ. ئیسرائیل کە لە شەستەکانەوە هەتا هەرەسهێنانی شۆرشی ئەیلوول (مارتی ١٩٧٥) پێوەندیی توندوتۆڵی لە گەڵ کاربەدەستانی شۆرشی ئەیلوول هەبوو، پاش پەیمان بەستنی لە گەڵ دەوڵەتی ترك، وا کەوتووەتە دژایەتیکردنی کورد. **سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل نەتانیاهوو بێ پەردە بە پەیامنێری رۆژنامەی (الحیاة)ی عەرەبی گوت کە دژی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردییە. دەبێ ئەوەش بزانین کە ئیسرائیل زۆر سووتی لە کورد وەرگرتووە. هەزاران جوولەکەی ئێران و عێراق کە مەترسی مەرگیان لە سەر بوو لە رێی کوردستانی ژێردەسەلاّتی پێشمەرگە و شۆرشی کوردەوە رایان کردووە و بە یارمەتیی کورد لە کوشتن رزگاریان بووە.**

دەبێ ئەوەش بزانین کە هەر دەوڵەتە عەرەبەکان نین کەخەون بە یەکێتی یەکی عەرەب، واتە ئیمپراتۆرێتی یەکی عەرەبەوە دەبینن کە لە ئۆسیانی ئەتلەسییەوە تا کەنداو (خەلیج) بگرێتەوە، بەڵکوو دەوڵەتی ترکیش هەر لە سەرەتای دروست بوونییەوە خەونی دەوڵەتێکی تۆرانی دەبینێ. دەوڵەتی ترك پاش ئەوەی لە جەنگی جیهانی دووەمدا لە گەڵ **رژێمی هیتلەر** بەدزییەوە کەوتبووە وتوویژ و بەڵێنی دامەزراندنی **دەوڵەتێکی تۆرانییان** لە رژێمی **هیتلەر** وەرگرتبوو، لە کاتی سەرکەوتنی ئەلمانیا لە جەنگدا، کەچی هێشتا جەنگ تەواو نەبوو بوو، بەلاّم گومان لەوەدا نەمابوو کە ئەلمانیا دەیدۆرێنێ، بای دایەوە و کەوتە داخۆیانی کردنی جەنگ دژی ئەلمانیا و، خۆی کرد بە دۆستی ئەمریکا و ئەورووپا و هێدی هێدی بوو بە ئەندامی بەرەی ناتۆ. **پاش رووخانی دەوڵەتی سۆڤێت و دامەزراندنی چەند دەوڵەتێکی ترکزمان لە سەر داروپەردووی سۆڤێتی کۆن، دەوڵەتی ترك دەیەوێ بە پشتی ئەمریکا و ئەورووپا ئەو ئەمپراتۆرییە تۆرانییە بهێنێتە دی** و، هەر بە پشتی ئەمریکاش نەوت

و گازی ئازەربایجان لە باکۆوە بە ڕێی خاکی باکووری کوردستانی ژێردەستی ترکدا بگوێزێتەوە بۆ ئەورووپا. جا هەرچەندە ئەمریکا هەڤاڵبەندی دەوڵەتی ترکە، بەلاّم بوونی **لۆبیی یۆنان و ئەرمەنی لە ئەمریکا**، کاربەدەستانی ئەمریکای هێناوەتە سەر ئەو باوەڕە کە نە مەسەلەی **قوبرس** و نە مەسەلەی کورد بەزۆری چەکی ترک چارەسەر دەکرێ. لە گەڵ ئەوەشدا ئەمریکا هەوڵی ئەوەش دەدا کە دەوڵەتی ترک لە یەکێتیی ئەورووپادا وەربگیرێ. شایانی باسە، زۆربەی دەوڵەتانی ئەورووپا رازی نین بەوەی دەوڵەتی ترک ببێتە ئەندامی یەکێتیی ئەورووپا و چەند ملیۆنێک ترک برژێنە ئەورووپاوە، بە تایبەتی ئەلمانیا. **ترکەکان خۆیان دەبێژن ئەورووپا بۆیە ترکی ناوێ، چونکە ترک موسوڵمانن. راستی یەکەی هۆیەکەی ئەوە نییە، یان هەر ئەوە نییە. بێ هێزی ئابووریی ترک، لە کاتێکدا کە دەوڵەتی ترک ببێتە ئەندامی یەکێتیی ئەورووپا، رێ دەکاتەوە بۆ کۆچ کردنی ملیۆنان ترک بۆ ئەورووپای شلکە لێ کەوتووی بێکاری. هەروەها مانی کێشەی قوبرس بێ چارەسەرکردن و بوونی یۆنانستانی دژ بە ترک وەک ئەندامێکی یەکێتیی ئەورووپا، هەموو ئەمانە** بەرهەڵستییان لە رێی بوونە ئەندامەتیی ترکدا دروستکردووە. **جا لە بەر ئەوەیە کێشەی مافی مرۆڤ و، لە پاڵ ئەوەشدا چارەسەر نەکردنی دۆزی کورد دەکرێن بە بیانوو بۆ رێگرتن لە ئەندامەتیی ترک.** هەر لە بەر ئەوەشە کە دەبینین لەم دوواییەدا گەلێک کۆنگرەی زانستانە و رامیاریانە بەستران بۆ باسی دووارۆژی دەوڵەتی ترک، وەک **کۆنگرەی ئینستیتۆی ASPEN لە بەرلین** کە لەم کۆنگرەیەدا پسپۆڕانی ئەمریکایی و ئەورووپایی و ترک بەشدار بوون و گەلێک رەخنە لە دەوڵەتی ترک گیرا. هەروەها کۆنگرەی سۆسیال دێمۆکراتەکانی ئەورووپا کە لە هاوینی ئەمساڵدا (١٩٩٨) لە نەمسا گیرا بە تایبەتی بۆ باسی کێشەی کورد کە نوێنەری زۆربەی زۆری حیزبە گەورەکانی کوردستان بانگێشت کرابوون. ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە **هەڵوێستی سۆسیال دێمۆکراتەکانی ئەورووپا کە بە درێژایی ئەم سەتەیە جارویار و، بە پێی پێویست و بەرژەوەندیی خۆیان لە کێشەی کورد دوواون، تا ئێستە بۆچوونیان بەرامبەر بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد نەگۆڕاوە، واتە هەتا ئێستەش کێشەی کورد بە کێشەی کەمایەتییەک دەدەنە قەڵەم کە بەلای وانەوە دەبێ لە سنووری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا چارەسەر بکرێ، بە دانی مافی کولتووری بە**

**کورد، نەك وەك نەتەوەیەکی دابەشکراوی وڵات داگیرکراو.**

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە دەوڵەتی رووسیا لە رێی **«کۆمیتەی هاوکاری و پشتیوانیی گەلانی ئاسیا و ئەفریقا»** و بە ئامادەبوونی مادڤیدکو بەرپرسیاری وەزارەتی دەرەوەی رووسیا و ئامادەبوونی نوێنەرانی **پارتی دێمۆکراتی کوردستانی عێراق و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پی کی کێ** لە ٦/٤/ ١٩٩٨دا کۆنفرانسێکی لە مۆسکۆ ساز کرد لە ژێر نێوی **«مەسەلەی کورد لە سەردەمی ئێستەدا»**، **کە کێشەی کورد لە باری بەرژەوەندیی دەوڵەتی رووسیاوە باسکرا**. شایانی باسە **دەوڵەتی رووسیا، چ لە سەردەمی قەیسەردا و چ لە سەردەمی سۆڤێتدا و چ لەم سەردەمەشدا هیچ کاتێك یارمەتیی کوردی نەداوە، بەڵام لە هەموو سەردەمێکدا مەسەلەی کوردی بۆ سووتی خۆی بەکار هێناوە و دەستی کوردی بڕیوە.** کە دەبێ ئەم رەوشە لە لایەن کوردەوە کۆتایی پێ بهێنرێ.

لە لایەکی دیکەشەوە، وڵاتە عەرەبییەکانیش کە دژی هەڤاڵبەندێتی دەوڵەتی ترك و ئیسرائیلن و لە پارچە پارچە بوونی عێراق دەترسن، هەوڵی بەستنی کۆنفرانس دەدەن بۆ وتووێژ لە بارەی کێشەی کوردەوە. **دوکتۆر ئەحمەد حەمرووش (دکتور احمد حمروش) سەرۆکی لیژنەی هاوکاریی ئافرو ئاسیایی میسری (رئیس لجنة التضامن الافرواسیویة المصریة)** لە ٢٧ و ٢٨ی مایسی ئەمساڵدا (١٩٩٨) لە قاهیرە کۆنفرانسێکی بەست بە نێوی **«وتووێژی عەرەبیی کوردی» (الحوار العربی الکردی)**. بەداخەوە بۆ ئەم کۆنفراسە هەر پارتی و یەکێتی و حیزبە کوردییەکانی عێراق بانگهێشت کرابوون لە گەڵ چەند کەسێك کە ئەم حیزبانە دەستنیشانیان کردبوون. ئەنجامی کۆنفرانسەکە پتر بە سووتی **«یەکێتیی خاکی عێراق»** و **«پاراستنی سنووری عێراق»** بوو نەك بە سووتی کورد. کێشەی کوردی باشووری کوردستان وەك کێشەیەکی نێوخۆیی عێراق درایە قەڵەم، لە بەر ئەوە کۆبوونەوەکە نەك هەر بە سووتی کورد نەبوو بەڵکوو زیانیشی هەبوو.

بە پێچەوانەی ئەم کۆنفرانسانەی سەرەوە کە کێشەی کوردیان وەك کێشەیەکی لاوەکی و نێوخۆیی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان خستە بەرچاو، جڤینە تەلەفزیۆنییەکەی **تەلەفزیۆنی «جزیرە» لە قەتەر (قطر)** کە بە **«نێوی رێبازی پێچەوانە» (الاتجاه المعاکس)**ەوە پێشکێش کرا و لەوێ دا **مامۆستا جەواد مەلا**

**وەك سەرۆكی كۆنگرەی نیشتمانیی كوردستان و لایەنگری سەربەخۆیی كوردستان و تەمیمی بەرازی (تميم البرازي) وەك عەرەبێكی سەربە رژێمی بەعسی عێراق و دژ بە سەربەخۆیی كوردستان** كەوتنە وتووێژ، هەروەها ئەو وتووێژەی تەلەفزیۆنی **«جزیرە»**، لە گەڵ بەڕێز **میشعان جبوری** (میشعان جبوری) كە لەوێ میشعان جبوری پشتگیریی سەربەخۆیی كوردستانی كرد، سووتێكی یەكجار زۆریان هەبوو. هەموو وتووێژەكە كێشەی كوردیان وەك نەتەوەیەك كە داوای سەربەخۆیی دەكا بە گەلانی عەرەب گەیاند. **راستییەكەی جێی داخە، لە كاتێكدا مامۆستا جەواد مەلا ئاڵای كوردستانی خستە سەر مێزەكە و گوتی «ئەمە چارسەری كێشەی كوردە» نوێنەری پارتی دێمۆكراتی كوردستان لە سەلاحەدینەوە تەلەفۆنی كرد و گوتی «حیزبی ئێمە (پارتی) داوای سەربەخۆیی ناكا، بەڵكوو داوای مافی كولتووری كورد دەكا، لە باكووری عێراقدا».** هەر پاش ئەوەش رۆژنامەی **«المنارالكردي»** كە زمانی حاڵی **یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانە لە ئەورووپا**، دەستی كرد بە پەلاماردانی مامۆستا جەواد مەلا و تەلەفزیۆنی جزیرە، چونكە باسی سەربەخۆیی كوردستانیان كردووە. ئەم هەڵوێستانەی یەكێتی و پارتی نیشانی دەدا كە ئەو كوردانەی سەربەخۆن (ناحیزبین) و پێشمەرگەیان نییە پتر دەوێرن باسی سەربەخۆیی كوردستان و مافی كورد بكەن لەو حیزبانەی كە لە گەڵ دەوڵەتە داگیركەرەكانی كوردستاندا پێوەندییان هەیە. ئەوجا ئەوەش وەك شەرمەزارییەك لەو لاوە بوەستێ كە میشعان جبوری باسی سەربەخۆیی كوردستان بكا و حیزبەكانی كوردستان لە دژی سەربەخۆیی كوردستان قسە بكەن.

**هاووڵاتە بەڕێزەكان!**

لێرەدا پێویستە باسێكی ئەوەش بكەم كە گەلانی لە لایەن دەوڵەتی تركەوە زیان لێدراویش خۆیان لە یەك نێزیك دەكەنەوە. بۆ وێنە **ئازادیخوازانی كورد و یۆنانی و ئەرمەنی و قوبرسیش** لە بەرلین كۆنگرەیەكیان لە رۆژی ١٩٩٨/٥/٢٤ دا لە هۆڵی زانستگەی تەكنۆلۆژی لە بەرلین بەست بە بۆنەی **ساڵرۆژی گەلكوژی (جینۆساید)ی یۆنانییە پۆنتی یەكان** كە لە ٢٥ی مانگی پێنجی ساڵی ١٩١٦ دا روویدا، واتە ساڵێك دووای گەلكوژی ئەرمەنییەكان كە بە دەستی حكوومەتی

**«جۆن ترکەکان»** رووی دا. کۆنگرە لە ژێر درۆشمی **«یەك تاوانکار، چەند گەلێکی جیاوازی قوربانی کراو، بە ملیۆن مرۆڤی تەفروتوونا کراو»** بەسترا. لەو کۆنگرەیەدا سەتان پێوەنداری ئەم گەلانە ئامادە بوون، کە لەوێ دا بە نێوی **«جڤاتی کورد لە بەرلین»** **ووتارێکم پێشکێش کرد لە ژێر نێوی «هێشتا بە بەرێ یەوە ماوە کە گەلی کورد لە تەفروتوونا کردن رزگار بکرێ».** هەر لەو سەمینارەدا باسی مێژووی سەرهەڵدانی **بیری تۆرانیزم و گرسەندنی تۆرانێتیم** لە نیوەی سەتەی رابوردوودا کرد. ژمارەیەکی زۆر لە پێوەندارانی کورد و ئەرمەنی و یۆنانی و سرب و قوبرسی و ژمارەیەکی زۆر ئەلمان و ترکیش هاتبوون. وتوویژێکی زۆر گەرم و گورِ بەلاّم بابەتانە، گەلێك لایەنی کێشەی کورد و کێشەی گەلانی لە سەمینارەکەدا بەشداربووی رۆشن کردەوە. لایەنگرانی پیێ کێ کێ نەهاتن بۆ ئەو کۆبوونەوەیە.

**بەرێزینە!**

دەبێ ئەوە بزانین کە گەلێك کێشەی سووتێنەر هەن لە رۆژهەلاّتی ناڤیندا کە پێوەندیی راستەوخۆیان بە داگیرکەرانی کوردستانەوە هەیە. بۆوێنە: کێشەی قوبرس و دەوڵەتی ترك، کێشەی ئەفغانستان و ئێران کە لەوانەیە جەنگی گەورەی لێ ببێتەوە، وەك جەنگی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق. کێشەی بلووچستان و دەوڵەتی ئێران کە لەوانەیە بلووچستان بە یارمەتی ئەفغانستان و پاکستان خۆی لە ئێران جیا بکاتەوە. هەروەها دوژمنایەتی و ناکۆکی دەوڵەتەکانی ترك و رووسیا. ئیسرائیل و کێشەی فەلەستین، کە چارەسەر کردنی هەمیشەیی بەم زووانە نابێ، بەتایبەتی فەلەستینییەکان دەیانەوێ داخۆیانی دەوڵەتی سەربەخۆی فەلەستین بکەن و قودس بە پێتەختی خۆیان بزانن. هەروەها کێشەی بەربەرەکان لە جەزائیر و تونس و مەراکیش لە دژی داگیرکەرانی عەرەب. هەروەها کێشەی گوشینی یەکان لە باشووری سۆدان. هەروەها کێشەی قیبتی یەکان لە میسر و کێشەی خوددامەکان (الخدام) لە یەمەن و کێشەی موسوڵمانە مەلا فەرمانییەکان لە جەزائیر و میسر، ئەوجا هەڕەشەی ئێران و ئیسرائیل لە یەك کە دوور نییە شەڕ بقەومێ لێی. هەروەها کێشەی **«حەماس» (الحماس) و «جهادی ئیسلامی» (الجهاد الاسلامی) و ئەمەل (الامل) لە لوبنان و فەلەستین و ئیسرائیل.** هەروەها هەڕەشەی دەوڵەتی ترك لە سووریا کە لەوانەیە شەڕی

لێ ببێتەوە. بێجگە لەمانەش، لە جیهاندا گەلێك کێ بەرکێ هەیە وەك **یەکێتیی ئەورووپا دژی سەروەریتیی ئەمریکا** کە جارێ بەنێوی یەکگرتوو (ئویرۆ) دەستی پێکردووە. هەروەها هەوڵدانی ژاپۆن بۆ پێشڕەویی ئابووری، هەوڵدانی چین بۆ بوونە زلهێزێکی وەك ئەمریکا. ئەوجا کێشەی هیند و پاکستان و هەڕەشە لەیەك بە چەکی ئەتۆمی و دۆزی **کشمیر** (١٣) ئەوەشمان لە بیرنەچێ کە کێشەی هەرەسهێنانی سیستەمی ئابووری لە رووسیا و ولاتانی ئەورووپای رۆژهەلات، وای لە کۆنە کۆمۆنیستەکان کردووە کە جارێکی دی سەریان هەلبڕنەوە. لە هەمانکاتدا مافیا و شڕەخۆریی لەم وولاتانە بە تایبەتی لە رووسیا بووەتە بەرنامەی رۆژانە. شان بە شانی ئەمە کێشەی بێکاری کە ژمارەی بێکاران رۆژ بە رۆژ بەرەو بەرزییە لە ئەورووپای رۆژاوادا، بەتایبەتی لە ئەلمانیا گوڕوتینی داوەتە پەرگڕەکان (ئێکستریمیستەکان) و، رەگەزپەرستان و، بزووتنەوەی نازیتی لە ئەلمانیادا بەهێزتر کردووە.

**بەشدارانی بەڕێزی کۆنگرە!**

**کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان** پێویستە هەموو ئەم کێشە جیا جیانە بخاتە ژێر هوردەبینی لێکۆلینەوە و هەلوێستی خۆی بەرامبەریان دەسنیشان بکا. ئەوەی هەموو خاوەن هەست و هەقویستێك پێی دەزانێ و، ئەوڕۆش بە بەلگەوە باشتر رۆشنان کردەوە ئەمەیە کە **سیاسەتکارانی کورد و رێکخراوەکانی کوردستان لە ئاستی ئەو بارودۆخەدا نین کە بەسەر کوردستان و رۆژهەلاتی ناڤین و جیهان دا تێدەپەڕێ.** کوردستان پێویستی بە هەموو کوردێکە بۆ رزگاربوونی. هەوڵدانی حیزبێك، یان تاقمێك، یان دەستەیەك بە تەنێ، ناتوانێ ببێتە هۆی رزگارکردنی کوردستان. هەروەها هەوڵدانی حیزبێك، یان دەستەیەك، یان تاقمێك بۆ نەهێشتنی حیزبێك و تاقمێك و دەستەیەکی دیکە لە خۆکوژی بەولاوە هیچی دیکە نییە. ئەوجا ئێستە بۆ ئەوەی رۆنتر بیخەمە بەرچاو کە ئەم حیزب و کۆمەلە و رێکخراوانەی کوردستان لە پایەی رووداوەکاندا نین، پێویستە ئەو کارانە بخەینە بەرچاو کە لە پاش جەنگی دووەمی کەنداوەوە، واتە لە مانگی نیسانی ١٩٩١ ەوە کە هەرێمی ئاسایش دامەزراوە بە نێوی: Operation Provide Comfort کە دەیانتوانی بیکەن، بەلام نەیانکردووە:

(١) ـ دەیانتوانی کاتێك کە سەددام هێزەکانی خۆی لە سێ ستانی هەولێر و سلێمانی و دهۆك کێشایەوە، ئەوانیش دەسبەجێ بانگی سەربەخۆیی ئەو نێوچەیە بدەن. ئەوجا ئەگەر بهاتایە و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی دیکە پەلاماریان بدایەتە سەر ئەو نێوچەیە، ئەوا ئەو دەم چونکە خۆشەویستیی نێونەتەوەیی بەرامبەر بە کورد بەهێز بوو، **سەرۆك فرانسوا میترانیش** هێشتا مابوو، ئەوا لە گەلێك لاوە یارمەتی کورد دەدرا. خۆ ئەگەر سەربەخۆیی ئەو نێوچەیە سەری نەگرتایە، ئەوا هەر بە بەرژەوەندیی کورد تەواو دەبوو. **لەوانەش بوو هەرێمی ئاسایش ببێتە پرۆتێکتۆراتی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، یان هی هەر دەوڵەتێکی دیکەی رۆژئاوایی.**

(٢) ـ دەیانتـــوانی پاش ئەوەی **پەرلەمانی کوردستان** دەنگی بۆ **سیستەمی فیدەراڵی** دا، **کۆماری فیدەراڵی کوردستان** دەسبەجێ یەك لایەنە داخویانی بکەن و، **دەستوورێکی بنچینەیی** بۆ کۆماری فیدەراڵی کوردستان دابنێن و، لە هەڵبژاردنێکی گشتی دا سەرکۆمار دەستنیشان بکەن و، **ئالأی کوردستان** بخەنە سەر پەرلەمان و شوێنە گشتییەکان. ئەو حەلە **کۆماری فیدەراڵی کوردستان** ئەگەر هیچ دەوڵەتێکیش بە رەسمی دانی پێدا نەنایە، **دێ فاکتۆ** Defacto دەبوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. **کۆماری ترکەکانی قوبرس**، هیچ دەوڵەتێك بێجگە لە دەوڵەتی ترك دانی پێدا نەناوە، بەڵام دێ فاکتۆ دەوڵەتێکە و هەیە.

(٣) ـ دەیانتوانی سەرژمێرێکی گشتی بکەن لەو هەرێمەدا کە بەدەستیانەوەیە، تا بزانن ژمارەی کورد و ناکورد چەندە. **ئایە ترکمانەکان بە راستی سێ ملیۆن و نیون وەك تانسووچیلەر و ترکمانەکان خۆیان دەفەرموون.** ژن چەندە و پیاو چەندە، خوێندەوار و نەخوێندەوار چەندن. داهاتی ساڵانەی تاکە سەرێك چەندە. داهاتی گشتی چەندە. ژمارەی بێکاران گەیشتووەتە چەند. رووبەری زەوی کشتوکاڵی چەندە. چەند کرێکار و چەند جۆتکار و چەند فەرمانبەر هەن. بێگومان تا **سەرژمێرێکی گشتی** نەکرێ، هیچ پلان و نەخشەیەك ناتوانێ دابنرێ.

(٤) ـ دەیانتوانی **دراوێکی هەرێمی** بۆ کوردستان دروست بکەن بۆ کاروباری نێوخۆیی هەرێم، یان هەمـوو کاروبارێکی دراویی بکەنە دۆلار. چونکە تا دیناری عێراقی بەکار ببەن، ریشیان هەر بە دەست سەددامەوە دەبێ و هەر کاتێك سەددام بیەوێ، دینارەکەی دەگۆڕێ، وەکوو کردی و زیانێکی زۆری لە کورد دا.

**(٥)** ـ دەیانتوانی **هێزی پێشمەرگە هەڵوەشێننەوە** و، لە جیاتی ئەوە **سوپایەکی کوردستانی** دروست کەن بە سەرۆکایەتیی پسپۆری سوپایی. ئەو دەم ئەم شەڕە گەڕەکە و کێ بەرکێیی **«پێشڕەوی»** و حیزب حیزبێنەش رووی نەدەدا. رووشی بدایە چەند دەوری تێدا نەدەدی.

**(٦)** ـ دەیانتوانی **هێزێکی پۆلیسیی کوردستانی** دروست کەن. هێندێك لە دەوڵەتەکانی ئەورووپا ئامادە بوون پۆلیس بۆ کورد پێ بگەیەنن. ئەوکاتە جل و بەرگ و ویستەمەنی کادری پۆلیسییان بە خۆڕایی وەردەگرت. دەوڵەتی ئەڵمانیا کاتی خۆی بەڵێنێکی وای بە **مام جەلال** دابوو. ئەمەش پێش ١٩٩٤/٥/١ بوو، واتە ئەو کاتەی کە هێشتا **شەڕی پارتی و یەکێتی** دەستی پێ نەکردبوو.

**(٧) ـ دەیانتوانی خۆیان پتر لە ئەمریکا و فەرەنسای سەردەمی بەهەشتی میتران و، هێندێك دەوڵەتی دیکەی ئەورووپا نێزیك بکەنەوە و، چەند فرگەیەکی ئینتەرناسیۆنالی لە رێی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە کە سەرپەرشتیی هەرێمی باشوور دەکەن، لە هەرێمدا دروست بکەن بۆ پێوەندیکردنی راستەوخۆ بە دەرەوە.** ئەوسا دەیانتوانی گەلێك کالاّ و کەلوپەلی پێویست بهێننە کوردستانەوە و بە زووترین کات و، منەتی داگیرکەرانی کوردستان هەڵنەگرن. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی دووایی دا مەسەلەی دروستکردنی فرگەی کوردستانم چەند جار بە نامە بۆ **کاك مەسعوود و مام جەلال** نووسیوە.

**(٨)** ـ دەیانتوانی **لە کاتی وتووێژی پاریسدا ١٦ ـ ١٩٩٤/٧/٢٢ پرۆژەکەی بەهەشتی میتران ئیمزا بکەن و، بیکەنە بەڵگەیەکی ئینتەرناسیۆنالی بۆ دووارۆژی هەرێم و فراوانکردنی.** ئەگەر وابوایە، ئێستە چوار ساڵ بوو ئاشتی بنبەست ببوو و، لەوانەش بوو کەرکووك و مووسڵ، یان هیچ نەبێ کەرکووك، بخرێتە سەر **«هەرێمی ئاسایش»**.

**(٩)** ـ دەیانتوانی **پرۆژەی دەرهێنانی نەوت لە هەرێمی ئاسایش دا بخەنە سەر پێ.** بەتایبەتی **بەڕێز سەردار پشدەری** و هاوکارەکانی، وەك خۆیان باسی دەکەن، هەلومەرجیان بۆ ئەو پرۆژەیە ئامادە کردبوو.

**(١٠)** ـ دەیانتوانی **ژمارەیەکی زۆر خوێندکار بنێرنە دەرەوەی وڵات بۆ** خوێندنی بابەتی پێویست وەك **تەکنیکی کامپیووتەر و هەندازیاریی مەکینە و**

**فرۆکەوانی.** لێرەدا بەتایبەتی سووت لە دەوڵەتی رووسیا و ئەورووپای رۆژهەڵات دەبینرا کە باری ئابووری یان زۆر خراپە و ئامادەن بە پارەیەکی کەم خزمەتی باش پێشکێش بکەن.

**(١١) ـ پەرلەمانی هەرێمی ئاسایش یەکەمین پەرلەمان بوو لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا کە بە شێوەیەکی دێمۆکراتی هەڵبژێردرابێ، پاش پەرلەمانی ئیسرائیل.** ئەمەش بەڵگە و بناخەیەکی پتەو بوو بۆ کورد کە پێوەی بنازێ و داوای ئەوە بکا وەك **جێگرەوە (ئالترناتیڤ)** یێك بۆ رژێمە تیرۆریستەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بە رەسمی بناسرێ. بەڵام شەڕ و بەگژ یەکدا چوون و خوێنڕێژی و نابەرپرسیارێتی بەرامبەر وڵات و نەتەوە، **دەمی هەموو دوژمنانی کوردی کردەوە و دەمی هەموو دۆستانی کوردی داخست.**

**(١٢) ـ** دەیانتوانی **لە نێو هەرێمی ئاسایش دا هیچ نەبێ کێشەی تەلەفۆن و پۆستە و کارەبا و ئاوی خواردنەوە چارەسەر بکەن.** لە ئەورووپاوە تەلەفۆن دەکرێ بۆ هەرێمی ئاسایش، بەڵام **لە سلێمانی یەوە بۆ دهۆك و لە دهۆکەوە بۆ هەولێر و لە کۆیەوە بۆ چەمچەماڵ و هەڵەبجە و کەلار تەلەفۆن ناکرێ.** پۆستەش دەبێ لە دەرەوەی هەرێمی ئاسایش (بۆوێنە لە ئەورووپا و ئەمەریکاوە) بە دەستی بچێ و لە سەر سنوورەکان پۆلیسی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دەستی بەسەردا دەگرن.

**(١٣) ـ** دەیانتوانی **داهاتی کوردستان دادپەروەرانە دابەش بکەن.** چونکە **داهاتەکەی** مالی هەموو کوردە، نەك مالی یەك حیزب. زۆر جێی داخە کە کاربەدەستێکی حکوومەتی کوردستان لە سلێمانی شەش مانگ مووچە وەرنەگرێ. ئافەرینیشیان لێ بێ کە بەو جۆرەش واز لە خزمەتکردن ناهێنن. مەگەر هەر دەوڵەتی رووس وای بەسەر هاتبێ کە مانگانەی کاربەدەستەکانی پێ نەدرێ. **سەرۆکی رووس بۆریس یەلتسین هیچ نەبێ لە باتی پارە ڤۆدکا دەدا بە کاربەدەستەکانی، ئەمان ماستاویش نابەشنەوە لە جیاتی پارە.**

(١٤) ـ دەیانتوانی **ئەو پارەیەی کە دەیدەن بە چەك و تفاقی جەنگی بۆ یەك کوشتن پاشکەوتی بکەن** و لە رێی دامەزراندنی ژێرخانی ئابووریدا بیخەنە کار.

**(١٥) ـ** دەیانتوانی ئەگەر ئەم شەڕ و هەڵڵایەیان نەکردایە، پتر لە یەکدی نێزیك ببنەوە و ئەودەمە رێ ئامادە دەبوو، یان بۆ یەکگرتنی هەردوو حیزبەکە (پارتی و

یەکێتی) و **پێکهێنانی حیزبێکی سۆسیال دیمۆکراتی بەهێز**، یان یەکگرتن لە بەرەیەکی نیشتمانی دا. ئەوددمە دەیانتوانی جەماوەرێکی یەکجار فراوان کە ئێستە سەربەخۆ وەستاون، یان دژ بە هەردوو لان، بهێننە نێو ریزەکانی خۆیانەوە و، ئەوەش بە سووتی خۆیان و کورد تەواو دەبوو.

**بەشدارانی بەرێز!**

وەك بۆمان دەرکەوت، دوواڕۆژی نەتەوەی کورد لە بەر رۆشنایی ئەم بارودۆخەی ئەڕۆدا تەمومژاوییە. ئەوجا ئێمە بەدەست خۆمانە ئەو تەمومژە رابدەین یان پتر لە ئێستە چڕەدووکەڵی شەڕەگەرەکی نێوخۆشمانی بخەینە سەر. سەرکەوتن و بەختیاریمان لە دوواڕۆژدا، **تەنێ یەك رێیە و بەس: رێی دیمۆکراتی و رێزگرتن لە بیرورا و مافی یەك، پێکەوە تێکۆشین شێلگیرانە بەرەو ئامانج، پاراستنی ئاشتی و چارسەر کردنی کێشەکان بە وتووێژ، راگرتنی بەرژەوەندیی گشتی لە سەروو بەرژەوەندیی تایبەتی و بنەماڵەیی و حیزبایەتی و هۆزایەتی و نێوچەییەوە. ئەوەش نەك هەر بە قسە بەڵکوو بە کردەوە. بەکورتی دەبێ ئەوانەی دڵسۆزن بزووتنەوەیەکی جەماوەریی نەتەوەیی فراوان بهێننە کایە لە شێوەی دەستپێشکەریی رۆشنبیرانەدا، نەك لە شێوەی رێکخراوێکی حیزبیدا کە بانگی خۆپەرستی و خۆ بەزلزانین و بەرچاوتەنگیی سیاسی بدا بەگوێمان دا.**

**بەشدارانی بەرێزی سەمینار!**

بەم شێوەیە قسەکانی ئەورۆی من لەم سەمینارەدا کۆتایی هات. هیوام وایە سەرم نەیەشاندبن بەڵکوو کارێکی وام کردبێ کە زات بنێمە بەر هێندێکتان بۆ هێنانە سەر زمانی ئەو هەستەی کە لە نێو دڵ و دەروونی هێندێکتان دا پۆنگی خواردووەتەوە و رووی ئەوەتان نییە دەریببڕن. خۆ ئەگەر قسەیەکیشم کردبێ و بووبێتە هۆی دڵشکانی هێندێکتان، ئەوا تکایە لێم ببوورن. **چونکە هەق رەقە و ئەز هەر کەسێکم خۆش بوێ، درێخی ناکەم لەوەی لە گەڵی راست و رەوان بم.ئەوجا پێی خۆش بێ یان پێی تاڵ بێ، ئەوە بەلامەوە وەك یەکە.** لەم رووەوە بەتەنگ دڵی کەسەوە نیم. کوردیش لە کۆنەوە گوتوویانە: **«دۆست ئەوەیە دەتگرێنێ و دوژمن ئەوەیە دەتکەنێنێ».** هیوام وایە پاش ئەم گریانە دووورودرێژەمان، بەم زووانە

هەمووومان پێکەوە دەست بە پێکەنین بکەین و گاڵتەمان بە هەڵسوکەوتی رابوردووی خۆمان بێ، بەنیازی راستکردنەوە و لێ فێربوونی.

**سەربەرزی بۆ بیری ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ!**

**سەرکەوتن بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی کورد و هەموو لایەنەکانی بێ جیاوازی!**

**ئافەرین لە ئێوەی بەرێز کە ئەم کۆنگرەیەتان بەکردەوە خستە سەرپێ!**

**سەرشۆڕی بۆ دوژمنانی نەتەوەی ئازادیخواز و ئاشتی پەروەری کورد!**

**بژی یادی هاوبیری کۆچکردوو رەهبەر جەلال مامەش!**

**بژی کورد و بژی کوردستان!**

# ژێدەرەکان

(١) ـ **کوردستانی سوور!** پاش دامەزراندنی دەوڵەتی سۆڤیێت، کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی دار بە دەستپێشخەری **لێنین**، لە سەرەتای بیستەکاندا دروست بوو. ئەم کۆمارە نێوچەی **کەلباژار و لاچین و کوبادلی و زەنگیلانی** گرتبووە و، کەوتبووە نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان و، هەتا **سنووری رۆژهەڵاتی کوردستان** (ئێران) درێژ بووبووەوە. پاش مـردنی **لێنین**، کاربەدەستە تۆرانی یەکانی ئازەربایجان **ستالین** یان هاندا لە کورد بە نێوی ئەوەوە کە گوایە کورد **«دژی سیستەمی سۆڤیێت و کۆمۆنیزم و داردەستی بەرەی رۆژاوان»**. **ستالین لە کورد** هار بوو و، کۆمارە ئۆتۆنۆمی دارەکەی هەڵوەشاندەوە و، بە هەزاران کوردی ئەو هەرێمەی کۆچ پێدا بۆ **سیبریا و کازاخستان** کـە زۆریان لە رێ مـردن. پاش ئەوە" **کوردستانی سوور**" نووسێنرا بە ئازەربایجانەوە. ئەوجا **ترکە ئازەرییەکان** زمانی کوردی یان رێنەدا بخوێنرێ و، رێشیـان نەدا کـە کـوردەکـان لە تۆمـاری دەوڵەتی و دەزگـە بەرێوەبەرەکاندا خۆیان بە کورد نێونووس بکەن. شایانی باسە کە **کۆمۆنیستەکان و ئەو حیزبانەی بەنێوی «کوردستانی» یەوە کار دەکەن،** شان بە شانی **کۆمۆنیستە عەرەب و ترك و فارسەکان،** ئەم راستی یەیان لە خەڵك دەشاردەوە، هەتا رووخانی ئیمپراتۆریی رژێمی سۆڤیێتی. ئەز وەك تاکە کوردێك باسی ئەم ناڕەوایی یەی رژێمی سۆڤیێتیم دەکرد. لەبەر ئەوە زۆرناژەنەکانی سۆڤیێت بە هەموو جۆرێك بەربەرەکانێی منیان دەکرد، چونکە نەیاندەویست رووی رەشی رژێمی تاوانباری سۆڤیێت و ستالینی مرۆڤخۆر دەربکەوێ. پاش رووخانی رژێمی سۆڤیێت، کوردەکانی ئەوێ، بەپێچەوانەی گەلە ترکەکانی سۆڤیێتەوە کە هەموو دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان پێکەوە نا، نەیانتوانی **کۆماری کوردستانی سوور** دروست بکەنەوە. خاکەکەیان ئێستە بەشێکی لە لایەن **ئەرمەنی یەکان** و، بەشێکی دیکەی لە لایەن ئازەری یەکانەوە داگیرکراوە. کەچی ئەورۆش حیزبە کوردییەکان هەر باسی "چوارپارچە"ی کوردستان دەکەن. ئەم **"چوارپارچە"**ش شتێکی نوێیە، چونکە هەتا چەند ساڵێك لەمەوبەر هەر باسی **"سێ پارچە"** دەکرا، دەیانگوت **"لە سووریا**

**کوردستان نییە".**

**(٢)** — مەبەست لە **«سێمینەی حەدیس»** لە لای کورد ئەو باوەڕە گەلەکی (شعبی) یە کە بە پێی وی گوایە **پەیامبەری موسوڵمانان (د)** گوتوویەتی **ئەگەر شتێك دووجار رووی دا، ئەوا بۆ سێیەمین جاریش روو دەداتەوە.**، بە عەرەبی: **«لایثنی الا وقد یثلث»**.

**(٣)** — پاش مردنی **هەژار** کتێبێك لە لایەن **خانی** کوڕیەوە بە نێوی **«چێشتی مجێور»**ەوە بڵاو کرایەوە. چونکە هەژار وەسێتی کردبوو پاش مردنی بڵاو بکرێتەوە. ئەم **«چێشتی مجێور»**ە بەسەرهاتی هەژارە. ئەز وەك مرۆڤێك کە لە رۆژانی دەربەدەری و تەنگانە و خۆشاردنەوەی هەژاردا لە شاری بەغدا دۆستێکی نێزیکی هەژار بووم و، پێویستی سەرشانی دۆستایەتیی خۆشم بەرامبەر هەژار بەجێ هێناوە و، تەنانەت هەژار ئەم دۆستایەتی یەی بەهۆنراوە باسکردووە، ئەگەرچی هۆنراوەکەی نەخستووەتە نێو پەرتۆکی هۆنراوەکانی یەوە، دیارە ئاگام لە هێندێك لایەنی ژیان و هەڵسوکەوت و، رەوشت و خووی هەژار هەیە و مافی ئەوەشم هەیە یەك دوو قسە لەو بارەیەوە بکەم.

ئەز هەژارم لە سەرەتای پەنجاکاندا لە رێی **مام جەلال**ــەوە ناسی، ئەوەش لە سەر داخوازیی هەژار خۆی، پاش ئەوەی چەند وتارێکی منی لە رۆژنامەکانی بەغدا دا خوێندبووەوە کە بە نێوی خواستەمەنی **«ج ـ کلۆڵ»**ەوە دەمنووسین. هەژار کابرایەکی یەکجار قسەخۆش و گاڵتەزانێکی کەم وێنە بوو. بەرەوڕوو زۆر زمانلووس و لە پاشملەش بە دەگمەن کەسێکی دەبوارد کە تیزێکی پێوەنەکا، یان کرمێك لە دەستی دا نەدۆزێتەوە. لە هۆنراوە داناندا بەهرەیەکی باش و شێوەیەکی رەوانی هەبوو. هەژار دوو تایبەتکاری هەبوو کە مرۆڤ زۆر درەنگ تێیان دەگەیشت. یەکەم: پارەپەرستی و پووڵەکێتی و، دووەم: سپڵەیی و پێنەزانی. پێموایە بەهەشتی **سەرۆك بارزانی** و بەڕێز **جەلال بێتووشی** تەنێ دوو کەسن کە بەرامبەر چاکەکەیان لە گەڵ هەژار پلاری تێ نەگرتبێ. لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە لە «چێشتی مجێور» بکۆڵمەوە، چونکە ئەو هەویرە زۆر ئاو دەکێشێ. بەڵام ئەگەر هێندێك هەواڵ و دەنگوباس و چیرۆکی راست و ناڕاستی لێ دەربکەین، ئەوا کەسایەتیی هەژار بە هەردوو لای **ئەرێتی و نەرێتی** یەوە دەردەخا.

(٤) ــ پاش رووخانی **کۆماری کوردستان** گەلێك کوردی رۆژهەلات دەربەدەر بوون و رایانکردە **«یەکێتی سۆڤێت»**. هەر لەو کاتەشدا گەلێك لە ئەندامان و لایەنگرانی **«فیرقەی دێمۆکراتی ئازەربایجان» و توودەییەکانیش** رایانکردبووە ئەوێ. ئازەری یەکان بەزۆری لە باکۆ جێگیربوون. **ئەوکاتە ستالین میری سەرپەری ئیمپراتۆریتیی سۆڤێت بوو.** ئازەری یەکان بە هۆی **جافەری باقرۆفەوە** کە **«سەرکۆمار»ی** ئازەربایجانی ئەو کاتە و کابرایەکی تۆرانی بوو، توانیان وێستگەیەکی رادیۆ بۆ خۆیان وەربگرن بە نێوی «وێستگەی **رادیۆی دێمۆکراتی ئازەربایجان**»ەوە کە هەموو شەوێك نیوکاتژمێر بە ترکی ئازەری و نیوکاتژمێر بە فارسی و نیو کاتژمێر بە کوردی پرۆگرامی بلاو دەکردەوە. **عەلی گەلاوێژ و رەحیمی قازی** کە دوو کوردی هەلاتوو و ئەندامی **«فیرقەی دێمۆکراتی ئازەربایجان»** بوون، ئەم پرۆگرامە کوردییەیان دەبرد بەرێوە. رۆژنامەیەکیشیان بە کوردی بە نێوی **«کوردستان»**ەوە دەردەکرد، کە ئەوەش وەك پرۆگرامی رادیۆ پرۆپاگەندە بوو بۆ رژێمی سۆڤێت و ستالین. هاوینی سالی ١٩٥٣ و لە ئەنجامی ئەوەدا کە رژێمی **دوکتۆر موسەدیق** دەیویست نێوانی خۆی لە گەل رژێمی سۆڤێت دا چاك بکا، سۆڤێت ئەو رادیۆیەی راگرت. بەلام "**رۆژنامەی کوردستان**" جاروبار دەردەچوو، هەتا ئەو کاتەی **«فیرقەی دێمۆکراتی ئازەربایجان»** و **«حیزبی توودەی ئێران»** یەکیان گرتەوە، ئەوسا رۆژنامەی **«کوردستان»**یش وەستێنرا. لە سالی ١٩٥٦دا **دوکتۆر ئەورەحمانی قاسملو** و چەند برادەرێکی خۆی هەلاتبوونە باشووری کوردستان و بەدزییەوە لە دەوروبەری سلێمانی دەژیان. خودێ لێخۆش بوو **مامۆستا توفیق وردی** پێوەندیی لە گەل هێندێك لەو کوردانە هەبوو و، منیش لە رێی **مامۆستا وردی** یەوە یەك دووانێکیانم ناسی. لە کاتی یەکدی بینیندا باسی ئەوە کرا کە رۆژنامەی کوردستان دەربچێتەوە. پاش ماوەیەك، لە پاییزی ١٩٥٦دا، **دوکتۆر قاسملو** هات بۆلام بۆ قوتابخانەی دووانێوەندیی «موسەللا» لە کەرکووك و خۆی بە نێوی **«هەباسی ئەنوەری»**یەوە بەمن ناساند و گوتی **«لە سەر راسپێری مامۆستا وردی هاتووم بۆ لات و، ئێمە (واتە ئەوان ــ ج. ن) بریارمانداوە کە رۆژنامەی کوردستان دەربکەینەوە، بەلام هیچ پارەمان نییە. لەبەر ئەوە تەمەر (پوول)مان چاپکردووە و ئەو تەمرانە دەفرۆشین و بەپارەکەی رۆژنامەکەمان**

**دەردەکەینەوە.تەمرەکانیشمان لای مامۆستا وردی داناوە. ئەو پارەکە کۆدەکاتەوە و دەیگەیەنێ پێمان».**

لەوە بەدوواوە دەستمان کرد بە چالاکییەکی باش و پارەیەکی چاك کۆکرایەوە بۆیان و، ئەوجا **رۆژنامەی کوردستان**، یان یەك ژمارە، یان چەند ژمارەیەکی کەمی لەو ماوەیەدا دەرچوو.

**(٥)** ـ کاتێك ئەم سەمینارە پێشکێش کرا هێشتا **گێرهارد شرۆیدەر** نەبووبوو بە کانسلەری ئەڵمانیای فیدەراڵ، بەڵام دووایی بوو بە **کانسلەری ئەڵمانیا** پاش سەرکەوتنی حیزبەکەی **(سۆسیال دێمۆکرات)** لە هەڵبژاردندا. **شرۆیدەر** بەرلەوەی ببێتە **کانسلەر، خۆی** زۆر بە دۆستی کورد دەدایە قەڵەم و هاورێتی یەکی زووی هەبوو لە گەڵ هێندێك سیاسەتکار و کەسایەتیی کورد، بەتایبەتی لە گەڵ **جەلال بارزانی،** بەتایبەتی ئەو سەردەمەی کە **جەلال بارزانی لە مارکت هالەی شاری هانۆڤەر** دوکانی خواردەمەنی و خواردنەوەفرۆشی هەبوو لە نێزیك مەڵبەندی حکوومەتی هانۆڤەر و، زوو زوو چاویان بە یەك دەکەوت. وێنەیەکی ئەو سەردەمەم لاهەیە کە **جەلال بارزانی لە نێوان گێرهارد شرۆیدەر و ژنەکەی شرۆیدەرەوە نیشان دەدا.** ئێستە کە شرۆیدەر بووەتە کانسلەری ئەڵمانیای فیدەراڵ، دیارە جەلال خۆشی هەستی بەوە کردووە کە ئەو هاورێیەتییەیان "مۆدێلەکەی بەسەر چووە".

**(٦)** ـ کاتێك ئەم سەمینارە پێشکێش کرا، هێشتا بەرێز **عەبدوڵلا ئۆجەلان (ئاپۆ)** لە **سووریا** بوو، بەڵام دەنگ هەبوو کە سووریا دەیەوێ لە ژێر گوشاری **دەوڵەتی ترك** و رەچاوگرتنی هێندێك بەرژەوەندیی خۆیدا لە سووریا د. ی بکا. دووایی ئەوە بوو لە سووریا دەرکرا و هاتە ئیتالیا و ماوەیەك لە ئیتالیا مایەوە و ئەوجا هێندێك ئەملا و ئەولای کرد تا لە کێنیا گیرا و کەوتە دەست رژێمی ترك و خرایە **زیندانی ئیمرالی یەوە.** بێگومان هەڵوێستی **ئاپۆ** و حیزبەکەی **(پێ کێ کێ)** پێش گرتن و پاش گرتنی پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستانەی بابەتانەی هورد هەیە کە دەبێ بە سەمینارێکی تایبەتی ئەنجام بدرێ، نەك لە ژێدەرێکدا.

**(٧)** ـ خۆشبەختانە **حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران** لەم دووایی یەدا بۆ وتووێژ کردن لە گەڵ رژێمی ئێران هێندێك لەم سەرەتایانەی کردە مەرج. وتووێژی ئاشکرا و بەسەرپەرشتی دەوڵەتێکی بێ لایەن، وەك دەبێژن مەبەستی حیزبی

دێموکرات لەوە دەوڵەتی فەرەنسایە.

**(٨)** ـ ئەم ژێدەرە پاشکۆیەکە کە لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٠ دا نووسراوە.

فڕۆکە جەنگییەکانی دەوڵەتی **ترک** بە بیانووی سەرکوتکردنی چەکدارەکانی پێ کێ کێ وە لە **ڕۆژانی ١٥ و ١٧ی مانگی تەباخ (ئاب)ی ٢٠٠٠ دا** کەوتنە بۆمبابارانکردنی **نێوچەی کەندەکۆ و خنێر** و دەور و پشتیان. لە ئەنجامی ئەم دەستدرێژییە تیرۆریستانەیەدا ٤٤ کوردی خەڵکی باشوور کە زۆربەی زۆریان ژن و زارۆ و شوان بوون شەهید بوون و، لە ٧٠ کەس پتریش بریندار بوون. ڕژێمی ترک لە سەرەتاوە نکۆڵی دەکرد ودەیگوت «شتی وانەبووە». **کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان (K.N.C.) و پارتی دێموکراتی کوردستان (PDK) و پارتی کۆمۆنیستی کوردستان** (PKOK) کەوتنە ئاواڵە کردنی ئەم تاوانە و تەنانەت KNC بلاڤۆکی بە چەند زمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی لەسەر دەرکرد و، ڕۆژنامەی سویسرەیی بەنێوبانگ Neue Zürcher Zeitung لە ژمارە (١٩٦) ڕۆژی ٢٠٠٠/٨/٢٤ دا ئاماژەی بۆ وتووێژێك کردبوو کە لە گەڵ نوێنەری KNC لەم بارەیەوە کردبووی. ئەوجا ڕژێمی ترک ناچار بوو بێژێ کە ئەو کارە "بەهەڵە" ڕووی داوە و، "لێی دەکۆڵێتەوە" و " ئامادەیە پارە بدات بە کەسوکاری کوژراوەکان".

**٩ـ** ئەم ژێدەرە پاشکۆیە کە لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٠ دا **نوسراوە**.

سەرتیپی پاسدار **محەممەد باقیر زولقەدر (محمد باقر ذولقدر)** «جێگری فەرماندەی سوپای پاسدارانی شۆرشی ئیسلامی ئێران» لە ڕۆژی سێ شەممەی ٢٠٠٠/١٠/١٠ دا بە هەواڵگوزاری **«ئیسنا»**ی گۆت:

«وێژە و زەمانێك کە سەرکۆمار **(خاتەمی)** بەکاری دەبا جۆرێکە کە سەری لە ڕۆژئاواییەکان تێکداوە و فریویان خواردووە پێی». هەروەها پەسنی (مدح) خاتەمی دا و گوتی ئەم سیاسەتەی خاتەمی بووە بە هۆ **ئەوەی دژ وەستاو ببێتە پێچەوانە وەستاو و، پێچەوانە وەستاویش ببێتە لە گەڵ وەستاو!** دوایی گوتی ئەم سیاسەتەی خاتەمی بووەتە هۆی ئەوەی «ڕەوتە ڕامیارییەکانی دەرەوەی وڵات لەم سێ ساڵەی دواییدا بپەشۆکێن ... لەم ڕووەوە مەترسیی ئاسایشانە بۆ ڕژێمی

ئێران کەم بووەتەوە ... ». دەقە فارسی یەکەی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

«ادبیات و زبانی که رئیس جمهوری به کار میبرد، بەگونەای است که غربیها را دچار اشتباه کرده و فریب خوردەاند. سیاست خاتمی در تبدیل معاند به مخالف و تبدیل مخالف به موافق ... این سیاست موجب شده که جریانهای سیاسی خارج کشور در سه سال اخیر منفعل شدەاند ... خطرات امنیتی علیه نظام از این بابت کم شدەاست». (تەماشای **رۆژنامەی «کیهان»** چاپ لندن ژمارە ٨٢٨، ١٨/١٠/٢٠٠٠ بکە». لەم رووەوە پێشبینی یەکانمان لەبارەی خاتەمی یەوە لە سەمینارەکەدا بەڕاست گەڕا. ئەوەتە پاش دوو ساڵ یەکێك لە خۆیان ئەم راستییەی درکاند.

لە ڕۆژی ٢٤/٧/٢٠٠٠ دا کاتێك **خامنەیی** لە شاری **ئەردەبیل (ئازەربایجان)** قسەی بۆ خەڵك دەکرد ماوەیەك بە شێوەی ترکی ئەو نێوچەیە قسەی کرد و گوتی ئێران لە چەند گەلێك پێکهاتووە و بەرلە هەموویان لە ترك و فارس. ترك و فارس بران چونکە هەردووکیان موسڵمانن، ئەز بۆخۆم گوێم لە دەنگی بوو لە رادیۆ. ئەم قسانە بە چەپڵەڕێزانی ترکزمانەکانی ئەردەبیل وەرام درایەوە و دەرکەوت ئەو قسەیەی کەلەم سەمینارە و لە مانگی ئوکتۆبەری ١٩٩٨ دا لەم بارەیەوە گوترا راستی راست بوو.

**(١٠)** ـ ئەم مەلا حەسەنی یە کە کابرایەکی ترکی دوژمن بە کورد و نوێنەری خامنەیی یە لە ورمێ زۆر دەوڵەمەند و پارەدارە و خاوەن کێڵگە و باخ و زەوی و زارێکی زۆرە لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا. لە کۆنەپەرستی و دوواکەوتوویی‌دا گەیشتووەتە پلەیەك کە خەڵکی ورمێ ـ کە هیچ جۆرە هۆیەکی رابواردنیان نییە ـ رۆژانی هەینی دەچن بۆ گوێگرتن لە قسەکانی کە مرۆڤ دەهێننە پێکەنین. مەلا حەسەنی لە یەکێك لە گوتارەکانی دا فەرمووی: **«ژنان سێ بەشن، ژن هەن نەسەریان دادەپۆشن و نەدەموچاویان دادەپۆشن، ئەوانە وەك پاس وانە، هەمووکەسێك دەتوانێ سواریان بێ. ژن هەن سەریان دادەپۆشن، بەڵام دەموچاویان رووت دەکەن، ئەوانە وەك تاکسی وانە، هەر چەند کەسێك دەتوانێ سواریان بێ. بەڵام ژن هەن سەریشیان دادەپۆشن و دەموچاویشیان دادەپۆشن وەك ژندگەی بەندە، ئەوانە هێسترن، هەر یەکێك دەتوانێ سواریان بێ».**

کە خەڵکەکە گوێیان لەم فەلسەفەیە بوو، هاواریان کرد"ئەللاهوئەکبەر" (الله اکبر).

**(١١)** ـــ خومەینی لە ماوەی هەشت ساڵ شەڕی ئێران و عێراقدا سوور بوو لە سەر ئەوەی کە شەڕ ناوەستێنێ تا نابووتیی **سەددام** و دەیگوت **«ڕێی قودس بە کەربەلادا دەڕوا)**. بەڵام پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت کە جەنگ دەدۆڕێنێ ناچار بوو شەڕ راگرێ و بڵێ **«ئەمە پیاڵەیەك ژەهرە بەڵام وا دەینێم بەسەرمەوە»**.

**(١٢)** ـــ ئەم پێشبینی یە هاتە دی و ساڵێك دووای ئەوە لەشکری هێندستان کشایە **کشمیری پاکستانەوە**.

**سەرنج!** ئەم پاشکۆیە درێژەپێدانە بە ژێدەری (١٢) کە لە مانگی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠ دا نووسراوە!

ڕژێمی ئێران لەم ڕۆژانەدا (ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠) لە ڕێی ناردنی وەزیری دەرەوەی **کەمالی خەرازی** یەوە بۆلای **سەددام حسێن تکریتی**، هەوڵی ئەوە دەدا کە ڕێککەوتننامەی ملهوڕانەی دژ بە کوردی **«جەزائیر»** کە لە مارتی ١٩٧٠ دا لە نێوان شای لێخراو و سەددامی تکریتی دا مۆر کرا جارێکی دی زیندوو بکاتەوە. ئەمەش هەر بۆ خراپەکاری دژی کورد و بەربەرەکانێی تێکۆشینی ئازادیخوازانەی خەڵکی کوردستان. ئەگەنا **سەددام** ساڵی ١٩٨٠، لەبەر چاوی ملیۆنان تەماشاکەرانی تەلەفزیۆن کاغەزی ڕێککەوتننامەی جەزائیری دڕاند و سووتاند و هەشت ساڵ خوێنی خەڵکی ئێرانی ڕشت. **خومەینی** دەیگوت: **«ڕێی چوونە قودس بە کەربەلادا تێدەپەڕێ»**. ئەوجا ئێستە ڕژێمی ئێران باسی ئەو ملیۆنە ئێرانی یە ناکا کە لە ئەنجامی پەلاماری سەددامەوە بۆ سەر ئێران کوژران و، باسی چەند سەت میلیاردێك زیانی لێ کەوتووی خۆی ناکا، دەیەوێ پەیمانی جەزائیر زیندوو بکاتەوە، چونکە ڕژێمی مەلاکانیش، هەروەك ڕژێمی شا، هەموو شتێك دەکا بەقوربانی ئەوەی کورد هیچ جۆرە ئازادییەکی دەست نەکەوێ. بەڵام وادیارە هێندە کورتبینن نازانن ئەو سەردەمەی کە پەیمانی جەزائیری تێدا بەسترا زۆر زۆر جیاوازە لە ساڵی ٢٠٠٠. ئەوەشمان نابێ لەبیربچێ کە بەستنی «پەیمانی جەزائیر» لە گەڵ سەددامی تکریتی هۆیەك بوو لەو هۆیانەی کە ڕژێمی حەمەڕەزا خانیان دا بەزەویدا. ئەوەی بژی دەبینێ!. ■

## زنجیرەی بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران - هەولێر

٧٦- ناڵەی بەفر و پشکۆی ئاگر، هیوا سەعید، سلێمانی: چاپخانەی سیما، ٢٠٠٧، ١٤١ل. (شیعر).

٧٧-ناسنامە و کێشەی ناسیۆنالی کورد، جەمال نەبەز، هەولێر: چاپخانەی منارە، ٢٠٠٧، ٣٢٤ل. (مێژووی کورد).

**Jemal Nebez**

# The Kurdish Identity And The National Question of Kurdistan

in the light of five seminars
and scientific lectures
held in Europe 1984-1998